# سەرکێشییەکانی تـــــۆم سۆیـــــەر

نووسینی

مارك توەین

ئیسماعیل خالید گەلاڵی

لە ئینگلیزییەوە کردوویییە بە کوردی

پ.ی.د.هیمداد عەبدولقەهار محەمەد

پێداچوونەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە




له سەر ئەركی كونسوڵگەری گشتی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا-هەولێر/عێراق وەرگێڕدراوە

له لایەن

ناوەندی لاس بۆ كاروباری زمان و وەرگێڕان



# خانەی موكریانی بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە

- **سەركێشییەكانی تۆم سۆیەر**



- **نووسینی:** مارك توەین
- **وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە بۆ كوردی:** ئیسماعیل خالید گەلاڵی
- **پێداچوونەوەو پێشەكی بۆ نووسیوە:** پ. د. هیمداد عەبدولقەهار محەمەد
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** رێمان ئەحمەد
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **چاپی یەكەم** ٢٠١٣
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانەی** موكریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانەی گشتییەكان ژمارەی سپاردنی (٢٣٤) ساڵی ٢٠١٢ی پێی دراوە.

**زنجیرەی كتێب (٧٨٦)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێشەکی

وەك هەر خوێنەرێکی ئەدەبی و کولتووری ئەمەریکی تۆم سۆیەری مارك توەین بۆتە هێزێکی پاڵنەر بۆ ئەوەی خولیای خوێندنەوە لە هزری مندا چەکەرە بکات. بە هیوای ئەوە بووم ڕۆژێ دابێ، کە دەرفەتێك هەڵبکەوێ ئەو شاکارە بۆ زمانی شیرینی کوردی وەربگێڕم. ئەوە بوو ئەم دەرفەتە هاتەپێش، بەڵام بەداخەوە بە هۆی سەرقاڵیم لەم کاتەدا نەمتوانی خۆم ئەم کارە ئەنجام بدەم. لەبری ئەوە شەرەفی ئەوەم پێ بەخشرا، کە من خۆم یەکێك بۆ ئەم کارە دەستنیشان بکەم، لەبەرئەوەی ئەو زمانەی کە تۆم سۆیەری پێ نووسراوە و ئەو وشە و دەستەواژانەی بەکارهێنراون و گوزارشتیان پێکراوە هێندە لۆکاڵ و تایبەتن ڕەنگە هەموو وەرگێڕێکی باشیش نەتوانێ ئەم ئەرکە بە پێی پێویست بەجێبهێنێ. ئەنجامدانی ئەم کارە پێویستی بە وەرگێڕێکی وایە، کە نەك تەنها ئینگلیزی و کوردییەکەی باش بێت، بگرە دەبێ خاوەن سەلیقە و ئارامییەکی وا بێت بتوانێ وشە و دەستەواژەی گونجاو بۆ ئەو هەموو شتانە بدۆزێتەوە یان بەرابەریان بکات، کە ڕەنگە هەندێکیان لە هیچ فەرهەنگێکی ئینگلیزیشدا نەبن. دوای گەڕانێکی هێمنانە بەنێو ئەو کەسانەی، کە لە مێشکمدا بوون بۆ ئەم مەبەستە کاك ئیسماعیلی وەرگێڕم هەڵبژارد و بە ڕای خۆشم باشترین کەسە بۆ ئەم کارە، هەم لەبەرئەوەی شارەزاییەکی باشی لە بواری وەرگێڕاندا هەیە، هەمیش خاوەن سەلیقەیەکی کەم وێنەیە. دڵنیابووم لەوەی، کە دەتوانێ بە سەرکەوتوویی ئەم کارە ئەنجام بدات. لەبەرئەوەی هەر خۆم ئەرکی پێداچوونەوەی ئەم دەقە دانسقەیەم هەبوو، بۆیە دڵنیام کە بە شێوەیەکی زۆر کوردانە پەیامەکانی نووسەر بۆ خوێنەری کورد گوێزراونەتەوە و ئەگەر هەر هیچ نەبێ لە کولتووری خوێنەر نێزیك کراوەتەوە بۆ ئەوەی تام و چێژێکی تایبەتی پێ ببەخشێ. خۆم جگە لەوەی کە چێژم لە خوێندنەوەی دەقە ئینگلیزییەکە وەرگرت، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەڵێم: خوێندنەوەی دەقە کوردییەکەش چێژی تایبەتی خۆی هەیە.

لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی ئەم دەقە کوردییە بریتییە لەو زمانە پاراو و دەوڵەمەندەی، کە بەکارهێنراوە و لە زۆر شوێنیش بە شێوازی قسەی سەر زارەکیی خەڵکی داڕێژراوەتەوە، لەبەرئەوەی سروشتی نووسینەکە خۆی ئەوە دەخوازێ و تاڕادەیەکی زۆر دایەلۆگی نێوان

کارەکتەرەکان زاڵە. هەندێ جاریش پێویستی بەوە هەبووە، کە وشە و دەستەواژەی وەها بەکاربهێنرێ، کە ڕەنگە تایبەت بێ بە ناوچە و دەڤەرێکی دیاریکراو لەبەرئەوەی لە دەقە ئەسڵییەکە بە شێوەیەکی زۆر لۆکاڵی نووسراوە و دۆزینەوەی واتای بەرابەر و چەمکی هاوتا زۆر ئاستەنگ بووە. بەڕاستی و بێ زێدەڕۆیی ئەو وەرگێڕانە هەرچەندە لە ماوەیەکی زۆر پێوانەیی ئەنجامدرا، بەڵام زۆر سەرنجڕاکێش و مایەی دەستخۆشی و دەستگوشینە.چونکە بەداخەوە ئێستابەرهەمی وەرگێڕانی وا لە چاپدراون، کە تەنانەت بە سێ چوار جار پێداچوونەوەش هەر بەکەڵکی چاپکردن نایەن. هیوادارم لە دامودەزگەکانی چاپ و بڵاوکردنەوە بایەخی زیاتر بە پرۆسەی پێداچوونەوە و بەراوردکردنی دەقی ئەسڵی و دەقی وەرگێڕدراو بدەن، چونکە زۆر گرنگە و پێویستیشە بۆ ئەوەی دڵنیابین لە توانای وەرگێڕەکان و دڵسۆزیان بۆ شێواز و پەیامی نووسەری دەقە ئەسڵییەکە.

لە کۆتاییدا تەنها ئەوە ماوە، کە داوا لە خوێنەری ئازیز بکەم _خوێنەری هەمە تەمەن_ کە کاتێکی تایبەتی بۆ خوێندنەوەی ئەو دەقە تەرخان بکەن، چونکە دڵنیام چێژی لێ وەردەگرن و سوودێکی زۆری لێ دەبینن، تەنانەت بۆچوونەکانیشتان لەسەر زۆرێك لە مەسەلەکان گۆڕانی بەسەردادێ، بە تایبەتی پەیوەندیی نێوان منداڵ و خانەوادە و چۆنێتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ تەمەن و قۆناخەکانی ژیان.

بە هیوای سەرکەوتنی زیاتر و بەرهەمی بە پێزتری کاك ئیسماعیلی وەرگێڕ و خوێندنەوەیەکی خۆشی بەخش بۆ ئێوەش.

پ.ی.د.هیمداد
٢٠١٠/١٠/١٩ هەولێر

زۆرینەی ئەو سەرکێشییانەی لەم کتێبەدا تۆمار کراون، بەڕاستی ڕوویانداوە. یەك دووانێکیان بەسەر خۆمدا هاتوون و ئەوانی دیکەش بەسەرهاتی هاوپۆلەکانم. کەسایەتی هاك فین لە ژیانی ڕاستەقینە وەرگیراوە، تۆم سوێریش بە هەمان شێوە، بەلاّم هی کەسێکی دیاریکراو نییە، بگرە تێکهەڵکێشی سیماکانی کەسایەتیی سێ کوڕە، کە ناسیومن و وابەستەی ڕیزبەندی پێکهاتەی بنیاتی کارەکەمە.

ئەو بۆچوون و تێڕوانینانە لێرەدا دەستنیشانکراون و ئاماژەیان بۆکراوە، لەنێو منداڵاّن و کۆیلەکانی ڕۆژئاوا، لە دەمی ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە- دەتوانین بڵێین سی چل ساڵێك لەمەوبەر باوبوون.

هەرچەند ئەم کتێبە بە شێوەیەکی سەرەکیی بە نیازی خۆشی بەخشین بە کوڕ و کچان نووسراوە، بەلاّم ئاواتەخوازم پیاوان و ژنانیش لێیەوە دوورنەکەون و بەهەندی هەڵگرن. لەبەرئەوەی بەشێك لە مەبەستی من ئەوەبوو، کە وەبیر گەورەکانیش بێنمەوە، کە بەخۆشیان ڕۆژێك لە ڕۆژان چۆن بوون و چۆنیان هەست دەکرد و چۆنیان بیردەکردەوە و چۆن دەدوان، چەند بەزمی سەیریان ئەنجامداوە و سەریان لە چەند گێچەڵاّن ئالاّوە.

نووسەر

هارتفۆرد ١٨٧٦

# پاژی یەکەم

- تۆم..!

وەڵام نەبوو.

- تۆم..!

وەڵام نەبوو.

- سەیرە ئەو هەتیوە چی بەسەرهاتووە..! کوڕە تۆم!

وەڵام نەبوو.

پیرەژن چاویلکەی ڕاکێشا سەر لووتی بەسەریدا بە هەموو لایەکی ژوورەکەیدا ڕووانی، ئەوجارە چاویلکەکەی بەرزکردەوە سەر چاوی و لەژێرەوە تەماشای کرد. کەم وابوو لە چاویلکەکەیەوە بڕوانێ و چاو لە کوڕێژگەیەکی چووکەڵەی وا دابگرێ. چاویلکەکەی هەر بۆ کەشخە و خۆبادانێ بوو، پتر بۆ شانازی دڵی بوو و بۆ جوانی لەچاوی دەکردن نە بۆ بەکارهێنان. جووتە چاوێکی سۆپای بە چاوییەوەبا چەندی پێ دەدیتن، بە چاویلکەکەشی هەر هێندەی دەدیت. ساتێك سەرسامی لە ڕوویدا دەرکەوت، ئەوجا بە دەنگێکی هێمن، بەڵام هێند بەرز، کە بەس بێ تا مۆبیلیاکان بیبیستن، گوتی:

- باشە باش.. چەندم حەز لێیە بتگرم.. ئەوجا..

هێشتا قسەکانی تەواونەکردبوو، کە خۆی نووشتاندەوە و گێسکەکەی درێژ کردە بن تەختی نووستن، ناچاربوو پشتی خۆی ڕاگرێ تا بە ڕێکی گێسکەکە بوەشێنێ. لای وابوو تۆم لەوێیە، بەڵام هێندەی نەبرد پشیلەیەکی دەرپەڕاند..!

- تا ئێستا نازانم ئەو هەتیوە خۆی لە کوێ حەشاردەدا..!

بەرەو دەرگە کراوەکە ڕۆیشت و لە بەردەمیدا ڕاوەستا و بە دەرەوەدا ڕوانییە نێو ئەو بڕکە تەماتە و گژوگیایانەی باخچەکەیان داگرتبوو.. تۆم شوونی نەبوو، جا دەنگی هێند بەرزکردەوە تا لە دووروا ببیسترێ و هاواریکرد:

- هەتیو.. تۆۆۆم..!

خشپە خشپێکی لەدواوە هات، یەکسەر ئاوڕی دایەوە و لاچکی چاکەتەکەی تۆمی گرت و نەیهێشت هەڵێ..

- ئاوها..! دەبووایە من بیر لەو دۆلابە بکەمەوە.. ئەوە لەوێ چت دەکرد؟

- هیچ..

- هیییچ! تەماشای دەستەکانت کە.. تەماشای دەستت کە.. ئەوە چییان پێوەیە؟

- نازانم .. پووریێ.

- باشە.. من خۆم دەزانم، ئەوە مورەبایە مورەبا، چل جارانم پیێ گوتوی ئەگەر واز لەو مورەبایە نەهێنی کەلّت دەکەم. بێنە ئەو دارەم بدە دەست.

دارەکەی لە هەوای رادەوەشاند... ترس لە تۆمەوەنێزیك کەوت.

- وەی خوایە! ئەوە چییە لە پشتت پووریێ!

پیرەژن ئاوڕی دواوەی داوە و لە ترسا کراسی خۆی هەلّکرد. کوڕێژگە لە تاوان دەرپەڕی و بەسەر پەرژینە پانوپۆڕ و بەرزەکەدا هەلّگەڕاو لەو دیوی بزر بوو.

خاتوو (پۆلی) پووری ساتێك سەرسام راوەستا و لەناکاو لە پرمەی پێکەنینیدا.

- ئای لەو هەتیوە سەگە.. ئەریێ دیارە من نابیێ چ فێربم؟!! ئەدی چەندین جاری دیکەی بەمجۆرە فێلاّنەی نەخەلّەتاندووم، دەبوایە ئەمجارە چاترم ئاگا لەخۆ بیێ؟ بەلاّم دەبەنگە کۆنینەکان لە هەمووان دەبەنگترن وەك دەلّێن: ناتوانی قەت پیرە سەگێك فێرە فرتوفێلّی تازەکەی. بەلاّم خوایە، خۆ ئەو هەتیوە هەرگیز دوو جاران فێلّێك دووپات ناکاتەوە، جا چۆن مرۆڤ بزانیێ چی پێیە..؟ پێدەچیێ ئەو چاك بزانیێ دەتوانیێ چەندم ئازاردا بەر لەوەی لێی تووڕەبم. دەشزانیێ ئەگەر دەرفەتم لیێ بێنی یاخۆ وەپێکەنینم خا، دلّم سارد دەبێتەوە و ناتوانم لێیدەم. من لە ئەرکی خۆم لە ئاست ئەو کوڕە، کەموکوڕیم هەیە، ئەمە راستییەکە خواش دەیزانیێ. لە ئینجیلیشدا هاتووە:

"گۆپالّەکەت ڕاوەشێنە ، مندالّەکەت دێتە ڕاییێ "

من گوناه بۆ خۆم بۆ وی دەچێنم.. دەزانم. ئەو هەتیوە نەگبەت و بەدبەختە، کۆنە زامی زۆرن، بەلاّم کوڕی خوشکە مردووەکەی خۆمە، هەژارە و منیش دلّم نایە لێیدەم. هەرجاریێ وازی لیێ بێنم، ویژدانم ئازارم نادا، بەلاّم هەرجارەی لێیدەم دلّە پیرەکەم دەشکیێ. هەر چۆنێك بیێ خۆ لە ئینجیلیشدا هاتووە: (بنیئادەم ژیانی کورت و پڕ دەردەسەرییە) لاموایە ئەمە زۆر راستە. ئەمرۆ پاش نیوەڕۆ قاشوانیێ دەکا، بەلاّم من ناچار دەبم سبەینیێ وەك سزایەك کاری پیێ بکەم، زۆر ئەستەمە بە شەمووان کاری پیێ بکەی، کاتیێ هەموو مندالاّنی دیکە پشوویانە و

گەمان دەكەن. خۆ ئەو لە هەمموو شتی زیاتر رقی لە كاركردنە. بەلاّم من دەبیّ ئەركی خۆمی بەرامبەر جێبەجیّ بكەم. دەنا دەبمە هۆی فەوتانی ئایندەی ئەو مندالّە.

تۆم قاشوانێی كرد و كاتێكی خۆشی رابوارد. تا ئەو كاتە نەگەڕایەوە مالّیّ، كە دەبوو بچێتەوە تا لە داربڕین بۆ سبەینیّ و هەلّكردنی ئاگردان بەر لە ژەمی شێوان یارمەتی (جیم) بدا كە كوڕە قولێكی چكۆلّە بوو. هیچ نەبیّ بای ئەوەندەی كات بە دەستەوە مابوو، كە سەركێشییەكانی ئەو رۆژەی بۆ جیم بگێڕێتەوە. لە كاتێكدا كە جیم سێچارەكی كارەكەی كردبوو. (سید)ی برا بچووكی تۆم (زڕبراكەی) بەشە كارەكەی خۆی تەواو كردبوو، كە دەبووا پارچەدار و چیلكان كۆكاتەوە. چونكە ئەو كوڕێكی كپ و بێدەنگ بوو، نەكێشەی هەبوو نەدەشیزانی سەركێشیی چییە.

لەو دەمەی تۆم خەریكی شێو خواردنیّ بوو، هەر بۆی هەلّكەوتایە كلّۆ شەكرێكی دەدزی. پوورە پۆلی پرسیاری پڕ مەكر و ئۆینی لێدەكرد. حەزی دەكرد بە قسان دەداوێی بخا و بیانووێكی دەستكەویّ، دووچاری سزای بكاتەوە. چونكە ئەویش وەك ژنانی دیكە ساكار و دلّناسك بوو. واشی دەزانی بەهرەی دیپلۆماسی زۆر سەیر و عەجایبی هەیە و شێوازە ساكار و روونەكانی خۆی لەلا ناوازە و زۆرزانانە بوو، گوتی:

- تۆم، ئەمڕۆ لە قوتابخانە كەشوهەوا گەرم بوو، وانییە؟
- بەلّیّ، پووریّ
- زۆر گەرم بوو، نا؟
- بەلّیّ
- ئەی تۆ نەتویست بچیتە مەلەوانی؟

تۆم موچڕكەیەكی بە لەش داهات و تووشی دلّەڕاوكیّ و گومان هات. لە دەموچاوی پوورە پۆلی رووانی، بەلاّم چی لیّ تێنەگەیشت. جا گوتی:

- نەخێر پووریّ... زۆرم حەز لێنەبوو.

پیرەژن قۆلّی درێژكرد و دەستی دایە كراسەكەی تۆم و گوتی:

- بەلاّم لەگەلّ ئەمەش تۆ زۆر گەرم نی. كەیفی پێهات كە زانی هێشتا كراسەكەی وشكە. كەسیش نەیدەزانی هەر ئەوەندی لە دلّدایە. بەلاّم تۆم دەیزانی ئەو بایە بەرەو كویّ هەلّدەكا، بۆیە پێشبینی كرد هەنگاوەكەی دی چ دەبیّ:

- هەندێكمان سەری خۆمان دا بەر ئاویّ. بزانە .. هێشتا سەرم تەڕە.

پووره پۆلی بەوە پەست بوو، کە ئەو بەڵگە لاوەکییانەی وەلاناوە، بۆیەش هەوڵەکانی بەباچوون و پلانەکەی سەری نەگرت.، کەچی هێندەی نەبرد هزرێکی دیکەی بۆ هات:

- تۆم، تەنیا بۆ سەر شووشتنێ نەیدەویست،یاخە کراسەکەت هەڵزڕێنی کە بۆم دووریبوویەوە. قۆپچەکانت ترازاندبان بەس بوو..!

تۆم ئارخەیان بوو و ترس بە روویەوە نەما. چاکەتەکەی ئاوەلاکرد. یاخەی کراسەکەی هەر بە جوانی دوورابۆوە.

- وەیش! باشە.. ئەمجارەش دەربازبووی.. دەبوو خۆم دڵنیا کردبا، کە تۆ قاشوانێت کردبوو و مەلەشت کردووە، بەلاّم تۆم، ئەمجارە لێتدەبوورم، لامواپە تۆ خەڵك گوتەنی، وەك ئەو پشیلە وای، کە بە ئاگری هەڵکڕو زابێ. لەو دیمەنە باشتری کە پێی دەردەکەوی.

کەمێك بەوە دڵتەنگ بوو، کە زیرەکییەکەی فەشەلی هێنا، هەندێکیش دڵخۆش بوو، چونکە هەر بۆ یەك جاریش بێ تۆم کەمێك گوێڕایەڵی نواندووە.

بەلاّم سیدنی گوتی:

- باشە بەلاّم من لام وابوو تۆ یاخەکەیت بە داوی سپی دووریبۆوە نەك رەش.

- بۆ، جا خۆ من بە داوی سپیم دووریبۆوە! تۆم!

بەلاّم تۆم چیدی چاوەڕێ نەبوو، کە لە دەرگەی دەرپەڕی گوتی:

- سیدۆ، تۆڵەی ئەوەت لێدەکەمەوە.

لە پەنایەك تۆم تەماشای ئەو دوو دەرزییە گەورەی کرد کە لە یاخەی چەقیبوون و دەزییان تێئالاّبوو. یەکێکیان داوی سپی پێوە بوو، ئەوی دیکەشیان رەش. گوتی:

- ئەگەر سید پێی نەگوتبایە لەخۆڕا قەت نەیدەزانی.. بە نەفرەت بێ..! هەندێ جار بە سپی دەیدوورێتەوە و هەندێ جار بە رەش. ناتوانم هەموو جارێ بزانم کامەی بەکارهێناوە.. بەلاّم شەرت بێ سید شاپترێن بکەم و دەرسێکی بدەمێ!

تۆم بە خۆی کوڕە گوندییەکی نموونەیی نەبوو، کوڕە نموونەییەکەی باش دەناسی.. بەلاّم کەیفی بە چارەی نەدەهات.

دوو خولەکی پێ نەچوو، تۆم هەموو کێشەکانی خۆی لەبیرکرد. لەبەرئەوە نا کە گیروگرفتی وی لە هی پیاوان بچووکتر بوو، بەڵکو لەبەرئەوەی شتێکی تازەی گرنگ و گەورەی هاتە پێش، کە شتەکانی دی لە مێشکی لادا و بەبایدان. چونکە کە پیاو بە پرۆژەی تازەوە خەریك بوو، هەڵدەچێ و ناخۆشییەکانی دیکەی لەبیر دەکات.

ئەو شتە تازە و بە هاوارەی کە جێ بایەخی تۆم بوو، جۆرە فیتەلێدانێك بوو، تازە لە منداڵە قولێکی فێر ببوو. زۆری حەزدەکرد راهێنانی لەسەر بکا و کەس لێی تێك نەدا، ئاوازەکەی بە دەنگی باڵندان دەچوو، جۆرە خوێندنێکی نەرم و نیان بوو، لەکاتی فیتەلێدانەکە دەبووا زمان ورد ورد بە بنمیچی دەم بکەوێ..

بە ماندووبوون و دیقەتکردنێکی زۆر، زوو توانی لێی مەعلان بێ. بە فیتە فیت بە شەقامەکەدا شۆڕبۆوە، هێند کەیفی ساز بوو دەتگوت ئەستێرەناسێکە تازە هەسارەیەکی دیکەی دۆزیوەتەوە.

ئێوارانی هاوین درێژتربوون. هێشتا تاریك دانەهاتبوو، لەناکاو تۆم فیتە لێدانەکەی راگرت، کە دیتی کوڕە بێگانەیەکی لەخۆی هەراشتری لەبەر دەم راوەستاوە. هەر کەسێك لەهەر تەمەن و هەر رەگەزێك تازە بهاتبا گوندی دوورە دەستی سانت پیتەرسپۆرگ. دەبووە مایەی سەرسامی و خۆ تێهەڵقورتاندن. هەرچەندە رۆژێکی ئاسایی هەفتەش بوو. ئەو کوڕە زۆر رێکپۆش بوو، ئەمەش شتێکی سەرسوڕهێن بوو. کڵاوەکەی شتێکی ناسك بوو. چاکەتە شینەکەی بەری تازە و کەشخە بوو. هەروەها پانتۆڵەکەشی. پێڵاویشی لە پێدابوو. هەرچەندە رۆژی هەینیش* بوو. تەنانەت قەرەوێتیشی لە مل بوو، کە پتر بە پارچە قوماشێکی بریقەدار دەچوو. تەواو شارستانی پێوە دیار بوو، ئەمەش ئێرەیی (تۆم)ی بزواند. هەرچەندە تۆم پتر تەماشای ئەو عاجباتییە بەهادارەی دەکرد. زیاتر و زیاتر رقی لە پۆشاکە شڕەکەی خۆی دەبۆوە. کەسیان قسەیان نەکرد. ئەگەر یەکیان بجووڵابا ئەوی دیکەش دەجووڵا، لاترقەوچ لێك مۆڕببوونەوە و چاویان لێك نەدەبزاوت. لە دواییدا تۆم پێی گوت:

- دەتوانم لێرە بتگەوزێنم!
- زۆرم حەز لێیە هەوڵدەی.
- بەڵێ... دەتوانم
- نەخێر... ناتوانی
- بەڵێ دەتوانم
- نا ناتوانی
- دەتوانم

---

* لەوێ هەینی رۆژێکی ئاساییە و شەممە و یەکشەممە پشوون.

- ناتوانی
- دەتوانم!
- ناتوانی!
دەمێم لێك كڕبوون، جا تۆم گوتی:
- ناوت چییە؟
- ئەوە كاری تۆ نییە
- باشە دەیكەمە كاری خۆم
- باشە بۆ نایكەی؟!
- ئەگەر زۆری بڵێی دەیكەم..
- باشە... زۆر... زۆر... زۆر... دەبزانم چ دەكەی
- پێتوایە گەلەك زیرەكی ...وانییە؟ ئەگەر دەستێكم لە پشتەوە بەسترابێتەوە هێشتا ئەگەر بمەوێ دەتوانم بتتەپێنم.
- باشە ئەگەر پێتدەكرێ بۆ واناكەی؟
- ئەگەر تووڕەم كەی وا دەكەم؟
- زۆری وەك تۆم دیوە وا تێكەوتوون.
- خۆت زۆر پێ ژیرە... وا نییە؟ ئۆی... ئەوە چ كلاوێكە؟
- ئەگەر بە دڵت نییە دەتوانی كلاوەكەم لوولدەی، بەلاّم ئەگەر ئازای لە سەرمی داكەنە... هەر كەسێكی ئەو جورئەتە بكا لمووزی لە خۆڵێ وەردەدەم.
- هەی لەو درۆیە!
- بە خۆت درۆزنی
- ئەگەر راستدەكەی بۆ دەست ناوەشێنی؟!
- دەبڕۆ وەلبە.
- بزانە... ئەگەر چیدی قسەی قۆڕ بكەی، سەرت پاندەكەمەوە
- بەڵێ.. بەڵێ.. پانیدەكەیەوە
- بەڵێ دەیكەم
- باشە بۆ نایكەی!؟ بۆ هەر دەڵێی دەیكەم و دەیكەم. چش ناكەی، ئەوە بەڵگەی ترسنۆكی نییە؟!

- من ناترسم
- با دەترسی
- نەخێر ناترسم
- بێگومان دەترسی

دیسان بێدەنگبوون و لێك مۆڕبوونەوە بە دەوری یەکدا سووڕان، هێندەی نەبرد شانبەشان ڕاوەستان و تۆم گوتی:

- بڕۆ لێرە نەمێنی
- بەخۆت بڕۆ
- من ناڕۆم
- منیش

- بەجۆرە ڕاوەستان و هەر یەکەیان قاچی خۆی چەقاند و ئامادەبوون. ئەوجا هەردووك بە توندی شانی یەکتریان پاڵدەدا و بە ڕقەوە تەماشای یەکتریان دەکرد، بەڵام کەسیان نەیانتوانی دەست پێشخەر بن. هێند لێك هەڵەنگوتن تا پشییان هەڵما و سوورهەڵگەڕان. هەر یەکەیان بە ئاگەدارییەوە هەناسەیەکی دا و تۆم گوتی:

- تۆ بێچووە سەگێکی ترسنۆکی.. بە برا گەورەکەم دەڵێم، جا ئەو دەتوانێ هەر بە کۆڵەمستێ تێتهەڵدا. دەبێ واشت لێبکا.

- بە برا گەورەت دەمترسێنی؟ من برایەکم هەیە لەو گەورەترە و دەتوانێ براکەی تۆ بۆ ئەودیو پەرژینێ هەڵدا. (ئەو دوو برایە هەر لە خەیاڵی ئەواندا هەبوون)

- ئەمە درۆیە
- ئەگەر وا بڵێی ڕاستی نابێتە درۆ

تۆم بە پەنجەی پێی هێڵێکی لە ئەرزی کێشا و گوتی:

- ئەگەر ئازای لەم هێڵە بپەڕەوە تا ئەوەندەت تێهەڵدەم نەتوانی بە پێوە بوەستی، پیاوم دەوێ بپەڕێتەوە. کوڕەکە بازیدا ئەو دیو هێڵەکەی و گوتی:

- هەر دەڵێی لێتدەدەم. دە ئێستا بزانم چ دەکەی.
- چیدی ململانێم مەکە... باشترە ئاگەداری خۆت بی.
- تۆ گوتت لێتدەدەم. ئەدی بۆ لێمنادەی؟
- نەفرەت..! بە دوو سەنت وا دەکەم.

کوڕەکە دوو سەنتی لە باخەڵی دەرێنا و بە گاڵتەوە بۆ تۆمی ڕاگرت. تۆم پڕیدایە و پارەکەی ڕافڕاند و یەکسەر تێکبەربوون، زۆرانێیان بوو، یەکتریان لەنێو ئەو زبلانە وەردەدا، وەك پشیلان چڕنووکیان لێکگیر کردبوو. هەر یەك قژی ئەوی دیکەی ڕادەکێشا و جلوبەرگی هەڵدەپچڕی و کەپووی یەکتریان دەڕنییەوە و یەکتریان لە خرتۆرێ وەردەدا. لەنێو تۆزێڕا دیار بوو، تۆم لاقی لەسەر منداڵە نامۆکە ئاودیو کردبوو لەسەری دانیشتبوو، بە مستەکۆڵە لێی دەدا و گوتی:

- ئەوەندەت بەسە

منداڵەکە هەر دەیویست خۆی قوتارکا، لە حەژمەت و تووڕەییان دەگریا

تۆمیش دابوویەبەرێ و دەیگوت:

- بلێ بەسە

لە دواییدا منداڵەکە بە دەنگێکی خنکاو گوتی:

- بەسە

تۆم لێیگەڕا هەستێتەوە و گوتی:

- پێتوایە ئەوەندە تەمبێت دەکات. جارێکی دی بزانە گاڵتە لەگەڵ کێ دەکەی.

کوڕەکە ڕۆیشت و خۆی لە تۆزێ دادەوەشاند، هەنسکی دەدا و دەنوزاوە و جارجارە ئاوڕی پشتە خۆی دەداوە و گەفی دەکرد جارێکی دی تۆمی دەستکەوێ چی لێدەکا و چۆنی تێهەڵدەدا، بەلاّم تۆم گاڵتەی بە هەڕەشەکانی دەهات، بۆیە ڕووی وەرگێڕا و بە باڵ فشکردنەوە ڕۆیی. کە ڕووی وەرگێڕا کوڕەکە بەردێکی هاوێشت و لە بەینی هەردوو شانیدا و پێی بە غارێوەنا و وەك ئاسك هەڵدەهات. تۆمیش کەوتە دووی و تا ماڵێ ڕاوینا. زانی ماڵیان لە کوێیە و لەبەر دەرگە ڕاوەستا و لە خوای دەویست دوژمنەکەی بێتە دەرێ، بەلاّم ئەو لەودیو جامی پەنجەرەوە تەماشای دەکرد و نەدەوێرا سەر هەڵکێشێ. ئەوەندەی نەبرد دایکی منداڵەکە دەرکەوت، تۆمی بە شەڕەنگێز و خراپ و بەدکار و بێ ئەدەب ناوبرد و دەریکرد. ناچار دەم بە هەڕەشە و گەفوگوڕ لێیدا ڕۆیی..

ئەو شەوە تەواو درەنگ گەڕاوە ماڵێ. کە بە ئاگەدارییەوە بەسەر دیوار هەڵژنا، بۆی دەرکەوت کە کەوتۆتە کەمینێ، کەمینی پووری. کە دیتی جلوبەرگی لە چ بارێکدایە، یەکجاری بڕیاریدا پشووی شەممەی لێبکاتە قوزەلقورت و وەك کۆیلە چی کاری قورسە پێی بکات.

# پاژی دووەم

بەیانی رۆژی شەممە داهات، هەموو دنیای وەرزی هاوین تەڕ و پڕشنگدارە و ژیانی لێدەتکێ. هەر دڵێك گۆرانییەكی تێدایە، ئەگەر دڵەكەش بچووك بێ، موزیك لە لێوانەوە هەڵدەڕژێ. هەموو رووێك گەشاوە و هەموو هەنگاوێك چالاك بوو. دارخڕنووك گەشانەوە و بۆن و بەرامی خونچەكانی دەشت و دەریان پڕ كردبوو. گردۆڵكەی كاردیف لەودیوی گوند بوو، بە چیمەنی سەوز داپۆشرابوو، دیمەنێكی شادی و ئارامی بەخش و جوان.

تۆم لەسەر شۆستەكە دەركەوت، سەتڵێكی پڕ بۆیەی سپی و فڵچەیەكی كلك درێژی بەدەستەوە بوو. لە پەرژینەكە رادەما و هێندەی نەبرد زەوقی تێكچوو و بەتەواوی دڵی تەنگ بوو. پەرژینەكە سی یاردە درێژ و نۆ پێ بەرز بوو. ژیانی زۆر بە تاڵ و خاڵی، وجودیشی وەك بارێكی قورس هاتە بەرچاو.

هەناسەیەكی ساردی هەڵكێشا و فڵچەكەی لە بۆیەكە هەڵهێنا و بە تەختەكەی سەرەوەی داهێنا. چەند جارێك ئەمەی دووبارە كردەوە. جا تەختە بۆیاخكراوەكەی لەگەڵ پەرژینێك بەراورد كرد كەلێنی دیار بوو. بێ هیوا و دڵسارد لەسەر قەدی درەختێك لێی دانیشت.

جیم لە دەروازەی باخچەكە دەركەوت و تەنەكەیەكی بەدەستەوە بوو گۆرانییەكی دەگوت، كە ئەو دەم باو بوو. هەرچەند تۆم ئاوكێشانی لە ترۆمپای شارۆچكەكەوە پێ كارێكی ئەستەم بوو، بەلاّم هێشتا لە بۆیەكردنی پەرژینەكە ئاسانتر بوو. ئەوەشی هاتەوە بیر كە خەڵكی ڕەنگ جیاواز، سپی و رەش و دووڕەنگ، بە كچ و كوڕەوە لە دەوری ترۆمپاكە كۆدەبوونەوە و چاوەڕێی نۆرەی خۆیان دەكرد، لەوكاتەش دەحەسانەوە و كەلوپەلی یاریكردنیان ئاڵوێر دەكرد و چەقەچەقیان دەكرد و بەشەڕ دەهاتن یاخۆ هەرا و زەنانیان دەكرد. ئەوەشی بەبیرهاتەوە، كە هەرچەند ترۆمپاكە تەنیا سەد و پەنجا یاردە لە ماڵی دوور بوو، كەچی جیم هیچ جارێك دەولكە ئاوێك بە كەمتر لە كاتژمێرێك ناهێنێتەوە و زۆرجاریش دەبێ یەكێكی بەدوادا بچێ.

تۆم گوتی:

- گوێ بگرە جیم، ئەگەر تۆ هەندێك بۆیاخم لەباتی بكەی منیش ئاوەكە دەهێنم.

جیم سەری لەقاند و گوتی:

- تۆمی بەڕێز، ناتوانم. بەڵێنم بە خانمە پیرەکەم داوە خۆم بچم و ئاوەکە بێنم، لەوەی ئاگەدار کردوومەتەوە خۆم بگنخێنم یاخۆ لەگەڵ یەکێك بدوێم، هەروا پێی گوتووم، کە رەنگە تۆمی بەڕێز هەوڵدا پەلکێشمکا تا بۆیەکەی لەگەڵ بکەم، بەلاّم دەبیّ من تەنیا کاری خۆم بکەم. هەروەك پێشی گوتم، کە بەخۆی چاودێری بۆیەکردنەکە دەکات!

- کوڕە جیم دە گویّ مەدیّ، ئەو هەمموو دەم وا قسان دەکات.. ئەو دەولکەم بدیّ. لەیەك خولەك زیاترم پێناچیّ و ئەویش قەت پێنازانیّ.

- نەخێر تۆمی بەڕێز، ئەگەر فەرمانی خانم بشکێنم، سەرم هەڵدەکێشیّ.

- ئەو، ئەو هەرگیز ئازاری کەسی نەداوە، بەس مەگەر بە کوشتەبانی دەستی لەسەرت بدا، کیّ بەوەندە دەییەشیّ. راستە زۆر هەڕەشە دەکا، بەلاّم خۆ قسە ئازاری کەس نادا... جیم من دیارییەکی جوانت دەدەمیّ. ئەم تۆپە کریستالییەت دەدەمیّ! نیشانەی دوودڵی بە رووی جیم دەرکەوت، تۆمیش گوتی:

- ئەمە کریستالّی سپییە، جیم دەبینی چەند جوانە!

- بەڕاستی زۆر جوانە، بەلاّم تۆمی بەڕێز من یەکجار لە خانمە پیرەکەم دەترسم..

- ئەگەر رازی بی قونێرەکەی پەنجەی پێشمت پیشان دەدەم.

جیم مرۆڤێکی دڵباش بوو.. لەمە زیاتر بەرگەی نەگرت. بۆیە دەولکەکەی دانا سەر زەوی و کریستالە سپییەکەی وەرگرت و بە سەرسامییەوە بۆ لای پێی تۆم دانەوییەوە، لە کاتێکدا کە پێچەرەکەی لە پەنجە کێماوییەکەی دەکردەوە. پاشان جیم تا توانی غاریدا و دەولکەکەی دەستی تەکەتەکی بوو.ئەو شەوە تەواو درەنگ گەڕاوە مالیّ. کە بە ئاگەدارییەوە بەسەریدا هەلژنا، بۆی دەرکەوت کە کەوتۆتە کەمینیّ، کەمینی پووری. کە دیتی جلوبەرگی لە چ بارێکدایە، یەکجاری بڕیاریدا پشووی شەممەی لێبکاتە قوزەلقورت و وەك کۆیلە چی کاری قورسە پێی بکات.

بیرکردنەوە لەم مەسەلەیە وەکو ئاگر داخی دەکرد. هەر گەنجینێکی هەیبوو لە باخەڵی دەرهێنا و لێیان رادەما. پارچە بووکۆڵە و وردە مەڕمەڕ و شتی بێکەڵك.. رەنگە بایی ئەوەیان کردبا کارەکەی پیّ بگۆڕێتەوە، بەلاّم نەیدەتوانی نیو سەعات ئازادی تەواوی پیّ بکڕیّ. پاشان گەنجینەکەی خستەوە گیرفانی. وازی لەوەی هێنا کوڕێك بە کریّ بگریّ. لەو ساتە تەنگ و تاریکەدا بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هات! بەلاّم بیرۆکەیەکی باش و بەسوود.

فڵچەکەی دەستدایە و بە هێمنی دەستی بە کارکردەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو بێن ڕۆجەرز بەدیارکەوت. لەناو هەموو منداڵان، ئەو بێنی مەبەست بوو. هەرچەند کەیفیشی بە قەشمەرجارییەکەی نەدەهات. هەڵبەزودابەز و ڕۆیشتنی بێن ئەوەی دەردەخست، کە چەند دڵخۆشە. سێوێکیشی دابووە بەر قەپان ناوەناوە هاوارێکی بەدەنگ و ئاوازی لێ دەردەچوو ئەوجا بە ریتمەوە دەیگوت: (دینگ دۆنگ دۆنگ دینگ دۆنگ دۆنگ) چونکە لاسایی کەشتی هەڵمی دەکردەوە. کە نێزیك کەوتەوە لە ناوەڕاستی ڕێگەکە ڕۆیشتنی هێواشکردەوە و بە لایەکی کەشتییە خەیاڵییەکە خۆی لارکردەوە و هێدی و بە زەحمەت وەرسووڕاوە. لەچاو میسۆری گەورەی کەشتییەوانی دەکردەوە و وایدانابوو، کەوا لەم ساتەدا کەوتۆتە ناو ئاوێك تەنیا نۆ پێ قووڵە. بەخۆی کەشتی بوو، کاپتن بوو، مەکینە بوو، وای خۆ دەهاتە بەرچاو لەسەر کەشتییە هەڵمییەکە ڕاوەستاوە و فەرمان دەردەکا و لە هەمان کات هەر بەخۆشی جێبەجێیان دەکا. لێرە ڕاگرە گەورەم ! تینگ لینگ لینگ!

هێندەی نەمابوو کەشتییەکە ڕاوەستێ و هێدی لە شۆستەکە نێزیك دەکەوتەوە، کە هاوتەریبی پەرژینەکە بوو.

بەرەبەرە فەرمانی ڕاگرتنی کەشتییەکە و لەنگەرگرتنی دەردەکرد و ناوەناوە دەنگی واشی لێ دەردەچوو، کە لای وابوو بەو دەنگانە دەچن، کە لە کەشتییەکی لەنگەرگرتووەوە دێن.

تۆم لە بۆیەکردن بەردەوام بوو.. بایەخی بە کەشتییە هەڵمینەکە نەدەدا. بێن ساتێك تێی ڕاما، پاشان گوتی:

- باش لەناو ئیش و کار نقوم بووی.. وا نییە؟!

تۆم وەڵامی نەدایەوە، بەڵکو وەك هونەرمەندێك دەیڕوانییە دوا جێگەی فڵچەکەی. ئەوجا دیسان بەنەرمی فڵچەکەی بە تەختەکە داهێناوە و دیسان لێی وردبۆوە. بێن تا هاتە تەنیشتی لێیەوە نێزیك کەوت. دەمی تۆم بۆ سێوەکە ئاوی لێدەتکا، بەڵام لە کارەکەی بەردەوام بوو، بێن گوتی:

- سلاو برادەر، دەڵێی ناچاری کار بکەی؟!

تۆم لەناکاو ئاوڕی لێداوە و گوتی:

- بۆ، ئەوە تۆی بێن! نەمدیبووی.

- نا... من دەچمە مەلەوانی، تۆش حەز ناکەی بتتوانیبا بێی؟ بەڵام نا.. وابزانم کارەکەت پێ باشترە... وانییە؟ بەڵێ، کارەکەت لا چاکترە..!

تۆم کەمێك تێی ڕاما و پاشان گوتی:

- تۆ بەچی دەڵێی کار؟

- بۆ ئەوەی دەیکەی کار نییە؟!

تۆم دەستی بە بۆیەکردن کردەوە و بەساردی وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ.. ڕەنگە کار بێ و ڕەنگە کاریش نەبێ، هەر ئەوەندە. دەزانم بۆ تۆم سوێر زۆر گونجاوە.

- دەبڕۆ..! پێم وایە مەبەستت ئەوە نییە بڵێی ئەو کارەم حەز لێیە..!

فڵچەکە هەر لە جووڵە و کاردا بوو.

- حەزم لێ بێ!؟ نازانم بۆ خۆشم نەوێ، منداڵی وەك من کەی هەموو ڕۆژێ بۆی هەڵدەکەوێ پەرژین بۆیەکا..!؟

ئەم قسەیە بارەکەی بە لایەکی دیدا گۆڕی. بێن چیدی گەززەی لە سێوەکەی نەدا. لەکاتێکدا تۆم بە ڕێکی فڵچەکەی دەهێنا و دەبرد، پاشان گەڕاوە دواوە تا تێی بڕوانێ. فڵچەیەکی بەولادا هێنا و یەکێکی بەملادا هێنا، دیسان لێی وردبۆوە. بێن چاوی دابووە هەموو جووڵانەوەکانی تۆم و تا دەهات زیاتر ئارەزووی بۆ دەچوو. لە هیکرا گوتی:

- تۆم، دەلێگەڕێ منیش هەندێك بۆیاخ بکەم.

تۆم هێندەی نەمابوو ڕازی بێ، بەڵام لەناکاو ڕای خۆی گۆڕی

- نا.. نا.. بێن پێم وانییە بتوانم ڕێت پێ بدەم، چونکە وەك دەبینی ئەم پەرژینە بەسەر شەقامی سەرەکیدا دەڕوانێ، پوورە پۆلییم زۆر بایەخی پێ دەدا. خۆ ئەگەر پەرژینی لای پشتەوە با نە من داوای تۆم ڕەتدەکردەوە و نە ئەویش گوێ لێبوو کێ بۆیەی دەکا، بەڵام ئەو بایەخی تایبەتی بەم پەرژینە هەیە و دەبێ زۆر بە جوانی بکرێ. لاموایە لەنێو هەزار تەنانەت دوو هەزار کەسیش یەکێك نییە بتوانێ وەك پێویست بۆیەی بکا.

- بەڕاستتە..؟ دە لێگەڕێ با هەوڵێك بدەم.. هەر یەك قیچ. تۆم ئەگەر من لەجێی تۆ بام لێدەگەڕام!

- بێن، حەزم دەکرد بتوانم.. بەڵام ئەدی پۆلی پوورم.. جیم دەیویست ئەم کارە بکا، نەیهێشت. سید ویستی بیکا، لەویش نەگەڕا. نازانی ئەگەر تۆ ئەو پەرژینەت بۆیاخ کرد و شتێك قەوما، چەند لە پلە و پایەی من لای پوورم دادەبەزێنی.

- ئای لەوە.. من زۆر ئاگەدار دەبم و چش روونادا. لێگەڕێ با هەوڵ بدەم.. منیش ناوەندی سێوەکەمت دەدەمێ.

- باشە.. کوڕە نا.. بێن، من ناوێرم..!

- ئێ.. هەموو سێوەکەت دەدەمێ..!

تۆم خۆی نیگەران پیشاندا و فلچەکەی دانا، بەلاّم لە دلّەوە زۆر ئاسوودە بوو. لەوکاتە کۆنە کەشتییە هەلّمییەکەی میسوری گەورە کاری دەکرد و لەژێر تیشکی ئەو رۆژە گەرمە ئارەقەی هەلّدەڕشت. هونەرمەندی دەست لەکار هەلّگرتوو لەبەر سێبەرێکی نێزیك لەسەر بەرمیلێك دانیشتبوو، قاچی دەهەژاند و سێوی دەقرماند و نەخشەی دادەنا چۆن منداڵی بەستەزمانی دیکە بخاتە داوێ. پێویستی بە هیچ نەبوو، هەر بابایە منداڵ دەهاتن، لە سەرەتا گالّتەیان پێ دەکرد و دوایی دەستیان بە بۆیەکردنێ دەکرد. کاتێ بێن هێنکەی لێبڕا، تۆم لەگەڵ بێلّی فیشەر پێکهاتبوو، کۆلارەکەی لێوەرگرێ تا رێی بدا بۆیاخ بکا. کە بێلّی ماندوو بوو، نۆرەی جۆنی میلەر هات، ئەویش مشکێکی تۆپیوی دایە تۆم، کە داوێکی باریکی بە قاچییەوە بوو تا یاری پێ بکا. بەشەرتێ لێگەڕێ لە بۆیەکردن بەشدار بێ. بەم جۆرە سات لەدوای سات دەیگۆڕین. کە دانی ئێوارەش بە نیوە بوو، ئەو تۆمەی دەمە و بەیانی هەژار و نەدار بوو، دەولّەمەند ببوو. جیا لەو شتانەی پێشتر ئاماژەیان بۆکرا، دوازدە پارچە مەڕمەڕ و پارچە گیتارێکی جوولەکان و پارچە شووشەیەکی شینی بوتلێکی شکاو تا لێیەوە بڕوانێ لەگەڵ بەکرەیەك و کۆنە کلیلێکی بێکەڵك و پارچە تەباشیرێك و قەپاخی کۆنە بوتلێك و بووکەڵە سەربازێکی لە تۆتیا دروستکراو و دوو بێچووە بۆق و شەش ئاگرۆکە و فەرخە پشیلەیەکی یەك چاو و دەسکە دەرگەیەکی مس و قەرێتەیەکی سەگ کە سەگەکەی لەگەڵ نەبوو_ و دەسکە چەقۆیەك و چوار پارچە پەلکە پرتەقاڵ و کۆنە پەروازێکی پەنجەرە.

بۆ خۆی کاتەکەی بە تەمبەڵی و خۆشی و حەسانەوە و بە هاوەڵی منداڵێکی بەسەر برد، سێ جاریش پەرژینەکەیان بۆیاخ کرد! ئەگەر بۆیەش تەواو نەبووایە هەرچی کوڕی گوندەکە هەیە قرغی دەکردن.

تۆم بەخۆی گوت دنیا وا خالّی و بەتاڵ نییە، کە سەرلەبەیانی پێی وابوو، بێ ئەوەی بزانێ یاسایەکی گەورەی لە یاساکانی چالاکی مرۆڤ دۆزییەوە. یاساکەش ئەوەیە: تۆ ئەگەر ویستت پیاوێك یا کوڕێك ئارەزووی بچێتە شتێك، هێندە بەسە وا پیشاندەی کە ئەو شتە دەسکەوتنی زەحمەتە. ئەگەر تۆمیش وەك دانەری ئەم کتێبە فەیلەسووفێکی گەورە و دانا بوایە دەیزانی.

کار بریتییه له هەر شتێك جەستە بەخورتی ئەنجامی بدا و گەمەش هەموو شتێکە کە جەستە بەخورتی ئەنجامی نەدا. ئەوجا ئەمەش یارمەتی دەدا تێبگا بۆچی دروستکردنی گوڵی دەستکرد، یاخۆ ئاشگێڕان کارە، بەلاّم غلۆرکردنەوەی تۆپە قورسەکەی بۆڵینگ یاخوود بە کێوی مۆنت بلانت هەڵگەڕان تەنیا کات بەسەر بردن و یارییە.. لە ئینگلتەرا دەوڵەمەندی وا هەن حەز دەکەن هەموو ڕۆژێکی هاوین پەیتونێکی چوار ئەسپی نەفەر هەڵگر، بیست تا سی میل باژۆن، ئەگەر پارەشی تێبچیّ ئەوان هەر بە کارێکی جیاواز و باشی تێدەگەن. بەلاّم ئەگەر بۆ ئەو خزمەتە کرێیان پێبدریّ، خۆشییەکەیان لیّ دەبێتە کار و یەکسەر وازی لیّ دەهێنن.

تۆم کەمێك بیری لەو گۆڕانە گرنگە کردەوە، کە بەسەر بارودۆخی دنیای وی داهات. پاشان بەرەو بارەگەی سەرکردایەتیی بەڕێکەوت تا راپۆرتەکەی پێشکەش بکات.

## پاژی سێیەم

تۆم چووە بەردەم پوورە پۆلی کە لەنێزیك پەنجەرەی ژوورێکی خۆشی بنەبانی ماڵێ دانیشتبوو، کە پێکەوە ژووری نووستن و ژووری بەرچایی و ژووری نانخواردن و ژووری کتێبخانە بوو. کزەبای هاوین و کڕی و بێدەنگی و عەتری گوڵان و گیزەگیزی مێشهەنگان کاریگەریی خۆیان هەبوو بەسەر چنینەکەی دەستیدا خەونووچکە دەیبردەوە، چونکە لە پشیلەیەکی خەواڵۆو بترازێ کەسی لە کن نەبوو، ئەویش لە نێوکۆشیدا خەو دەیبردەوە. چاویلکەکانیشی بەرزکردبۆوە سەر سەرە ماشوبرنجەکەی، بە شێوازێکی وا کە دلارام و ئارخەیانیی دەگەیاند.. وای بەخەیاڵدا هاتبوو کە ئێستا لەمێژە تۆم کارەکەی بەجێهێشتووە، بۆیە کە بینی سەیری پێهات..! بۆ دیسان وا بە ئازادی خۆی خستۆتەوە بەر رەحمەتی وی...؟!

تۆم گوتی:

- ئەرێ پوورێ ئەوجا دەتوانم بچمە گەمان؟
- چ دەڵێی؟ وا بەخێرایی..؟ بۆ کارەکەت چەند تەواوکردووە؟
- هەموو پەرژینەکەم بۆیەکردووە، پوورێ.
- تۆم، درۆم لەگەڵ مەکە.. بەرگەی درۆیان ناگرم.
- درۆ ناکەم پوورێ.. هەموویم تەواو کردووە.

پوورە پۆلی زۆری متمانە پێ نەبوو، بۆیە هەستا چووە دەرێ تا خۆی ببینێ و دڵنیا بێ، ئامادەبوو ئەگەر بیست لە سەدی قسەکانی تۆمیش راستبا رازی بێ، بەلام کە دیتی پەرژینەکە بۆیەکراوە، نەك جارێکیش بەڵکو چەندین جار سەر تا خوار بۆیەکراوە و تەنانەت ئەرزەکەشی هێڵکاری کراوە، یەکجار سەرسام بوو، هێندە نەمابوو زمانی بگیرێ، گوتی:

- بەخۆم بڕوا ناکەم..! هەرچۆنێك بێ ئەگەر تۆ مەبەستت بێ دەتوانی کار بکەی.

بەلاّم ویستی ستایشکردنەکەی هێوربکاتەوە، بۆیە گوتی: بەلاّم زۆر دەگمەن و ئەستەمە تۆ بڕیاری کار بدەی.. باشە دەتوانی بچییە گەمان، بەلاّم ئاگەداربە بە دوا نەکەوی دەنا پێستەت دەبەمە دەباخانەی..

وەدیهاتنی مەبەستەکەی دلّی پیرەژنی زۆر شادکردبوو، بۆیە تۆمی بردە ناندینەکە و سێوێکی بژاردەی دایە و بە مەبەستی چاککردنی ڕەوشتیشی باسی ئەوەی بۆ دەکرد، کە مرۆڤ چەند چێژ لە خواردنی سێوێکی وا وەردەگرێ ئەگەر بەبێ گوناھ و لە ڕێگەی کاری چاکەوە دەستی کەوێ. ھە پووره پۆلی لە وانەکەی بۆوە، تۆم دەرفەتی ھێنا و کێکێکی زەریف دزی.

کە بازیدا دەرێ (سید)ی بینی وا بە ھەشتاوی بە پەیژە دەرکەییەکەدا سەردەکەوێ، کە دەگاتە ژووری پشتەوەی نهۆمی دووەم. چەند کەستەکێکی ھەلّگرتەوە و لە چاوتروکانێك ھەمووی لە سید گرت و وەك تەزرە بە سەریدا باران. تا پووره پۆلی سەرسامبوونی خۆی وەلانا و بەخۆکەوت سید قوتار بکا. شەش حەوت کەستەکی لێدا بوو. تۆمیش بەسەر پەرژینەکەدا ئاودیو بوو و لە چاوان ونبوو... ھەرچەند دەرگەشی ھەبوو، بەلاّم تۆم بەگشتی لەکاتی تەنگاوی بەکاری دەھێنا.

ئەوجا تۆم کە تۆلّەی خۆی لە سید کردەوە لەپای ئەوەی سەرنجی پووری بۆ داوە ڕەشەکەی یاخەی ڕاکێشا بوو، دلّی داکەوت.

تۆم گەیشتە سەری کۆلاّنێ، ئەوجا بە کۆلاّنێکی قوڕاویدا سوڕاوە لای ئەو تەویلەی، کە پووری مانگای تێدا ڕاگرتبوو. لەوێ دلّنیا بوو کەسی ناگاتێ بیگرێ و سزای بدا. پەلەی بوو بگاتە گۆڕەپانی گشتیی گوند، لەوێش دوو تیپی (سەربازی) مندالاّن بەپێی ژووانێکی پێشینە بۆ شەڕ پێکگەیشتبوون، تۆم ژەنەڕالّی یەکێك لەو دوو تیپە بوو. لەشکرەکەی دیکەش بە سەرکردایەتیی جۆ ھاربەر بوو، کە دۆستی ئازیزی تۆم بوو. ئەو دوو سەرکردە مەزنە کەسیان لەو ئاستەدا نەبوون بەخۆیان شەڕ بکەن. ئەمە بۆ مندالّە ورتکان باش بوو. بۆیە بە لەخۆباییبوونەوە پێکەوە دانیشتن و ئۆپەراسیۆنەکانی جەنگیان بەڕێوەدەبرد بەو فەرمانانەی ھەریەك بۆ کەمپی خۆی دەریدەکرد. پاش شەڕێکی توند و درێژخایەن، لەشکری تۆم سەرکەوت. ئەوجا کوژراوەکانیان ژمارد و یەخسیرەکانیان گۆڕییەوە. لەسەر بەندەکانی ڕێك نەکەوتن و ڕێککەوتن و ڕۆژێکیان بۆ شەڕێکی تازە دیاریکرد، پاشان ھەردوو سوپاکە ڕیزبوون و بە مارش ڕۆیشتن و دوورکەوتنەوە، تۆمیش بە تەنیا بەرەو مالّ بۆوە.

کاتێ بە بەر ئەو خانووەدا ڕەتبوو، کە جێف تاچەری تێدا دەژیا، کچێکی تازەی لەباخچەکەدا بینی. کە ئافەریدەیەکی چاوشینی پرچ زەردی گچکەلەی جوان بوو، دوو کەزی درێژی بەردابۆوە کراسێکی هاوینەی سپی و پانتۆڵێکی نەخشێنراوی لەبەر بوو.. یەکسەر پاڵەوانی مەیدانێ بەبێ تەقە تەسلیم بوو. هەر زوو ئامی لۆرانسی کۆنە دۆستی دڵی جێهێشت و یەك دەنکە یادگاری لەدوا بەجێنەما. کە پێشتر وایدەزانی تا ڕادەی شێتبوون خۆشی دەوێ و چەند مانگ لەدوای بوو تا ڕازیکا و ئەویش تەنیا هەفتەیەك پێشتر دانی بە خۆشەویستی تۆم دانا بوو، بۆیە حەوت ڕۆژان بووە شادمانترین و پڕ شانازیترین کوڕ لە جیهان. چونکە لەیەك چرکەساتدا یارەکەی لەنێو دڵی دەرچوو و وەك نامۆیەك، کە سەردانە کورتەکەی تەواو بووبێ.

بە چاوێکی پڕ خۆشەویستیی دەیڕوانییە ئەو پەرییە تازەیە. تا زانی ئەویش سەرنجی دەدا. وا خۆی پیشاندا کە ئاگای لە وی نییە و زۆر منداڵانە دەستی بە خۆهەڵکێشان کرد، بەڵکو کیژۆڵەکە سەرسامکا. ماوەیەك بە ئیشە قۆڕەکانی خەریك بوو، بەڵام پاش ماوەیەك کاتێ خەریکی ئەنجامدانی جووڵانەوەیەکی جیمناستیکی ترسناك بوو، بە تیچاوێك تەماشای کچەکەی کرد، بینی وا پشتی تێکردووە و بەرەو ماڵ بۆتەوە. تۆم بەرەو پەرژینەکە هات و پاڵی پێدا، دڵتەنگ ببوو، حەزی دەکرد کیژەکە کەمێکی دیکە خۆی دوا بخات. ئەویش ساتێك لەسەر پەیژەکان ڕاوەستا،و پاشان بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت، کە پێی لە ژوورێ نا، تۆم هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا، بەڵام کە کیژە بەر لەوەی بزر بێ گوڵێکی بۆ هەڵدا ئەودیو پەرژینەکە. ڕەنگی هاتەوە بەر و گەشاوە.

تۆم غاریدا و یەك دوو پێ دووری گوڵەکە ڕاوەستا، بە شەقامەکەیدا ڕووانی، وەك بڵێی شتێکی گرنگ لەو ئاڕاستەیە ڕوویدات. هێندەی نەبرد دەنکە قەسەڵێکی هەڵگرتەوە و هەوڵیدا لەسەر لووتی ڕابگرێ و سەری بەرەو پشتەوە لار کردبۆوە. کە بەولاو بەولادا دەهات تا هاوسەنگی قەسەڵەکە ڕاگرێ، لە گوڵەکە نێزیك کەوتەوە تا پێی کەوتە سەر و ئەنگوستەکانی لێ نێزیك کەوتەوە. جا بە بازان لەو ناوە دوورکەوتەوە. بەخۆی و بەو گەنجینەیەی دەستی کەوت لە پشت گۆشەی خانووەکەدا خۆی ون کرد، بەڵام بزربوونەکەی زۆری نەخایاند، هەر ئەوەندە بوو تا گوڵەکەی لە چاکەتەکەی گیرکرد و لەنێزیك دڵی دانا، ڕەنگە لەنێزیك گەدەی خۆشی دانابێ، چونکە شارەزایی لە توێکاری و کاری ئەندامەکانی جەستە نەبوو.

هەر چۆنێك بێ بۆ لای شوێنی پێشووی لەنێزیك پەرژینەکە گەڕاوە و تا شەو داهات لەوێ بوو، هەر خەریکی خۆدەرخستن و جوولەی سەیر بوو، بەلاّم کیژەکە چیدی خۆی نیشان نەدا. هەرچەندە تۆم دلّی خۆی بەوە دەداوە، کە رەنگە لەنێزیك یەك لە پەنجەرەکان راوەستا بێ، تا بزانێ چەند بایەخی پێدەدا.. بەلاّم دوایی ناچار بوو بە خۆی و سەری پڕ خەیالّی بەرەو مالّ ببێتەوە.

لەدەمی شێو خواردنی زۆر کەیف شاد بوو، وایکرد پووری بپرسێ: (ئەرێ ئەو منداڵە چی بەسەر هاتووە؟) لەگەلّ ئەوەی زۆر بە توندی سەرکۆنەی کرد، چونکە (سید)ی کەستەك باران کردبوو، بەلاّم ئەو هەر گوێشی پێنەدا و ویستی کلّۆ شەکرێك لە بن کەپووی پووری بدزێ، بۆیە ئەویش بە چۆکیدا کێشا و گوتی:

- پووری خۆ ئەگەر سید شەکری ببا تۆ لێی نادەی.

- باشە.. خۆ سید کەس بێزار ناکا، بەلاّم ئەگەر من چاوم ببزێوم تۆ بەگژ ئەو شەکرەدا دێی.

پاش دەمێك پوورە پۆلی بۆ کارێکی چووە ناندینەکە. (سید)یش نازی هەبووە، بۆیە دەرفەتی هێنا و وەك جۆرە خۆهەلّکێشانێك بەرامبەر تۆم، دەستی درێژکرد و شەکردانەکەی هەلّگرت، بەلاّم شەکردانەکەی لەدەست خزی و کەوتە خوارەوە و شکا و هەرچی تێیدابوو رژا. تۆم زۆر دلّی پێ خۆش بوو، بەلاّم توانی خۆی کرکا و بێدەنگ بێ.. بە خۆشی گوت: تەنانەت ئەگەر پووریشی هاتەوە وشەیەك نادرکێنێ. بەلّکو بە بێدەنگی دادەنیشێ تاکو پووری دەپرسێ کێ ئەو تاوانەی کردووە، ئەوجا حەقیقەتەکەی پێدەلّێ تا ببینێ چۆن تووڕەیی خۆی بەسەر ئەو گوجیلە نازدارەدا دەرێژێ. تۆم لە خۆشیان ئەوەندە پڕ بوو، بەخورتی خۆی راگرتبوو، کە پیرەژن گەڕاوە و زانی چ روویداوە، لەجێی خۆی رەقبۆوە و لە پارچەکانی شەکردانەکە رادەما و ئاگری لە چاوی دەباری، تۆم لەبەرە خۆی گوتی: هەنووکە رەشەبا هەلّدەکا، یەکسەر خۆی رمبەی لێوە هات و بەربۆوە سەر زەوی، پوورە پۆلی چەپەلّۆکی بەرزکردەوە دیسان بەسەریدادا، بەلاّم ئەو هاواری کرد.

- راوەستە، لەسەر چ لە من دەدەی؟.. سید شکاندی!

پوورە پۆلی دەستی لە هەوای رەقبوو، سەرسامی دایگرت و لەتاوان زمانی گرێدرا. بە هێواشی گوتی:

- باشه، تۆ حەقی ئەو شەقەت هەبوو، پێم وایە کە من لێرە نەبووم هەر هەڵەیەکت کردووە.

بەڵام ویژدانی ئازاری دەدا و حەزی دەکرد قسەیەکی خۆشی لەگەڵ بکا، بەڵام نەیکرد، چونکە دەترسا وا گومان ببەن، کە ئەو دانی بەوە داناوە کە هەڵەی کردووە، ئەوەش لەگەڵ سیستەمەکەی ناکۆکە..! بۆیە بێدەنگ بوو بە دڵێکی تەنگەوە چووە گژ کارەکانی. کەچی تۆم بە خەمباری لە گۆشەی ژوورێدا هەڵکورما. دەشیزانی پووری لە دڵەوە بۆی بە چۆکاندا هاتووە و زۆر سووی لێیە، ئەمەش دڵی خۆشکرد.. چونکە نە گوێی دەدا قسە رەقەکانی نە ئاماژەکانی، کە بە قەستی تووڕەبوونیان دەنواند، لە رووی خوێندنەوە چەند ویژدانی ئازاری دەدا و چاوی چۆن پڕ فرمێسك بووە. خۆی واهاتە بەرچاو کە نەخۆشی مردنێیە و لەسەر جێ راکشاوە و پووری بەسەریدا نووشتاوەتەوە و تکای لێدەکا بەیەك وشە لێی ببورێ بەڵام ئەو رووی لە دیواری دەکا و دەمرێ ئەو وشەیە نالێ..! ئای دەبێ لەو ساتەدا هەستی چۆن بێ؟ هەروەها خۆی واهاتە بەرچاو بە خنکاوی لە رووبار هێناویانەتە ماڵێ و هەموو گروازەکانی پرچی تەڕن و دڵی وەك بەفر ساردە.. چۆن پووری خۆی بەسەر تەرمەکەی دادەدا و چۆن ئەشکی لە چاوان دەبارێ و چۆن بە هەردوو لێوان لە خوا دەپاڕێتەوە لێی نەستێنێ و بیداتەوە و هەرگیز جارێکی دیکە لەگەڵی خراپ نابێ. کەچی ئەویش هەر لەوێ کەوتووە و رەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و جووڵەی تێدا نییە، ئەو منداڵە پڕ ئازار و ئەشکەنجەیەی، کە ژانەکانی بەکۆتا هاتوون..!

بەمجۆرە بە هەستەکانی خۆی یاری دەکرد و ئەو خەیاڵ و ئەندێشانەی بەبادەدان، بەوە شاد بوو، کە بە خەیاڵ خەمی دەدانێ. زۆری نەبرد خۆی پێڕانەگیرا و ئەو خەیاڵە سوێیانە برینیان کولاندەوە و چاویان پڕ فرمێسك کرد و بە لالووتیدا هاتنە خوارێ.

وا مایەوە هەتا ماری کچە پووری بە سەماکردن و خۆبادان هاتە ژوورێ و دوای ئەوەی حەفت رۆژان لە شاری بوو بە گەڕانەوەی بۆ ماڵێ گەلەك دڵخۆش و کامەران بوو، کە ئەو رووناکی لە دەرگەیەك هێنا ژووری ئەوجا تۆم لە شوێنی خۆی هەستا و تەم و تاریکی خۆی بە دەرگەیەکی دیکەدا بردە دەرێ.

دوور لەو شوێنانە دەسوڕایەوە کە منداڵ بۆی دەچن. لە شوێنی دوورە دەست و تەنیا دەگەڕا، کە لەگەڵ دڵ توندییەکەی رێککەون.. دارێکی زلی لە رووبارکەدا دیت، لەسەر رۆخی دەرەوەی دانیشت و بیری لە بەرینایی ترسناکی رووبارەکە دەکردەوە، ئاواتەخواز بوو بێ ئەوەی

هەست پێ بکا بتوانێ نقووم بێ و ئەو ئازار و ژانانە نەبینێ کە ئەوانی خۆ دەخنکێنن هەستی پێدەکەن. لەو ساتەدا گوڵەکەی بەبیر هاتەوە.. لە باخەڵی خۆی دەرهێنا.. رووشا بوو و وشك بوو، بەمەش دڵتەنگییەکەی زێتر بوو، لەخۆی دەپرسی: ئەگەر ئەو کچە بە حاڵی بزانی سووی لێ دەبێ..؟ ئایا بۆی دەگری..؟ یاخۆ دەخوازێ ئازادییەکی زیاتری هەبا تا دەستی لە ملی بکردبا و هەندێك ئارامی پێ بەخشیبا..؟ یا پەشیمان دەبۆوە و بەساردییەوە پاشاوپاش لێی دەکشاوە، وەك هەموو ئەو جیهانە بەتاڵ و بۆشە..! ئەم وێنەیە وای لێکرد ئازار ببینێ، بەڵام ئازارێکی بە تام و چێژ، بۆیە لە مێشکی خۆی دەیهێنا و دەیبرد لە هەموو لایەکەوە رووناکی دەخستە سەر چاکە و خراپەکانی لێك هاوێر دەکرد.. لە دواییدا بە هەناسە ساردی لە شوێنی خۆی قیت بۆوە و هێندەی نەبرد تاریکی هەڵیلووشی.

دەوروبەری سەعات نۆ و نیو یاخۆ دە بوو، گەیشتە ئەو کۆڵانەی دۆستە نەناسراوەکەی تێدا دەژیا، ساتێك لەبەردەم ماڵەکەیاندا راوەستا. گوێی خۆی هەڵخست هیچی نەبیست. رووناکی مۆمێك بەسەر ئەو پەردەیەدا دەشکاوە، کە پەنجەرەی نهۆمی دووەمی داپۆشیبوو، ئایا دەبێ ئەو کچە لەوێ بێ؟ بە پەرژینەکەدا هەڵگەڕا، هەوڵی دەدا رێ بەدی بکا و بەنێو دەوەن و درەختەکانی باخەکەدا رەت دەبوو، تا گەیشتە ژێر ئەو پەنجەرەیە. ماوەیەکی درێژ بە خۆشەویتسییەوە تێیڕووانی. پاشان لەژێریدا لەسەر زەوی درێژ بوو. لەسەر پشت ئارامی گرت و دەستەکانی خستە سەر سینگی و گوڵە پەڕپووتەکەی بەدەستەوە گرت دەیویست لەو کەشە ساردوسڕەدا بمرێ. بێ ئەوەی هیچ مەکۆیەك سەری بێ جێگەی لەخۆ بگرێ. دەستێکی بەسۆز نەبوو جواناوی مردن لە هەنیەی بسڕێتەوە. رووێکی جوان نەبوو بەسەریدا بنوشتێتەوە و کە دەمرێ بیلاوێنێتەوە. بەم جۆرە کە سبەینێ ئەو کچە بۆ پێشوازی بەیانییەکی جوان لە پەنجەرەوە دەڕوانێ ئەویش دەبینێ.. ئاخ..! دەبێ فرمێسکێك بۆ جەستە بێگانەکەی بڕێژێ..؟ دەبێ هەناسەیەك هەڵکێشێ کە کۆچی ناوەختی ئەو گەنجە دەبینێ؟

لەودەمە پەنجەرەکە کراوە، دەنگی خزمەتکارێك پەردەی ئارامییەکەی سمی و زۆری نەبرد پاشماوەی جوانەمەرگەکە کەوتەبەر لافاوی ئەو ئاوەی بەسەریدا کرا.

پاڵەوانی دڵسووتاو راستبۆوە، ئاو و تووڕەیی لێدەباری. دەستی بەجوێن و نەفرەتان کرد.. دەنگی شووشەیەکی ورد و خاشبووشی بەدوا داهات. تارماییە گچکەکە بەسەر پەرژینەکە سەرکەوت و لە تاریکیدا گوم بوو.

کەمێك لەدوای ئەوە، کە تۆم بۆ نووستن خۆی تەنها دەکرد. لەبەر رووناکی کزی چراکە دەیڕوانییەجلکە تەڕەکانی. سید وەئاگاهات. هەرچەندە دیتی جلوبەرگی تۆم چییان بەسەرهاتووە، بەلاّم لە ترسان نەوێرا هیچ بڵێ، چونکە تۆم غەزەبی لە چاوان دەباری.

تۆم بێ ئەوەی وەك جاران نوێژ بکا، چووە سەرجێ.. سید لە مێشکی خۆی ئەمەشی تێبینی کرد.

# پاژی چوارەم

خۆر بەسەر دنیای هێمندا هەڵات و تیشکەکانی بەسەر گوندەکەدا پەخشکرد. ئەوکات هەموو لەبەرچایی خواردنی ببوونەوە. پوورە پۆلی لەگەڵ خێزانەکەی دەستی بە نوێژی سبەینێ کرد، لەدەستپێك چەند دێڕێکی لە ئینجیل خوێند و لە کۆتاییشدا لە خودا پاڕایەوە کە خانەوادەکەی بپارێزێ.

کە نوێژەکەیان تەواو بوو، تۆم دەستی بە دەورکردنەوەی وانە ئاینییەکەی کرد، چەند رۆژێك بوو سید هەمووی لەبەرکردبوو، تۆمیش هەموو توانای خۆی وەگەڕخست تا پێنج دێڕ لەبەرکا. پارچەی (سرووتی چیا*)ی هەڵبژاردبوو، چونکە دێرەکانی لە هەمووی کورتتربوون. پاش نیو سەعات تۆم توانی تەنیا بیرۆکەیەکی تێکەڵ و پێکەڵی لەوانەکەی هەڵکرێنێ، چونکە مێشکی بە هەموو شتێك خەریك بوو کە بە خەیاڵی مرۆڤدا دێ، بە دەستەکانیشی خەریکی یاریکردن بوو. ماری کتێبەکەی لێوەرگرت، تا بزانێ چی لەبەرکردووە. هەوڵیدا بەناو تەمومژدا رێگەیەك بۆخۆی بدۆزێتەوە، گوتی:

- مزگێنی بۆ هـ.... هـ... هـ

- بۆ هەژاران

- بەڵێ... بۆ هەژاران... مزگێنی بۆ هەژاران

- بۆ گیانی

- بۆ گیانی.. مزگێنی بۆ گیانی هەژاران.. چونکە

- چونکە.. مزگێنی بۆ گیانی هەژاران، چونکە مەلەکوتی ئاسمانەکان بۆ ئەوانە.. مزگێنی بۆ خەمینان لەبەرئەوەی.. لەبەرئەوەی..

- چونکە.. لەبەرئەوەی

- ئەوا..

---

* بەشێکە لە ئینجیل

- لەبەرئەوەی ئەوا... نازانم چی بەدوادا دێ.

- ئەوا..!

- بەڵێ! ئەو..! چونکە ئەو... خەمبار دەبن.. مزگێنی بۆ ئەوان چونکە.. چونکە... ئێی؟

- ئەرێ ماری بۆ پێم نالێی.. بۆ دەتەوێ ئازارمدەی..!؟

- ئای تۆم.. هەی دەبەنگی بێ عەقڵ.. من ئازارت نادەم، چونکە دڵم نایە، دەبێ بچی ئەوجارەش بخوێنی.. نابێ خۆت بدەیتە دەست بێ هیوایی.. متمانەت بەخۆت بێ کە وانەکەت ئەزبەر دەکەی.. ئەگەر لەبەریشت کرد، شتێکی زۆر جوانت دەدەمێ.. باشە کوڕی باش.

- باشە ماری.. بەس پێم بڵێ چم دەدەیێ؟

- بیری لێمەکەوە تۆم، دەزانی ئەگەر بڵێم شتێکی جوانە، شتێکی جوانە.

- مادام تۆ پێت وایە، زۆر باشە ماری. منیش دەستپێدەکەم.

بەڕاستی هەوڵی خوێندنی دایەوە، هێندەی حەزلێبوو بزانێ چ وەردەگرێ، بەتەواوی کەوتە ناو خوێندنێ، وا خوێندی تا بەتەواوی لەبەریکرد. ئەوسا ماری قەڵەمبڕێکی نوێی دایە، کە نرخەکەی دوازدە سەنت و نیو بوو. ئەم سەرکەوتنە وایکرد خۆشی هەموو گیانی دابگرێ. هەرچەندە چەقۆکە هیچی نەدەبڕی، بەلاّم خۆ قەڵەمبڕێکی جوان و بەهادار بوو. کوڕانی رۆژئاوایی هەرئەوەیان بەخەیاڵدادێ، کە چەکێکی وا رەنگە برینی سەیری لێبکەوێتەوە و شوێنیان سارێژ نەبێ. تۆم بەتەما بوو دۆلاّبەکە بکاتە قوربانی و خەریکبوو مێزەکەی پێ هەڵکڕێنی، بەلاّم گازیانکرد شمەکەکانی لەبەرکا و بۆ فێرگەی یەکشەمێ خۆی ئامادەکا.

ماری دەستشۆرێکی پڕ ئاو و پارچە سابوونێکی بۆ هێنا. ئەویش چووە ئەودیوی دەرگە و دەستشۆرەکەی لەسەر کورسییەك دانا و پارچە سابوونەکەی تێهاوێشت خۆی چەماندەوە و قۆڵەکانی هەڵکردن. پاشان بەهێمنی ئاوەکەی رشتە سەر زەوی و گەڕاوە ناندینێ و بەو پەشتەماڵەی لەپشت دەرگە هەڵواسرابوو، دەموچاوی سڕییەوە، بەلاّم ماری پەشتەماڵەکەی لەدەست راتەکاند و گوتی:

-ئێستا تۆ شەرمت بەخۆت نییە..!؟ تۆم تۆ نابێ هێندە بەدبی. خۆ ئاو ئازارت نادا.

تۆم قیچەك پەشۆکا... دەستشۆرەکە پڕکراوە، ئەوجارە کەمێك بەدیارییەوە راوەستا و ئازایەتی خۆی خڕکردەوە. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دەستیپێکرد. بەچاوی نوقاو گەڕاوە ناندینێ و دەستی بۆ پەشتەماڵەکە دەگێڕا و وەك بەڵگەش ئاو و بڵقەسابوونی لە رووی دەتکا.. کە دەموچاوی سڕییەوە هێشتا بەتەواوی خاوێن نەببۆوە. رووی پتر بە ماسکێك

دەچوو، چونکە تەنیا شەویلاك و  چەنەگەی خاوێن ببوونەوە و ئەوی دیکەی رەش دەچۆوە و بەشێکی زۆری ئاوی پێنەکەتبوو، چڵك و قرێژ بە بەروپشتی ملیدا پەرتببوو. ماری تاوێك خەریکی بوو، کە تەواوبوو، تۆم ببووە پیاوێکی دیکە. قژە چرەکەی بە جوانی داهێنرابوو، گلۆازە کورتەکانی وا رێکخرابوون، دیمەنێکی  کۆك و تەبای پێ بەخشیبوو، بەلاَم ئەو هەر دەستی لە پرچی وەردەدا تا تێکیدا، وایدەزانی ئاوا کچانە هەلَکەوتووە و ژیانی تالَدەکا. ئەوجا ماری دەستە جلێکی تۆمی دەرهێنا، کە لە دوو ساڵی دوایی تەنیا یەکشەمان لەبەریدەکرد و پێشیان دەگوت، جلەکانی دیکە. بەمجۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو کورە چەندی پۆشاك هەبووە. کە جلەکانی لەبەرکرد ماری دەستێکی پێدا هێنا و رێکیخست و چاکەتەکەی تا بەر گەردنی بۆ داخست، ئەوجا کلاَوە پووشینەکەی خستە سەرسەری. هەرچەندە کەشخە دیاربوو، بەلاَم حەجمانی نەبوو، چونکە ئەو جلوبەرگە بەری جوولَەیان لێدەگرت، زۆریشی حەزدەکرد ماری پێلاَوەکانی لەبیرکا، بەلاَم ئارەزووەکەی زوو بەباچوو، چونکە ماری پێلاَوەکانی هێنا و وەکو باو بوو هەندێ دۆنی تێهەلَسووین. هەر بەجارێك زەوقی تێکچوو، گوتی: هەمیشە ناچاری دەکەن کاری وابکا کە حەز ناکا بیکا، بەلاَم ماری بۆ دلَنەواییکردن پێی گوت:

- تکایە تۆم.. تۆ کورێکی باشی

جا بەنادلَی پێلاَوەکانی لەپێکرد. پاش کەمێك ماری ئامادەبوو، هەرسێ منداڵ بەرەو فێرگەی یەکشەمان بەرێکەوتن، ئەو شوێنەی کە تۆم پڕ بەدڵ رقی لێدەبۆوە، کەچی سید و ماری کەیفیان پێدەهات.

ساتەکانی خوێندن لە نۆ تاکو دە و نیو بوو. پاشان نوێژ لە کلێسا دەکرا، هەمیشە دوو منداڵ خۆبەخشانە بۆ کاتی وتاردان دەمانەوە و ئەوانی دیکەش -لەبەر هۆی گرنگتر- هەر دەمانەوە. کورسییە پشت رەقوتەق و بەرزەکانی کلێسا بای سێ سەد کەسیان دەکرد. کلێساکەش بۆ خۆی بچووك بوو، بەلاَم خاوێن و رێك.. کاتێ تۆم و ئەوانی دی گەیشتنە کلێسا.. ئەو هەنگاوێك کشاوە تا قسە لەگەڵ دۆستێکی بکا:

- بیلْ پێمبڵێ.. کارتێکی زەردت هەیە..؟
- بەڵێ.
- چیت لەباتی دەوێ؟
- تۆ چی پێدەدەی؟

- هەندێ وردەواڵە و قولابێکی ماسی.

- با بیانبینم.

تۆم شتەکانی پیشاندا.. بێلی رازیبوو لەگەڵی بگۆڕیتەوە و شتەکان ئەم دەست ئەو دەستیان کرد. تۆم چەند ئاڵوگۆڕییەکی دیکەی کرد و سێ کارتی سووری بەدەستهێنا، پاشان جووتێکی بە شین کارت دەستکەوت. چاوی بڕیبووە ئەو منداڵانەی دەهاتنە کڵێسا، بەو گەنجینەی لە رۆژی بۆیاخکردنی دەستی کەوتبوو، کارتی رەنگاوڕەنگی لێدەکڕین. ئەمەش پتر لە چارەکە سەعاتێکی پێچوو، کە تەواوبوو، لەگەڵ کیژ و کوڕە خاوێن و بەدەنگە دەنگەکانی دیکە لە کڵێسا چووە ژوور. بەرەو کورسی خۆی دەچوو لەگەڵ یەکەم کوڕ بەشەڕهات کە رووبەڕووی بۆوە. مامۆستا پیر و کۆنەساڵەکەیان هاتە نێوان و لێکیکردنەوە. هەر مامۆستا رووی وەرگێڕا تۆم پرچی کوڕەکەی راکێشا کە لە کورسییەکەی پێشەوە دانیشتبوو. کە کوڕەکە ئاوڕی لێداوە دیتی وا سەری بەسەر کتێبەکەی بەردەمی داگرتووە، ئەو کوڕە لێی گەڕا، تۆم دەرزییەکی لە پشتی کوڕێکی دیکە راکرد. کوڕە هاواریکرد.. ئۆف.. مامۆستا ئاوڕی لێداوە و زۆر بەتوندی سەرکۆنەی کرد. هەر دەرسێکی تۆمی تێدابا، پڕ هەراوهۆریا و کێشە بوو. کە دەمی ئەوە هات وانەکانیان بخوێننەوە دەرکەوت کەسیان دێرەکانیان باش لەبەرنەکردووە، بۆیە مامۆستا ناچاربوو هەر بەبیریان بێنێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا مامۆستا هەر یەکە و چەندی شایستە بوو کارتی شینی پێدا، بۆ دوو دێڕ کارتێکی دەدا و هەر دە کارتی شینیش بە یەك کارتی سوور یەکسان بوون و دە دانەی سووریش یەك کارتی زەردیان دەکرد. واش ببووە باو هەر کەسێکی دە کارتی زەردی وەرگرتبا ئینجیلێکی جوانی وەردەگرت، کە نرخەکەی لەوان رۆژاندا چل سەنت بوو، بەڵام زۆر زەحمەت بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ماری بە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر لە ماوەی دوو ساڵاندا توانیبووی دوو دانە لەو ئینجیلانە وەرگرێ. کوڕێکیش کە دایك و باوکی ئەڵمان بوون، چوار یاخۆ پێنج ئینجیلی وەدەستهێنا بوو. چونکە رۆژێکیان توانی سێ هەزار دێر بەبێ راوەستان بڵێتەوە، بەڵام ئەو کوڕە ئەو جارە مێشکی زۆر ماندووبوو، بۆیە لەو رۆژەوە وەك گێلانی لێهاتووە. ئەمەش بۆ فێرگەکە رووداوێکی زۆر کاریگەر بوو. جا لە دەرفەتی کۆبوونەوە گرنگەکان، سەرپەرشتیارەکە ئەو کوڕەی بانگدەکرد و داوای لێدەکرد تواناکانی خۆی دەرخا. پاش ئەو رووداوە، تەنیا منداڵە هەراشەکان دەیانتوانی کارتە رەنگاوڕەنگەکان وەربگرن و لای خۆیان بیهێڵنەوە و ئەوەندە هەوڵدەن، ئینجیلێك بەدەست بێنن. هەروەك پێشکەشکردنی ئەو پاداشتانە لە بۆنەی گرنگ کەم روویاندەدا. ئەگەر

قوتابییەکیش یەك لەو ئینجیلانەی وەرگرتبا، وا دادەنرا کە شەرەفێکی مەزنی وەرگرتووە، جا مامۆستا خەلاتی دەکرد و قوتابییەکانی دیکەش ئێرەییان پێدەبرد و ئەمەش دوو هەفتەی دەخایاند. ڕەنگە هەرگیز مێشکی تۆم برسی یەکێك لەو پاداشتانە نەبوو بێ، بەلام لەم چەند ڕۆژەی دواییدا زۆری حەز چووبووە چەپلە و ڕێزلێنان، کە هەر قوتابییەکی براوە دەستی دەکەوێ.

لە کاتی دیاریکراودا سەرپەرشتیارەکە لەبەردەم دوانگەدا ڕاوەستا و کتێبێکی ئاینی بە داخراوی بەدەستەوە بوو، دۆشاومژەی خستبووە نێوان دوو لە لاپەڕەکانی، داوایکرد سەرنج بدەن. وا باوە سەرپەرشتیاری فێرگەی یەکشەمان کە وتارێکی کورت دەدا، دەبێ کتێبێکی ئاینی بەدەستەوە بێ کاتێك لەسەر سەکۆکە ڕادەوەستێ تا تەرتیلێك بخوێنێ. تا ئێستاش دیار نییە ئەم نەریتە لەچییەوە هاتووە.. چونکە لەکاتی تەرتیلەکاندا نە کەس دەڕوانێتە کتێبەکە و نە کەسیش تەماشای پارچە مۆسیقاکەی سەر کاغەز دەکات. سەرپەرشتیارەکە یەکێکی ڕەقەڵەی سی و پێنج ساڵان بوو، ریشێکی بزنانی و قژێکی زێڕینی هەبوو. یاخەی ڕەق و بەرزبوو، دەگەیشتە بناگوێی، کە دوو گوێی نوشتاوەی هەبوو لە گۆشەکانی دەمی نێزیکدەبوونەوە. ئەمانە ببوونە پەرژینێك وایان لە سەرپەرشتیارەکە کردبوو، هەمیشە بەرەو پێشەوە بڕوانێ. ئەگەر پێویستیش با تەماشای لایەکی دیکە بکا، دەبوو هەموو جەستەی وەسووڕێنێ. چەناگەی کەوتبووە سەر قەرەوێتێکی زۆر پانوپۆڕ. کە درێژییەکەی لەدراوێکی کاغەز تێنەدەپەڕی. لمووزی پێلاوەکەی وەك مۆدێلی ئەوسا بەرەو سەر نووشتابۆوە. گەنجەکانی ئەو سەردەمی بە سەعات ئەنگوستەکانی خۆیان لە دیواری سەرەوەی پێلاوەکە گیردەکرد تاکو بنوشتێتەوە و لەگەڵ مۆدە ڕێککەوێ..! بەکورتی ڕێزدار والتەرزی سەرپەرشتیار پیاوێکی بە هەیبەت و مەرد و دڵسۆز و دەسپاك بوو، زۆر بایەخی بە دروشمە ئاینییەکان دەدا. شت و شوێنە پیرۆزەکانی لە شتە دنیاییەکان جیادەکردەوە. لەکاتی فێرگەی یەکشەماندا دەنگی ئاوازێکی تایبەتی وەردەگرت، کە لە ڕۆژەکانی دیکە وانەبوو. دەستی بە وتارەکەی کرد و گوتی:

-منداڵینە، ئێستا دەمەوێ تا دەتوانن بە جوانی گوێم بۆ ڕادێرن و یەك دوو خولەك تەواوی سەرنجی خۆتانم دەنێ. ئەمە ئەو شێوازەی کە منداڵی چاك دەبێ پەیڕەوی بێ.. بەلام وا کیژۆڵەیەك دەبینم، لە پەنجەرەڕا دەڕوانێتە دەرەوە. دەترسێم وا بزانێ من لە دەرەوەم، یاخۆ لەسەر یەك لە درەختەکانم و وتار بۆ باڵندان دەدەم..! (چرپە چرپ کەوتە ناو ئامادەبووان).

حەزدەکەم بڵێم کاتێك ئەو هەموو رووە پاك و گەش و بچووکە دەبینم هاتوون تا فێری خێر و چاکە بن، زۆر هەست بە ئاسوودەیی دەکەم. جا بەم شێوەیە پێویست نییە دانیشین و هەموو وتارەکە دووبارە بکەینەوە. چونکە یەك شێوازی دیاریکراو بوو، نەدەگۆڕا و هەمووشمان پێی ئاشناین.

دوای سێیەکی وتارەکە بەهۆی دەودەوانێی شەڕی منداڵە بێعارەکان و لەبەرئەوەی ئەوانی دیش لە درێژی وتارەکە بێزارببوون پەشۆکا. زۆری پێنەچوو پەشێوی گەیشتە نێو منداڵە بێدەنگ و گوێڕایەڵەکانی وەکو سید و مارییش. کەچی لەناکاو ژاوەژاوەکە لەگەڵ نزمبوونەوەی دەنگی بەڕێز والتەرز بەرەو کۆتاچوونی وتارەکەی، نەما. هەنگێ هەموو وەك سوپاسگوزارییەك بێدەنگبوون.

لەبەر رووداوێکی دەگمەن چرپە چرپ لەنێو ئامادەبووان زۆر بووەوە، رووداوەکەش ئامادەبوونی کۆمەڵە میوانێکی زۆر بوو. وەك (تاچەر)ی پارێزەر، کە یەکێکی زۆر پیر و پیاوێکی خانەدان و ژنێکی خاتوونی لەگەڵدا بوو، کە دیاربوو ژنی ئەم پیاوەیە. ئەو خاتوونە کیژۆڵەیەکی لەگەڵ بوو، تۆم هەستی بە ناخۆشی دەکرد و ویژدانی ئازاری دەدا. نەیدەتوانی تەماشای چاوی ئیمی لۆرانسی کۆنە دۆستی بکا، ئەویش بە چاوێکی پڕ خۆشەویستیی سەیری وی دەکرد، بەلاّم کە ئەو کیژۆڵە گچکەلانەی دیت دەهات گیانی لە ئاسوودەیی تژی بوو، بۆیە دەستی بەخۆهەڵکێشان کردەوە،.. هەنیشکێکی لەو دەدا و پرچی ئەمی رادەکێشا و جوولانەوەی سەیری بە دەموچاوی دەکرد، واتە هەرچی هونەر بوو بەکاری دەهێنا تا دڵی ئەو کچە بۆ لای خۆی راکێشێ. هەر ئەمە گوڵە وشکەوەبووەکەی دایە و پاشان کە لە باخچەکەدا راکشا و ئاسمانی بە خۆیدادا، هەستی بە کەساسی کرد.

بەرزترین کورسییەکانی هۆڵ بۆ میوانان تەرخانکرا. یەکسەر دوای تەواوبوونی وتارەکەی، رێزدار والتەرز میوانەکانی بە منداڵان ناساند. پیاوێك لە ناوەڕاستی تەمەن کەسایەتییەکی دیار و بە ویقار کە قازی هەرێمەکە بوو، لە هەموو منداڵەکان کەس نەبوو پێشتر یەکێکی وای دیبێ. بۆیە هەموو سەرسامبوون دەیانپرسی ئاخۆ ئەوەش وەك ئەوان مرۆڤە. حەزیان دەکرد گوێیان لێبێ وەك دادگە بنەڕێنێ. لەهەمان کات لەمە دەشترسان. پێی سەرسامبوون، چونکە ئەو لە کۆنستانتینۆپڵەوە دوازدە میل دوور لە گوندەکەیانەوە هاتبوو. ئەمەش مانای وابوو، کە گەشتی زۆر کردوون و زۆری دنیا دیوە. ئەو بێدەنگییەی هۆڵەکەی داگرتبوو، یەکجاری وای کردبوو دۆش دامێنن. بۆیە هەموو چاوەکان لەو میوانە رادەمان، کە تاچەری قازی بوو. برای

پارێزەرەکەی خۆیان.. جیف تاچەر بەرەو ئەو پیاوە گەورەیە چوو تا دەستی بگوشێ، لە کاتێکدا کە هەموو بە چاوی ئێرەییەوە تێیاندەڕوانی. ئەگەر گوێی لەم چرپەیەش با، لە خۆشییان هەڵدەپەڕی:

- جیم تەماشایکە..! وا لێی نێزیك دەبێتەوە..! وا دەبێ تۆقەی لەگەڵدا بکا.. وا بەڕاستی دەستی دەگوشێ.! ئەوە چییە..! حەز ناکەی تۆ جیف بووای..؟!

ڕێزدار والتەرز دەستی بەکارەکانی خۆی کرد، لێرە و لەوێ فەرمانی دەدا و خۆی هەڵدەکێشا و یاریدەدەرەکانی خۆی بەهەموو لایەکدا ئاراستە دەکرد. بەرپرسی کتێبخانەش حەزی کرد خۆی هەڵکێشێ و کۆمەڵێك کتێب و سەرچاوەی بە باوەشەوە بوو، بەملاوئەولا غاری دەدا، خۆی تەنگەتاو کردبوو و هەر منگەی لێوە دەهات.

خانمە مامۆستا جحێڵەکانیش بۆ خۆدەرخستن بەناو قوتابییاندا پەرت ببوون و دوای مست بۆکسیان خوارد. پەنجەکانیان بەرەو لێویان بەرزدەکردەوە تاکو منداڵە هاروهاجەکان ئاگەدارکەنەوە، کە ئەمە چەند بۆنەیەکی گەورەیە، مامۆستا لاوەکانیش بەگەرمی چوون ئەرکی خۆیان جێبەجێ بکەن و بەهێمنی منداڵە بەدەکانیان دەترساند و داوایان لە هەمووان دەکرد ڕێز لە ڕێکوپێکی بگرن. لەو ساتەدا زۆرینەی مامۆستاکان چ ژن و چ پیاو کاریان بۆ خۆیان دۆزییەوە جا لە کتێبخانە با یاخۆ لەسەر سەکۆکە.. هەر کارێك بەبێ پێویست دووبارە و سێبارە دەبۆوە. کیژۆڵەکان لە چەند ڕووێکەوە خۆیان دەرخست. کوڕەکانیش بەوە خۆیان هەڵکێشا، کە چەقەچەق بکەن و قازیش بە لەخۆباییبوونەوە لە هەموو ئەوانەی دەڕوانی لەبەر ئەو پێشوازییە گەرمە خەندەی کەوتبووە سەر لێوان و ئەویش بۆ خۆهەڵکێشان خۆی مەزن پیشاندەدا.

ڕێزدار واڵتەرز یەك شتی مابوو تا بە تەواوی ئاسوودە بێ، ئەویش ئەوەبوو بۆی هەڵکەوێ ئینجیلێك بە پاداشت بداتە قوتابییەك و تواناکانی دەربخا. منداڵ زۆربوون کارتی زەردیان هەبوو، بەڵام کەسیان ئەوەندەیان نەبوو بایی وەرگرتنی ئینجیلێك بکا. ڕێزدار واڵتەرز ئامادەبوو هەر شتێك ببەخشێ، ئەگەر ئەمڕۆ بیتوانیبا منداڵە ئەڵمانییەکە بەسەلامەتی بگەڕێنێتەوە. لەو ساتەدا... ساتی تاڵی و بێ هیوایی، تۆم سۆیەر هاتەپێش، نۆ کارتی زەرد و نۆی سوور و دە دانەی شینی پێبوو، داوای کرد ئینجیلێك وەرگرێ. ئەمە دەتگوت بروسکێك بوو لە ئاسمانێکی ساماڵ و بێ پەڵەوە، ڕێزدار واڵتەرز هەرگیز بەتەما نەبوو تەنانەت دوای دەساڵیش منداڵێکی وەکو تۆم سۆیەر سەرکەوێ. بەڵام نەیدەتوانی خۆی باداو نە پێی دەکرا ڕەتیکاتەوە، چونکە تۆم کارتی مۆرکراوی پێبوون و نەدەکرا ڕەتکرێنەوە، ئەوجا تۆم بەرەو ئەو

مینبەرە بەرزکراوە، کە قازی و ئەوانی دی لەسەر بوون و هەواڵەکە لە سەرکردایەتییەوە ڕاگەیاندرا. ئەمە عاجباتی ئەم نەوەیە بوو. کاریگەرییەکی زۆری دروستکرد، ئەو پاڵەوانە تازەیەی بەرەو پایەیەکی مەزن بەرزکردەوە. بۆ سەرسووڕهێنەکانی ئەو ڕۆژە لە قوتابخانەکەدا بوون بە دوو، قازی و تۆم. ئێرەیی جەرگی کوڕەکانی دەخوارد، بەلاّم پڕ حەژمەت و دلّڕەشتر ئەوانە بوون، کە بۆیان دەرکەوت، ئەوان بوونە مایەی ئەوەی تۆم ئەو خەلاّتە وەرگرێ، چونکە کارتەکانی خۆیان بەو شتە پووچانە پێ فرۆشت، کە لە ڕۆژی پەرژین بۆیەکردنەکە لە برادەرانی وەرگرتبوو تا ڕێگەیان بدا بۆیاخ بکەن. ئەو کوڕانە خۆیان زۆر بەکەم دەزانی، چونکە لێگەڕان تۆم وەکو ماری پێ لەزگ هەڵیانبخەڵەتێنێ و پێیان رابوێرێ.

خەلاّتەکە پێشکەش بە تۆم کرا، سەرپەرشتیارەکە هەر لەناو ئەو کەشوهەوایەدا بای خواردبوو، دەنا بۆ خەلاّتکردنەکە زۆر گەرم نەبوو، هەر لەخۆڕا دەیزانی رازێك لەم کارەدا هەیە. چونکە دلّنیا بوو کە منداڵێکی وەکو تۆم ناتوانێ دوو هەزار دێری ئینجیل لەبەرکا، لەکاتێکدا تەنیا دە دێر شنگی لێدەبڕی و مێشکی وشك دەکرد.

ئێمی لۆرانس زۆر شاناز و دلّشاد بوو، هەولّیدا سەرنجی تۆم بۆ خۆی راکێشێ. بەلاّم ئەو بە خەیاڵیدا نەهات تەماشای بکا، کیژە سەری سوڕما و زۆری نەبرد تووشی دلّەڕاوکێ بوو. دلّەڕاوکێیەکەی لێ بووە گومان. گومانەکەشی لە دلّیدا دەهات و دەچوو. بە دزییەوە چاودێری تۆمی دەکرد، یەك تێڕوانین هەموو شتێکی بۆ دەرخست و هیوا و ئاواتی تێکشکاند و دلّی لێی پیسکرد و تووڕە بوو، فرمێسکی لەچاو هاتەخوار و رقی لە هەمووان هەستا، لە هەمووانیش زیاتر رقی لە تۆم بوو، یاخوود وایدەزانی.

تۆمیان بە قازی ناساند، وای هەستدەکرد زمانی لغاوکراوە و ئێستا هەناسەی رادەوەستێ، دلّی زۆر بە توندی لێیدەدا. لە دیداری پیاوێکی وا گەورە ترسی لێ نیشتبوو. بە تایبەتیش ئەو دەمەی بۆی دەرکەوت کە ئەو پیاوە باوکی خۆشەویستەکەیەتی. ئەگەر شەوبا ئامادەبوو لەبەردەم ئەو خۆشەویستە بێتە سەرچۆك. بەلاّم ڕۆژ بوو، لەو ساتەدا قازی دەستی لەسەر سەری تۆم دانا و گوتی ئەمە پیاوێکی ژیکەلّەیە و ئەوجا پرسیاری ناوی لێ کرد. تۆمیش دەمی تێك ئالا و بەزەحمەت پشی هەلّکێشا و گوتی:

- تۆم
- نا.. نا .. تۆ ناوت تۆم...
- تۆماس

- بەڵێ، ئەوەیان راستە.. باشە.. بەڵام من لام وایە تۆ ناوێکی دیکەشت هەیە.. دەکرێ پێمی بڵێی..

واڵتەرز گوتی:

- تۆماس ناوەکەی دیکەت بەم بەڕێزە بڵێ و لەکۆتایی قسەکانیشت بڵێ گەورەم. رەوشتی بەرز لەبیر مەکە.

- تۆماس سۆیەر.. گەورەم.

- تەواوە، باشە کوڕی باش.. دوو هەزار دێر گەلێك زۆرە.. بەڵێ.. هەر زۆر زۆرە، بەڵام قەت لەوە پەشیمان نابییەوە، کە بە ئەزبەرکردنیانەوە ماندووبووی. چونکە زانین بەهادارترین شتە لە جیهاندا. هەر زانین پیاوی مەزن و چاك دروست دەکا، تۆماس تۆش رۆژێك دەبییە یەکێك لەو مەزنە چاکەکارانە، جا ئەو رۆژە ئاورێك بۆ دواوە دەدەیەوە و دەڵێی: ئەمە هەمووی بۆ ئەو شتە باشانە دەگەڕێتەوە کە لە سەردەمی منداڵیم فێرگەی یەکشەمان فێریان کردم چۆن زانستم خۆش بوێ و هانیاندام و بایەخیان پێدام و دانەیەکی جوانی ئینجیلیان پێدام تا بیپارێزم و هەمیشە لەلام بمێنێ.. ئەمە هەمووی بۆ پەروەردەی دروست دەگەڕێتەوە. رۆژێك دادێ تۆ وا دەڵێی. تۆماس تۆ لەپای ئەزبەرکردنی ئەو دوو هەزار دێرە پارە وەرناگری.. نەخێر.. من دەزانم بەوە رازی نابی.. ئێستاش پێموایە لات ئاساییە لەوەندەی لەبەرتە شتێك بۆ من و بۆ ئەو خانمە بخوێنییەوە.. نەخێر دەزانم پێت ناخۆش نییە، چونکە ئێمە شانازی بەو کوڕە بچووکانە دەکەین، کە فێردەبن. ئێستاکەش بێگومان تۆ ناوی هەر دوازدە شاگردەکەی مەسیح دەزانی.. دە ناوی دووی یەکەمان پێ بڵێ:

تۆم یاری بە قۆپچەی چاکەتەکەی دەکرد و دەتگوت مەڕە، ئێستا شپرزەیی لێدەرکەوت و چاوی بەرداوە. رێزدار واڵتەرز بەجارێ دڵی بەربۆوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: مەحاڵە ئەو کوڕە بتوانێ پرسیاری وا ساکاریش وەڵامداتەوە، قازی بۆ پرسیاری لێکرد؟ لەگەڵ ئەمەش هەستیکرد ناچارە قسەیەك بکات، گوتی:

- تۆماسی بەڕێز، مەترسە، وەڵامی پرسیارەکە بدەوە.

تۆم بەتەواوی زمانی لەکار کەوتبوو.

خانمەکە گوتی:

- ئێستا من دەزانم تۆ بە منی دەڵێی، ناوەکانی یەکەم دوو شاگردی مەسیح....

- دەیڤد و گۆلیا

با لێرە پەردە دادەینەوە و لە پاشماوەی دیمەنەکە نەڕووانین

# پاژی پێنجەم

نێزیکی کاتژمێر دە و نیو بوو کە زەنگی کلێسا بچووکەکە لێیدا، هێندەی پێنەچوو خەڵك بۆ نوێژی بەیانی کۆبوونەوە، منداڵەکانی فێرگەی یەکشەمیش بەو ناوەدا پەرتبوون و لەگەڵ دایك و باوکیان چوونە سەر کورسییە پشت بەرزەکان بۆ ئەوەی لەژێر چاودێری ئەوان دەرنەچن. پوورە پۆلی هات و تۆم و سید و ماری لەگەڵی دانیشتن، تۆم لەتەنیشت ڕێڕەوەکە دانیشتبوو. تا دەکرێ لە پەنجەرە کراوەکە و دیمەنی هاوینی سەرنجڕاکێش دوور بێ. خەڵك هاتن و ڕاڕەوەکان پڕبوون. لەوانە: بەڕێوەبەرە پیر و هەژارەکەی پۆستە.. سەرۆکی شارەوانی و ژنەکەی، چونکە گوندەکە سەرۆکی شارەوانی هەبوو. وەك زۆر پۆست و شتی دیکەی ناپێویست. دۆگلاسی بێوەژن کە ژنێکی جوان و ڕێکپۆش بوو. تەمەنی چل ساڵان بوو، بەوە ناسرا بوو، کە چاوتێر و دڵی باش و بەخشندەیە و کۆشکەکەی بەسەر گردێکەوە بوو، تاکە کۆشکیش بوو لە گوندەکەدا و بەگەورەترین خانەی میوانداری دادەنرا و لە هەمووان نانبدەتر بوو و بۆنە و داوەتی گەورەی تێدا ساز دەکرا، بۆیە مایەی شانازی تێکڕای سانت پەتروسپۆرگ بوو. هەروەك ڕێزداران سەرهەنگ وارد و ژنەکەی و ریڤەرسۆنی پارێزەر کە پیاوێکی دیار بوو. هاتبوو بە یەکجاری لەو گوندە نیشتەجێ بێ. پاش ئەوانیش جوانترین کچی دێ هات، کە ریزێك کیژی جوان و ڕێکپۆشی بەدواوە بوون. پاش ئەوان نووسەرە گەنجەکان هاتن، کە لە شاریڕا پێکەوە هاتبوون و بەسەرسامییەوە دایانڕوانییە کچەکان.. لە دوای هەمووانیش ویلی مەفرسۆن، کوڕی نموونەیی گوندەکە هات، کە زۆر بایەخی بە دایکی دەدا و وەك شووشە تەماشای دەکرد.. نەریتی وابوو لەگەڵ دایکی دەهاتە کلێسا، بۆیە هەموو دایکەکان شانازییان پێوە دەکرد، بەڵام لەهەمان کات هەموو کوڕەکان دەیانبوغزاند، چونکە کوڕێکی باش بوو، زۆرجاریش ئەوانیان پێ دەشکاندەوە، تەنیا لە رووی رەوشتەوە نا، بەڵکو لە رووی ڕێکوپێکیش.. هەمیشە دەستەسڕە سپییەکەی بە بەرکیدا شۆڕدەبۆوە.. تۆم دەستەسڕی نەبوو، بۆیە لای وابوو ئەو کوڕانەی

دەستەسرپیان هەیە لووت بەرز و بەفیزن، کە ریزی نوێژخوێنان دابەسترا، دووبارە ئاژێڕەکە جارێکی دیکە لێیداوە، تا ئەوانە ئاگەدارکاتەوە کە دواکەوتوون یاخۆ خۆیان خۆیان دواخستووە. پاشان بێدەنگییەك هەموو هۆڵەکەی داگرت، لە پستە پستی شەماشەکان زیاتر هیچی دی نەبوو، ئەوانیش هەموو دەمێ، تەنانەت لەکاتی نوێژیشدا ئاوابوون. جارێك شەماشەیەکم دی وانەبوو، بەلاّم لە بیرم نەماوە لەکوێ. چەندین ساڵ پێش ئێستا بوو. شتێکی وام لەم بارەیەوە بەبیر نایە. بەلاّم دەزانم لە ولاّتێکی بێگانەدا بوو.

سروودخوێنەکە بە دەنگێکی نەرم، کە هەموو دانیشتوانی ئەم بەشەی گوند پێیان خۆش بوو، دەستی بە خوێندن کرد. بەدەنگێکی هێمن و لەسەرەخۆ دەستی پێکرد. پاشان تا ئاستێك دەنگی بەرزکردەوە و دیسان نزمی کردەوە، کە دەیگوت:

دەبێ ڕۆژێك لەنێو گولاّن بۆ ئاسمانانم بەرزکەن

لەو دەمانەی کە خەڵکی دی لە دەریای خوێن مەلە دەکەن

بە سروودبێژێکی زۆرباش دادەنرا، بۆیە هەردەم بۆ کۆبوونەوەکانی کلێسا بانگدەکرا، تا چامان بخوێنێتەوە. کە تەواویش دەبوو، خانمان لەڕانی خۆیان دەدا، یاخۆ بەدەستان چاوی خۆیان دەگرت و سەریان دەلەقاند، وەك بلێن: "ناکرێ بە وشە بلێین دەنگێکی چەند خۆش و کاریگەرە، لەچاو ئەم دنیا فانییە زۆر خۆشە". دوای تەواوبوونی سروودەکە، (سپراگ)ی قەشە بوو بە پەخشی هەواڵەکان. دەستی بە خوێندنەوەی کۆبوونەوەکان و ناوی بەشداربووان کرد. وا پێدەچوو ئەو لیستە تا قیامەت کۆتایی نەیەت. سەیرکە تا ئێستاش کە ڕۆژنامە زۆر بوون ئەو نەریتە تەنانەت لە شارەکانیشدا هەر ماوە. وا پێدەچێ هەر دابونەریتێکی کۆن، تا بێ سوود بێ، وازلێهێنانی زەحمەتتر دەبێ.

قەشە دەستی بە نوێژکرد. بەگەرمی دەپاڕاوە، زۆری پێنەچوو چووە ناو وردەکاری و نزای بۆ کلێسا و کوڕانی و بۆ کلێسای گوندەکانی دیکە و بۆ خودی گوندەکان و بۆ هەرێمەکە و بۆ ولاّتەکە و بۆ فەرمانبەرانی و بۆ هەموو ولاّتە یەکگرتووەکان کرد. لەگەڵ هەموو کلێساکانی ولاّتە یەکگرتووەکان و کۆنگرێس و سەرۆکی ولاّتە یەکگرتووەکان و ئەفسەرەکانی حکوومەت و پاشان بۆ دەریاوانە هەژارەکان، کە لە دەریاکاندا زەحمەتکێشن و بۆ ملیۆنان خەڵکی چەوساوەی ژێر دەسەلاّتی پاشاکانی ئەورووپا و ستەمکارەکانی ڕۆژهەلاّت، هەروەها پاڕاوە کە ئەوانی رووناکی و بژێوی پێبەخشیون، بەلاّم بەخۆیان نابینن و نابیستن ڕێنوێنیان بکات. دوعای بۆ بتپەرستەکانی نێو دوورگە دوورە دەستەکانیش کرد، پاشان لە خوا پاڕاوە قسەکانی

لای گوێگران قبووڵ بکرێن و وەك خۆشەویستیی تۆو بەخاکێکی پاکەوە بکا. تا لەکاتێکی بەروبوومێکی بەسوودی لێبکەوێتەوە.. ئامین.

نوێژخوێنان دانیشتنەوە، هەرچی ئەو کوڕە بوو، کە پاڵەوانی ئەم چیرۆکەیە، هیچ چێژی وەرنەگرت و بەخورتی خۆی ڕاگرتبوو، تا کۆتایی نەجووڵا. بەڵام گوێی نەدا وردەکارییەکان، سەیر نەبوو.. چونکە پێشتر لەمێژ بوو هەمووی دەزانی. کەچی ئەگەر قەشە باسی شتێکی تازەی دەکرد، تەواو گوێی دەدایە، گوێی بۆ شتی تازە زۆر هەستیار بوو... هەرچەند لەخۆڕا ڕکیشی لێ دەبۆوە، چونکە پێی وابوو هەموو کارێکی تازە دادوەری تێدا نییە.. لە ناوەڕاستی نوێژەکە مێشێك لەسەر کورسییەکەی بەردەمی نیشتەوە، ڕۆحی ئازاری دەدیت، کە مێشەکە هێدی هێدی باڵەکانی لێکدەخشاند، زۆری نەبرد باڵەکانی خستە سەرسەری و بەهێز دەیشێلا، تۆم وای هەستدەکرد هەنووکە نا هەنووکە سەرکی هەڵدەقنێ.. پاشان باڵەکانی بە قاچەکانی پشتەوەی دەشێلا، زۆر لەسەرەخۆ خەریکی خۆ ئارایشکردن بوو، وەك بڵێی دڵنیا بوو کە لەخەم و شتێکی خراپ دوورە.. بە ڕاستیش لە ئارامییەکی تەواودا بوو. هەرچەندە تۆم زۆری حەزدەکرد بیپلیشێنێتەوە، بەڵام نەدەوێرا، وایدەزانی ئەگەر لەکاتی نوێژدا ئەو گوناهە بکا، یەکسەر گیانی دەردەچێ، هەرکە قەشە کۆتایی بە نوێژەکە هێنا، تۆم ناولەپی نوشتاندەوە و زۆر ئاگایانە بەرەو پێشی جووڵاند، کە قەشە گوتی ئامین، یەکسەر مێشەکەی دیلکرد..! بەڵام پوورە پۆلی ئاگای لێبوو، وایلێکرد مێشەکە بەرەڵاکا.

قەشەکە دەستی بە خوێندنەوەی ئینجیل کرد و بەدەنگێکی قووڵی جاڕسکەر ڕاڤەی کرد. خەڵکێکی زۆر سەریان کەوتە لەقە و خەوەنووچکە دەیبردنەوە، تۆم ئەو لاپەڕانەی دەژمارد کە قەشە خوێندبوونییەوە، هەموو دەمێ دەیتوانی ژمارەی ئەو لاپەڕانە بزانێ، کە قەشە لە نوێژی یەکشەمان دەیخوێندنەوە، بەڵام هەرگیز هیچی لە ناوەرۆکی ئەو لاپەڕانە لەبیر نەدەما، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو ڕۆژە هەندێك بایەخی کەوتە سەر وتەکانی قەشە، چونکە لە وتارەکەیدا باسی لەوە دەکرد چۆن هەموو دوژمنان لە ڕۆژی دواییدا کۆدەبنەوە و مەڕ و گورگ پێکەوە ئاوێ دەخۆنەوە و منداڵێکی بچووك لێیاندەخورێ..! تۆم بەباشی تێنەدەگەیشت، بەڵام گرژییەوە و خۆزگەی خواست ئەو منداڵ بێ. کە قەشە دەستی بە قسە وشکەکانی کردەوە، تۆم دیسان بێزاربۆوە، بەڵام قالۆچەیەکی ڕەشی زلی دۆزییەوە، یەکەمجار قالۆچەکە بەسەر پەنجەیدا ڕەتبوو، تەزی بە جەستەیدا هات.. دواتر قالۆچەکە خۆی بەملاوئەولای ڕێڕەوی کڵێساکە دادەدا، لەسەر پشت کەوتبووە سەر زەوی و بێهوودە لاقی دەکوتا و هەوڵی دەدا هاوسەنگ

بێتەوە تۆم بە رقەوە تەماشای دەکرد، چونکە دەیویست پانیکاتەوە، بەڵام لێی دووربوو. زۆر لە نوێژخوێنەکانی دیکەش کە لە زۆربێژی قەشەکە بێزارببوون، خۆیان بەو قالۆچەیە خافلاندبوو. لەو ساتەدا سەگێکی بەرەڵا هاتەژوور، زۆر دڵتەنگ دیار بوو، لەبەر گەرمای هاوین تووشی تەمبەڵی هاتبوو، ماندوو بوو چونکە ژیان لەسەر یەك رۆتین بەرێوە دەچوو.. زۆری حەز لە گۆڕانکاریی بوو. چاوی بە قالۆچەکە کەوت، کلکی خۆی بەرزکردەوە و بایدا و لە قالۆچەکە ڕاما، بەدەوریدا سووڕاوە و لە دووررا بۆنی کرد. خولێکی دیکەی بە دەوریدا خوارد. دەتگوت خۆی ئازا دەکا تا لێی نێزیککەوتەوە، دیسان بۆنی کرد و لچی هەڵماڵی و تێی رووبوو، بەڵام نەیپێکا، دووبارە و سێبارە هەوڵیدا. دەتگوت بەو یارییە دڵخۆشە، زۆری نەبرد شەویلاگەکانی بەسەر قالۆچەکەدا لێکدا، بە زۆر شێوە تاقیکردەوە، بەڵام لە کۆتایی لێی بێزاربوو، بەجێیهێشت و تەمای وابوو لەبیریکا. سەری دەستی بەلەرزین کرد، پێدەچوو خەوی بێ، پاش دەمێك.. چەناگەی لێکدەترازا و هێدی هێدی بەردەبۆوە. تا کەوتە سەر قالۆچەی دوژمنی و ئەویش لچکێکی گەست. سەگەکە لەتاوان زۆر توند وەڕی و تا توانی سەری راوەشاند، قالۆچەکە لە دووری دووگەز ئەولاتر بەربۆوە سەر زەوی و دیسان کەوتە سەر پشت، هەرچی ئەو دیمەنەی دی پێکەنی، رووی زۆر لە نوێژخوێنان لەپشت دەسماڵ و باوەشێنان بزربوو. تۆمیش هەستی بە ئاسوودەییەکی زۆر کرد، سەگەکە لە گێلان دەچوو، رەنگە بەخۆشی زانیبی وایە، بەڵام رقی هەڵگرتبوو و حەزیشی لە تۆڵە بوو، بۆیە لە قالۆچەکە نێزیککەوتەوە و هێرشێکی دیکەی بۆ برد و لە هەموو لایەکەوە بۆی دەچوو، هەرجارەی هەردوو لەپی خۆی قولانجێك لێ دەبردە پێش و هەوڵی دەدا ددانی لێگیرکا، هێندەی خۆ ماندووکردبوو زۆری نەبرد جارێکی دی هەستی بەشەکەتی کردەوە، بۆیە ویستی بە ڕاوەمێش خۆی بخافڵێنێ، بەڵام ئەوەش زۆر بێتام بوو، کەوتە دوای مێرووێك کە بەسەر زەویدا دەڕۆیشت. لووتی تەواو لێ نێزیك کردبۆوە، بەڵام زوو لەوەش بێزار بوو، هەڵقونجا و هەناسەیەکی هەڵکێشا.. تەواو قالۆچەکەشی لەبیرچوو بوو، بێئاگا لەسەری دانیشت. چی پێنەچوو بە حەپە حەپ بۆی دەرچوو. قالۆچەکەش بە رێڕەوی کلێساکەدا فڕی. سەگەکەش تا لەدەرگەی کلێسا چووە دەرێ هەر غاریدا. قالۆچەکەش و... ئەویش نەیکردە نامەردی تا دەستی تێدابوو لە پەنجەرەی هەڵدا دەرێ. دیسان نوێژخوێنان ئارامبوونەوە، رەنگ و روویان تێکچووبوو هێندەی هەوڵدەن پێکەنینیان قووتدەنەوە، قەشە دەمێك بێدەنگ بوو، دواتر تێهەڵچووەوە، بەڵام حەماسەتی

جارانی نەبوو. هەستیشی کرد ناچارە دەبێ خێراتر دروشمە ئاینییەکان راپەڕێنێ. کە تەواو بوو هەموو هەناسەی حەسانەوەیان هەڵکێشا.

تۆم سۆیەر بە دڵێکی خۆشەوە گەڕایەوە ماڵ. ئیتر پێی وابوو چوون بۆ نوێژی یەکشەمان زیانێکی نییە، بەمەرجێ شتێکی تازەی تێدابێ. تەنها یەك شتی هەر لە خەیاڵدا مابوو، حەزی دەکرد سەگەکە یاری قالۆچەکەی کردبا، بەڵام پێی وانەبوو کارێکی راستە هەموو جارێ قالۆچەکە لەگەڵ خۆی ببات.

# پاژی شەشەم

بەیانی دووشەمێ تۆم گەلێ دڵتەنگ بوو، هەموو دووشەمانیش وایلێدەهات، چونکە سەرەتای هەفتەیەك ئەشکەنجەی لەسەرەخۆی قوتابخانە بوو. هەموو جارێ لەو رۆژەدا هیوای دەخواست کە پشووی نەبووایە، چونکە وایدەزانی دەگەڕێتەوە دیلی و تووشی کۆت و پێوەندی قورستر دەبێ.

تۆم لەناو نوێن راکشابوو، بیری دەکردەوە، زۆری نەبرد وای بۆ دەرکەوت، کە خۆزگە دەخوازێ نەخۆش با تا بیتوانیبا نەچووبا قوتابخانە و لە ماڵێ بمایاوە. بیرۆکەکەی پێ باش بوو.. هەموو ئەندامەکانی جەستەی خۆی بەسەرکردەوە، چ جێی نەدەهێشان. دیسان هەمووی پشکنی. ئەوجارە پێی وابوو نیشانەکانی ژانە زگ لەخۆی بدۆزێتەوە، زۆر خۆی گوشی، بەڵام بەرەبەرە ئەو نیشانانە لاواز بوون و پاشان بەتەواوی نەمان. دیسان بیری کردەوە، لەناکاو شتێکی دۆزییەوە، ددانێکی سەرەوەی دەلەقی، وایدانا ئەوە زۆر ترسناکە. ویستی دەست بە هاوار هاوار بکات. بەڵام بەبیری هاتەوە کە رەنگە پووری ئەو ددانەی لەبنەوەڕا هەڵکێشێ، دیارە ئەوەش زۆری دەیەشێ. بۆیە بڕیاریدا لەو دەمەی ددانەکەی لەبیرکا و بەدوای شتێکی دیکەدا بگەڕێ، بەڵام هیچ نەخۆشییەکی نەدۆزییەوە. بەبیری هاتەوە کە باسی شتێکی لە دکتۆرێك بیستووە، کە دوو سێ هەفتە مرۆڤ لەناو جێ دەیەخێ و رەنگە پەنجەیەکیشی ببڕنەوە. پێی هەڵماڵی و لە ئەنگوستە کێماوییەکەی ڕووانی. هەرچەندە نەیدەزانی نیشانەکانی ئەو نەخۆشییە چین، بەڵام بڕیاریدا تاقی بکاتەوە، بۆیە لەناو جێ راکشا و بە دەنگێکی بەرز دەستی بە ناڵەناڵ کرد.

بەڵام سید وا نووستبوو هەر ئاگای لەخۆی بڕابوو..

تۆم بەرزتر هاواری کرد، لای وابوو بەراستی پەنجەکەی پێی ژان دەکا..

سید هەر نەجووڵا.

تۆم هێندەی هاوارکرد، هێنکەی لەبەر بڕابوو، کەمێك حەساوە، پاشان توندتر دەستی بە ناڵەناڵ کردەوە.

سید هەر پرخە پرخی بوو.

تۆم زۆر بێزاربوو، بانگی (سید)ی کرد و ڕایهەژاند، ناڵەناڵی دەستپێکردەوە، سید باوێشکی هاتێ و خۆی لێك راکێشا، بە هەنیشکان هەستاوە و لە جێوە هەڵقونجا، تەماشای تۆمی کرد و ئەویش هەر دەناڵێ. سید گوتی:

- تۆم .. تۆم چیتە تۆم؟

- وەڵام نەبوو.

- سید تێهەڵچووەوە.

- تۆم.. تۆم..! پێم بڵێ کوێت ژان دەکا..؟ بە توندی رایهەژاند و تەماشای دەموچاوی کرد.. تۆم بە ناڵەوە گوتی:

- ئای.. نا.. سید رامەهەژێنە..

- بۆچی تۆم.. چ ڕوویداوە.. با بانگی پوورم کەم.

- نا.. گوێ مەدێ..! ڕەنگە باشتر بم.. کەس بانگ مەکە.

- بەڵام دەبێ بانگی کەم! وا مەناڵێنە، من سووم دەبتەوە.. لەکەیەوە وای؟

- چەند سەعاتێکە.. ئۆف..! سید وا مەجولێنە.. تۆ دەمکوژی..

- تۆم بۆ زووتر وەئاگات نەهێنام؟! ئای..تۆم.. مەناڵێنە، هەرچەند گوێم لە ناڵینی تۆ دەبێ جەستەم دەتەزێ.. چیتە تۆم؟

- سید من بەتەواوی لێت دەبوورم.. کە مردم لە هەموو ئەو شتانە خۆش دەبم، کە بەرامبەر بە من کردووتە..!

- وەیش تۆم.. تۆ نامری.. وا نییە؟! نا.. تۆم..ئای.. ڕەنگە..

- ئاخ.. سید.. من لە هەموو کەسێك دەبوورم.. سید وایان پێ بڵێ. تکام وایە پەروازی جامەکە و پشیلە یەکچاوەکەم بدەیە ئەو کچەی تازە هاتۆتە شارۆچکەکەمان، پێشی بڵێ..

بەڵام سید خۆی لەنێو نوێنەکە هەڵدابووە دەرێ و جلەکانی لەبەرکردبوو، ڕۆیشتبوو. تۆم بەڕاستی لە ئازاردابوو، خەیاڵ وای لێکردبوو، بەڕاستی خۆی بە نەخۆش بزانێ. ناڵەناڵی بەڕاستی دەچوو.

سید لە پەیژەکە چووە خوار و گوتی:

- پووره پۆلی وەره.. وا تۆم دەمرێ..!
- دەمرێ..؟!
- بەڵێ پووری، دوا مەکەوە، زوو وەره!
- قسەی قۆڕ، باوەڕت پێ ناکەم.
کەچی بەغار سەرکەوتە نهۆمی دووەم و سید و ماریش بەدوایەوە بوون.. کە گەیشتە بەردەم نوێنی تۆم هەناسەیەکیدا و گوتی:
- تۆم ئەوە چیتە؟!
- ئای پووری.. من..
- ئەوە چیتە.. چیت لێ قەوماوە کوڕەکەم؟
- ئای پووری، وا بزانم پەنجە کێماوییەکەم مردووه!
- پیرەژن لەسەر کورسییەك دانیشت و لە قاقای پێکەنینی دا، ئەوجا دەمێ گریا، پاشان گریان و پێکەنینی تێکەڵ بوو، ئەمەش هێنایەوه سەر عەیار و گوتی:
- تۆم.. زراوت بردم.. ئێستاش چیدی هوڕێنان مەکە و هەستە.
نووزە و ناڵە ناڵ نەمان و ژانەکە بزربوو، تۆم کەمێك خۆی گێل پیشاندا و گوتی:
- وای پووری..وامزانی مردووه ئەوەندە دێشێ بەرگەی ناگرم.. تەنانەت ژانی ددانمی لەبیر بردمەوه.
- ددانت..! بۆ ددانت چی بەسەر هاتووه..!؟
تۆم دەستی بەناڵین کردەوه.
- بەسە.. چیدی مەنووزێوه.. دەمت بکەوه.. باشە ئەو ددانەت دەلەقێ، بەڵام پێی نامری.. ماری بڕۆ دەزووێکی ئاوریشمم بۆ بێنە لەگەڵ پارچە پەنگرێك لە ناندینەوه.. تۆم گوتی:
- تکایە پووری هەڵی مەکێشە، ئێستا ژان ناکا.. توخوا پووری.. حەز ناکەم لە ماڵێ بمێنمەوه و لە قوتابخانە دواکەوم.
- نا.. بە ڕاست؟ کەواتە ئەو هەموو فرتوفێڵەت بۆ ئەوەبوو واتدەزانی دەتوانی لە ماڵێ بمێنییەوه و نەچییە قوتابخانە و بۆ ڕاوەماسی بچی؟ تۆم.. تۆم من تۆم زۆر خۆشدەوێ، بەڵام وا پێدەچێ تۆ هەموو هەوڵێك دەدەی تا بە کارە قەڵپەکانت ئەو دڵە پیرەم بشکێنی.. لەو دەمانە کەرەستەی ددان کێشانی ئامادە بوو، پیرەژن سەرێکی داوە ئاوریشمەکەی لە ددانەکەی تۆم

گرێدا و سەرەکەی دیکەشی بە پێچکەی چارپایەکەوە بەست، لەناکاو پەنگرەکەی لە رووی تۆم نێزیککردەوە، هێندەی نەمابوو پێی بکەوێ.. یەکسەر ددانەکە بە پێچکەی چارپاکەوە تەکەتەکی بوو.

هەر ناخۆشییەك سوودی خۆی هەیە. کە تۆم بەرچایی خوارد و بەرەو قوتابخانە بەڕێکەوت. بووە جێگەی ئیرەیی هەموو کوڕەکان، چونکە ئەو بۆشاییەی لە شوێنی ددانەکەی دروست ببوو، وای لێکردبوو بتوانێ بە شێوازێکی زۆر سەیر تف هەڵدا..! هەموو ئەو منداڵانەی لەخۆی خڕکردەوە، کە ئەو دیمەنە سەرنجی راکێشابوون. لەو منداڵەش دوورکەوتنەوە کە پەنجەی خۆی بڕی بوو و پێشتر دەوریان دابوو. ئەویش کە کەسی لە دەوروبەر نەما دڵتەنگ بوو و گوتی: تف هەڵدان وەکو تۆم سۆیەر هیچ نییە، بەڵام منداڵێکی دیکە گوتی: ترشە و دەمت ناگاتێ. بۆیە وەك پاڵەوانێکی تێکشکا و رۆیی.

پاش دەمێك تۆم چاوی بە هەکلبێری فین کەوت، کە کوڕی سەرخۆشی گوندەکە بوو.. دایکان هەموو رقیان لە هەکلبێری بوو، چونکە بێکار و تەمبەڵ بوو، لاسار و چەقاوەسوو بوو، بێ رەوشت و بێ جێ بوو، هەروەها لەبەرئەوەی هەموو منداڵەکان پێی سەرسامبوون و خواخوایان بوو لەگەڵی ببنە هاوەڵ، کە ئەمەشیان لێ حەرام بوو، زۆریش حەزیان دەکرد بوێرن وەك ئەو وابن..!

تۆمیش وەك کوڕە بەڕێزەکانی دیکە وابوو، ئیرەیی بە بەرەڵاییەکەی  هەکلبێری دەبرد، بەڵام بە توندی فەرمانی پێدرابوو یاری لەگەڵدا نەکا. بۆیە هەر بۆی هەڵکەوتبا گەمەی لەگەڵ دەکرد. هەکلبێری هەموو دەم جلوبەرگی فشوفۆڵی پیاوانی لەبەر دەکرد، کە سەرەڕای ئەوەی زۆر بۆی بەرین بوو، هەمووشی پینەوپەڕۆ بوو، کڵاوەکەشی هێندەی نەمابوو بگاتە گۆزینگی پێی. پانتۆڵەکەی بێ پشتێن بوو، تەنیا یەك لای شەییالەکەی بە ملیدا هەڵیواسیبوو، بۆیە بنکی پانتۆڵەکەی تا ناوەڕاستی رانی هاتبووە خوار و قاچەکانیشی لەبەر درێژی زبڵوزاریان دەماڵی..!

هەکلبێری کوێی حەز لێبا دەچوو، ئەگەر رۆژ خۆشبا لەسەر کۆسپەی بەردەرگەی ماڵان دەنووست، ئەگەر بارانیش با لەنێو بەرمیلی بەتاڵ.. ناچار نەبوو بچێتە قوتابخانە یاخۆ کڵێسا یان بە کەسێك بڵێ گەورەم یاخوود گوێڕایەڵی یەکێ بکا. کەنگێ حەزی لێبا دەیتوانی بچێتە مەلە و راوەماسی. چەندیشی ئارەزوو لێبا کاتی لێ بەسەردەبرد. کەس نەبوو بوێرێ بۆ شەڕ ملی لەبەر ملی بنێ. شەوانیش تا هەرکاتێکی بیویستبا دەمایەوە.. یەکەم کوڕ بوو لە

بەهاران بە پێخواسی دەڕۆیشت و دواهەمینیش بوو، کە پایزان پێلاوی لەپێ دەکرد. نەهەرگیز خۆی شووشتبوو، نەقەت جلوبەرگی پاکژی لەبەرکردبوو. لە جنێودان وەستا بوو. واتە هەرچی لە ژیاندا خۆشی بوو، ئەو کوڕە هەیبوو. یاخۆ کوڕانی سانت پیتەرسپۆرگ وای تێدەگەیشتن..!

تۆم ئەو بەرەلاّیەی بانگکرد:

- هەکلبێری سلاّو!

- بەخۆت سلاّو، چۆنی؟

- ئەوە چییە پێت؟

- پشیلەیەکی تۆپیوە.

- کا با تەماشایکەم هاك.. وەی خوایە..! خۆ تەواو رەقبۆتەوە.. ئەوە لە کوێت پەیداکردووە؟

- لە کوڕێکم کڕیوە.

- چیت پێداوە؟

- کارتێکی شین و میزلّدانێك کە لە قەسابخانە دەستم کەوتبوو!

- ئەی لە کویّ کارتە شینەکەت دەست کەوتبوو؟

- دوو هەفتە پێشتر بە ڕینگێکی ئاسن لە بێن رۆجەرزم کڕی.

هاك پێم بلّیّ.. پشیلەی تۆپیو سوودی چییە؟

- سوودی..؟ بالووکە چادەکاتەوە..!

- بەڕاست؟ من شتێکی لەمەش باشتر دەزانم.

- مەرجت لەگەلّ دەکەم لەمە باشتر نییە.. بەلاّم شتەکە چییە؟

- بۆ..، ئاوی پاشماوەی باران

- ئاوی بارانیّ هەر هیچ..

- بۆ..؟ چ جارت تاقیکردۆتەوە..؟

- نا.. من نا.. بەلاّم بۆب تانەر جەڕباندوویە.

- کیّ پێی گوتی؟

- بۆ! ئەو بە جێف تاچەری گوت و جێف بە جۆنی بەیکەری گوت و جۆنی بە هۆلیسی گوت و جیم بە بێن رۆجەرزی گوت و بێن بە منداڵە قولێکی گوت و قولەکەش بەمنی گوت.. بەمجۆرە..

- ئەوجە ئەوە چییە..؟ ئەوانە هەموو درۆ دەکەن، هەموویان قولەکە نەبێ، چونکە من قولەکە نایناسم، بەلاّم هیچ قولێکیشم نەدیوە درۆ نەکات. هاك ئێستا پێم بڵێ بۆب تانەر چۆن توانیویە وابکا.

- بۆ، دەستی لەنێو قەدە دارێکی رزیو هەڵێناوە کە ئاوی بارانی تیاکۆبۆتەوە.

- بە رۆژ؟!

- بەدڵنیاییەوە.

- رووشی لە قەدە دارەکە بوو؟

- بەڵێ.. من پێم وایە.

- هیچی گوتبوو؟

- لام وانییە چی گوتبێ.. نازانم.

- ئاوها..! چەند هەڵەیە تۆ بەمجۆرە گێلانەیە باس لە بێسوودی ئاوی بارانێ دەکەی بۆ بالووکە لابردنێ! بەمجۆرە هیچ سوودێکی نابێ. دەبێ خۆت بە تەنیا بچییە ناو جەرگەی دارستان، بۆ شوێنێك کە قەدە دارێکی لێبێ پڕ پاشماوەی ئاوی باران، جا لەگەڵ نیوەشەوێ، دەبێ پشتت بە قەدەکە بدەی و دەستەکانت لە ئاوەکەی هەڵهێنی و بڵێی:

- دەنکە جۆ.. دەنکە جۆ.. نان و دۆ.. قیچکە ئاوی ناو کۆلێ.. بالووکەم کەوە لەکۆڵێ. جا خێرا بەچاوی داخراو یازدە هەنگاوان دوورکەوییەوە، ئەوجا سێ جاران بەدەوری خۆت خول بخۆی و یەکسەر بۆ ماڵێ بگەڕێیەوە بێ ئەوەی کەسێك بدوێنی. ئەگەر قسەت لەگەڵ کەس کرد سیحرەکە بەتاڵ دەبێ.

- باشە، ئەمە پێدەچی ڕێیەکی باش بێ، بەلاّم بۆب تانەر واینەکردبوو.

- نا، بەڕێز، دەتوانی مەرج بکەی واینەکردووە، چونکە لە هەموو منداڵانی خراترە و هەموو جەستەی بالووکەیە. خۆ ئەگەر بیزانیبا چۆن پاشماوە ئاوی بارانێ بەکاربێنێ.. قانێکی نەدەهێشت.. من بۆ خۆم زۆر یاری بە بۆقان دەکەم، بۆیە زۆر بالووکەم لێدێ و هەندێ جاریش بە دەنکە پاقلەیەك چارەی دەکەم.

- بەڵێ پاقلە باشە، من تاقیمکردۆتەوە.

- بە راست؟ بە چ ڕێگەیەك؟

- دەنکە پاقلەکە شەق دەکەی، پاشان بالووکەکە دەبڕی تا کەمێك خوێنی لێدێ. پاشان لایەکی پاقلەکە بەخوێن دەکەی. ئەوجا لەکاتی نیوەشەودا قۆرتێك لە چوارڕیانێك هەڵدەکەنی،

دەبێ تاریکە شەویش بێ. لەتە پاقلەکەت دەشارییەوە و ئەوی دەشمێنێتەوە دەیسوتێنی. دەبینی لەتە پاقلە بەخوێنەکە دەگەڕێ و دەگەڕێ تا بەشەکەی دیکەی بدۆزییتەوە. هەتا ئەو بگەڕێ خوێنەکە یارمەتیی لابردنی بالووکەکە دەدات تا هەڵدەوەرێ.

- بەڵێ.. هاك، دەق وایە. چاکتریشە کە لەتە پاقلەکە دەشارییەوە بڵێی: پاقلە بڕزە لە خۆڵێ، بالووکە هەڵوەرێ، چیدی بێزارم مەکە. جۆ هارپەریش وا دەکا، زۆرینەی بالووکەکانی خۆی بەم شێوەیە وەراندووە، بەڵام پێم بڵێ: تۆ چۆن بە پشیلەی تۆپیو بالووکە چارەسەر دەکەی؟

- ئەوە دەبێ پشیلە تۆپیوەکە هەڵگری و دەوروبەری نیوەشەو بچیتە نا گۆڕستانێك، بەو مەرجەی رۆژی پێشتر پیاوێکی خراپ لەوێ شاردرابێتەوە، لە نیوەشەودا شەیتانێك یاخۆ دوو یان سێ دێن، بەڵام تۆ ناتوانی بیانبینی، بەڵام رەنگە شتێکی وەك دەنگی با ببیستی، یاخوود گوێت لە دەنگیان بێ کە پێکەوە قسان دەکەن، لەو کاتەی دەیانەوێ بڕۆن و جەستەی ئەو پیاوە خراپە ببەن، تۆ دەبێ پشیلە تۆپیوەکەیان بەدوادا باوێی و بڵێی: "ئەی شەیتان بەدوای تەرمەکەدا بڕۆ، ئەی پشیلە تۆش بەدوای شەیتان بکەوە، بالووکە تۆش بەدوای پشیلەدا بچۆ، چونکە من پێویستم بە تۆ نییە" ئەمە هەرچی بالووکەیە لەناوی دەبا.

- پێدەچێ راست بێ.. هاك تۆ چ جار تاقیتکردۆتەوە؟

- نا.. بەڵام هۆپکینزی پیرەداك پێی گوتووم.

- باشە.. من پێم وایە وابێ، چونکە گوێم لێبووە، دەڵێن ئەو پیرەژنە جادووگەرە.

- بۆ تۆم، منیش دەزانم وایە، جادووی لە باوکیشم کردووە، بابم بەخۆی وایگوت، جارێك دەگەڕاوە ماڵێ دیتی وا خەریکە جادووی لێدەکا، ئەویش بەردەکی تێگرت، ئەگەر پیرەژن خۆی لانەدابا بەریدەکەوت، هەر چۆنێك بێ، بابم لەو شەوە خراپی بەسەرهات، کەوتە ناو تەویلەیەك و بەسەرخۆشی تێیدا راکشا و قۆڵێکیشی شکا.

- ئەمە زۆر ترسناکە.. باشە چۆنی زانی جادووی لێدەکا؟

- بابم زۆر باش ئەو شتانە تێدەگا، دەڵێ: ئەگەر جادووگەر زۆر تەماشای کردی، ئەوە جادووت لێدەکا، بەتایبەتیش ئەگەر لەبەرخۆی پرتەوبۆڵەی کرد. ئەو بۆڵە بۆڵەی دوعایەکی پێچەوانەیە..

- هاك پێم بڵێ.. کەی پشیلە تۆپیوەکەت تاقیدەکەیەوە؟

- ئەمشۆ، لام وایە شەیتانەکان ئەمشۆ دێنە دوای هۆس ویلیامز.

- بەڵام شەمووی ئەویان شاردۆتەوە، ئەدی شەیتانەکان شەوەکەی نەیانبردووە.

- تۆم تۆ بۆ ئەوەندە ساویلکەی، چۆن تەلیسمەکانیان تا نیوەشەو کاردەکا؟ ئەدی شەوی یەکشەمیش نەبوو، وا بزانم شەیتانەکان ناتوانن یەکشەمان کاربکەن.

- من بیرم لەوە نەکردبۆوە.. لێدەگەڕێی لەگەڵت بێم؟

- ئەگەر ناترسی.. بۆ نا.!

- ترسان! ئەوە هەر زۆر دوورە.. شەوێ بۆم دەمیاوێنی؟

- بەڵێ، ئەگەر دەرفەتت بوو تۆش بۆم بمیاوێنەوە. دواجار لێگەڕای ئەوەندە بمیاوێنم تا هایزی پیرەمێرد دامیە بەربەردان و دەیگوت: نەفرەت لەو پشیلە. ناچاربووم بەردێکی لە پەنجەرەوە تێگرم.. بەڵام بەکەس نەڵێی.

- واناکەم.. ئەو جاری بۆیە نەمتوانی بمیاوێنم، چونکە پوورم تەماشای دەکردم، بەڵام ئەمجارە دەمیاوێنم... ئەدی ئەوە چییە؟

- ئەوە قرنەیە..

- لە کوێت بوو؟

- لە دارستانێم هێنا.

- بە چی دەگۆڕییەوە؟

- نازانم.. بەڵام دەمەوێ بیفرۆشم..

- باشە.. هەر چۆنێك بێ ئەوە مێروویێکی بچووکە..!

- بەڵێ.. هەرکێ بیەوێ چەندی حەزکا لەو مێروانەی دەستدەکەوێ. من بەمە رازیم و ئەوەم بەسە.

- هەر چۆنێك بێ.. قرنە زۆرە. ئەگەر بمەوێ دەتوانم هەزار بگرم.

- باشە ئەدی بۆ نایکەی؟ تۆ دەزانی ئێستا قرنە نییە، چونکە هێشتا وەرزی دانەهاتووە. ئەمە یەکەم قرنەیە ئەمساڵ بیبینم.

- دەی هاك من ددانەکەی خۆمت لەباتی ئەمە دەدەمێ.

- با تەماشایکەم.

تۆم پارچە کاغەزێکی لوولدراوی دەرێنا و بەزانایی لێکی کردەوە.

هاك بەسەرسامییەوە لە ددانەکەی روانی، زۆری حەز چوێ.پاشان گوتی:

- ئەوە بەراستییە؟

- تۆم لچی هەڵماڵی و جێیە بۆشەکەی نیشاندا..

هەکلبێری گوتی:

- باشە، من رازیم.. بابیگۆڕینەوە.

- تۆم قڕنەکەی خستە نا قۆدییەك، کە کوڕەکان لێك جیابوونەوە، هەر یەکە وایدەزانی ئێستا لەپێشتر دەوڵەمەندترە.

کە تۆم گەیشتە قوتابخانە بچووك و دوورەدەستەکە، خێرا هەنگاوی دەهاوێشت، وەك کەسێکی دەسپاك کە نایەوێ هیچی لەدەست بچێ و لەکاتی خۆی بگاتە مەبەستە دیاریکراوەکەی کلاۆەکەی بەسینگەکەوە هەڵواسی و وەك بزنسمان چالاکانە لەسەر کورسییەکەی دانیشت. لەو کاتەش مامۆستاکەی کە کەوتبووە ناو کورسییەکی پانوپۆڕی قۆڵدار، وەنەوزی دەدا و منگەمنگی خوێندنی لێ ببووە لایلایە. بەلاّم هەرای هاتنەژووری تۆم وەئاگای هێنا، هاواریکرد:

- تۆماس سۆیەر

تۆم دەیزانی هەرکە ناوی بەتەواوی بانگ بکرێ مانای گیروگرفتە.

- بەڵێ گەورەم

- وەرە ئێرە، ئێستا فەرموو پێم بڵێ بۆ دیسان وەك راهاتووی دواکەوتی؟

تۆم بەتەمابوو درۆیەك بکاتە بیانووی دواکەوتنەکەی، بەلاّم کە جووتە کەزییەکی درێژی زێڕینی بینی بەسەر شانی کیژۆڵەیەکدا شۆڕببوونەوە و خاوەنەکەی ناسییەوە و کورسییەکی چۆڵی لەپاڵ ئەو کیژۆڵە بەدیکرد. رای خۆی گۆڕی و یەکڕاست گوتی:

- راوەستام تا لەگەڵ هەکلبێری فین قسە بکەم

مامۆستا خوێنی لەدەماران وشکبوو، بە داماوی لە رووی تۆم رادەما.. یەکسەر منگە منگی ئەو قوتابیانە راوەستا کە دەرسیان دەور دەکردەوە. قوتابییەکان سەرسامبوون ئایا ئەو هەتیوە دەبەنگە عەقڵی خۆی ونکردووە. مامۆستا گوتی:

- تۆ.. تۆ چیت کردووە؟

- راوەستام تا لەگەڵ هەکلبێری فین قسان بکەم.

دەرکەوت تۆم لە قسەکانی هەڵەی نەکردووە.

- تۆماس سۆیەر، ئەمە ترسناکترین دانپیانانە تا ئێستا گوێم لێگرتبێ. هیچ سزایەکیش نییە لەگەڵ ئەو تاوانەدا بگونجێ. چاکەتەکەت داکەنە.

مامۆستا ئەوەندەی لەو کوڕە هەڵدا تا قۆڵی کەوتن و داردەستەکانیشی کەمبوونەوە، ئەوجا فەرمانی پێدا:

- ئەوجا فەرمووو بڕۆ لەگەڵ کیژان دانیشە! با ئەوەشت بۆ ببێتە پەندێك.

هەرچەندە گوێی لێنەبوو، چونکە دەرەنجامەکە زۆر دڵی خۆشکرد. چوو لەسەر لێواری کورسی کچەکە دانیشت و ئەویش خۆی لێ دوورخستەوە و سەری خۆی وەلانا. پرتە پرت و چرپە و ئاماژە لە سەرتاپای پۆلەکە دەستی پێکرد، بەلاّم تۆم رەق لە جێگەی خۆی دانیشت و قۆڵی بەسەر پایە درێژ و نزمەکەی بەردەمیدا شۆڕکردەوە و وا خۆی دەرخست کە خەریکی خوێندنەوەی کتێبەکەیەتی.

دەمێکی پێچوو هاوپۆلەکانی چیدی بایەخیان پێنەدا و دووبارە منگە منگی خوێندێ بەرزبۆوە، هەنگێ تۆم جار جارە بەدزی تەماشای کیژەکەی دەکرد. ئەویش دەیزانی ، بۆیە لچی لێهەڵهێنا و نێزیکەی خولەکێك رووی وەرگێڕا. کە ئەوجارە بە ئاگەدارییەوە رووی وەرگێڕاوە. خۆخێکی لە پێشەخۆی بینی. پالێکی بۆ دوورەخۆی پێوەنا، بەلاّم بە تووڕەییەکی کەمتر. تۆمیش بە ئارامی بردییەوە شوێنی جارانی، کچە لەوێ لێیگەڕا. ئەو کاتە تۆم لەسەر تەختەکەی نووسی: تکایە هەڵیگرە، من زیاترم لایە، کچە تەماشای وشەکانی کرد، بەلاّم جوولەی نەکرد. کوڕە بەدەستی راستی وێنەی شتێکی لەسەر تەختە کرد و بەدەستی چەپەی شاردییەوە. لەسەرەتا کچە هەر گوێی نەدایە، بەلاّم زانخوازی مرۆڤ بەسەریدا زاڵبوو. هەندێ وردە جووڵەی کرد.. کوڕەش هەر خەریکبوو بێ ئەوەی ئاگای لەو جووڵانە بێت، کچە هەوڵیدا وێنەکە ببینێ، بەلاّم تۆم وای پیشاندا کە هەر ئاگای لێ نییە، لەکۆتاییدا خۆی پێنەگیرا و بە چرپە گوتی: لێگەڕێ ببینم.

تۆم دەستی لادا و کاریکاتێری خانووەکی دەرخست، کە دووکەڵکێشەکەی دووکەڵی لێ بەرز ببۆوە، کچەکە بایەخی کەوتە سەر وێنەکە و هەموو شتێکی دیکەی لەبیر کرد.. کە تۆم کارەکەی تەواو کرد، کیژە تەماشای کرد و بە چرپە گوتی:

- زۆر جوانە.. پیاوێکیش بکە.

هونەرمەند پیاوێکی لە گۆڕەپانی پێشەوە قیتکردەوە، دەتگوت دێوە دەیەوێ بچێتە ژوورێ، بەلاّم کچە حەزی لە رەخنە نەبوو، ئەو دەعبایەی پێ جوان بوو، چرپاندی:

- پیاوێکی جوانە.. ئێستا وێنەی منیش بکێشە وا دێم.

تۆم کچێکی جوانی دروستکرد باوەشێنێکی بەدەستەوە بوو.. گوتی:

- بەڕاستی نیگارێکی جوانە.. چەندم حەزلێبوو منیش وێنەم بزانیبا.

تۆم چرپاندی:

- ئەوە هەر زۆر ئاسانە.. من فێرت دەکەم.

- بە ڕاست..کەی؟

- نیوەڕۆیێ.. بۆ نانخواردن دەچییەوە ماڵێ؟

ئەگەر بمێنییەوە منیش دەمێنمەوە..

- باشە.. بیرۆکەیەکی جوانە.. ناوت چییە؟

- بیکی تاچەر، ئەی ناوی تۆ؟ بەلاّم .. من دەیزانم (تۆماس سۆیەر)

- بەم ناوە بانگم دەکەن.. بەلاّم کە نازم بدەنێ بانگم دەکەن تۆم. تۆش هەر بە تۆم گازم دەکەی وا نییە..؟

- بەڵێ.

تۆم لەسەر تەختەکە دەستی بە نووسین کردەوە لە کچەکەی دەشاردەوە، بەلاّم ئەو تکای لێکرد، کە شتێك دەنووسێ بهێڵی بیخوێنێتەوە، تۆم گوتی:

- نا.. ئەوەی دەینووسم زۆر گرنگ نییە.

- هەر دەبێ گرنگ بێ.

نەخێر.. وا بزانم لە راستیدا زۆر حەز ناکەی نووسینەکەم ببینی.

بەڵێ.. زۆرم حەز لێیە.. دەلێگەڕێ بیخوێنمەوە.

- خۆ باسی ناکەی

- نا.. بڕوام پێبکە باسی ناکەم

- تا ماوی بەکەسی ناڵێ..؟

- نا.. بەکەسی ناڵێم.. دە بێلە نووسینەکەت بخوێنمەوە.!

- بەلاّم.. تۆ ناتەوێ بیخوێنییەوە.

- مادام وام لەگەڵ دەکەی، هەر دەیبینم.

دەستە بچووکەکەی خستە سەر دەستی، تۆم وای پیشاندەدا کە بەهەموو هێزی خۆی لێناگەڕێ، بەلاّم وردە وردە دەستی خۆی خزاند، تا ئەو وشەی لەژێر دەرکەوت: (خۆشم دەوێی).

شەپێکی لە دەستیدا و گوتی:

- هەی شەیتان..

لە شەرمان سوور هەڵگەڕا و خۆشحاڵی بە ڕوویەوە دەرکەوت. لەو ساتەدا تۆم هەر ئەوەندەی زانی دەستێك گوێی گرت و زۆر بەهێز رایکێشا، ناچاربوو هەستاوە، مامۆستا بەمجۆرە لەدوای خۆی رایکێشا، تا داینا سەر کورسییەکەی خۆی، قوتابیان لە پڕمەی پێکەنینیان داو تانە و تەشەریان تێدەگرت، مامۆستاش ماوەیەك بە چاوێکی ئاگرینەوە تەماشای تۆمی کرد، پاشان رووی وەرگێڕا و چووە سەر کورسییە بەرزەکەی خۆی دانیشت، بێ ئەوەی نقەی لێوە بێ.

تۆم گوێچکەی زۆر دەیەشا، بەلاّم زۆر ئاسوودە بوو، کە هەموو شتێك هاتەوە شوێنی خۆی تۆم بەراستی هەوڵیدا وانەکانی بێتەوە یاد، بەلاّم ئەوەندە هەڵچووبوو، نەیتوانی تەواو سەرنجی بداتێ. کە دەرسی خوێندنەوە داهات، وشەکانی تێکەڵوپێکەڵ کرد، کە وانەی جوگرافیا هات، دەریاچەکانی کردنە چیا و چیاکانی کردنە رووبار و رووبارەکانیشی کردنە کیشوەر، تا دووبارە لە هۆبەکەدا بۆوە هەڵلاّ..

لەوانەی گۆکردن. مامۆستا قسەی رەقی پێگوت، کە تەواو لێشی بێزار بوو، لەبەردەم قوتابیانی راگرت، میدالیاکەی زیرەکی لێسەندەوە، کە چەند مانگێك بوو بەخۆیدا هەڵیواسیبوو، هەر لەو رۆژەوەی بەفرتوفێڵ دانە ئینجیلەکەی وەرگرتبوو.

# پاژی حەوتەم

تۆم چەند هەوڵی دەدا پتر دیقەت لە کتێبەکەی بدا، ئەوەندەی دی بیری پەرت دەبوو. بۆیە لە کۆتاییدا وازی هێنا و دەستی بە باوێشك و وەنەوزدانێ کرد، وای هەست دەکرد پشووی نیوەڕۆ قەت نایێ.. هەوا بەتەواوی کپ بوو، نزەبایەکی نەدەهات کەمێك گەرماکە هێورکاتەوە، تۆمیش بەتەواوی خاووخلیچك ببۆوە و مێشکی ماندوو ببوو خەو هەردوو چاوی داگرتبوو، منگە منگی بیست و پێنج قوتابی پۆلەکە تاکە دەنگ بوو وای لەم مرۆڤە دەکرد هەستبکا ژیانی لێیە، هەرچەندە منگە منگەکەش بە ویزە ویزی هەنگ دەچوو. دوور لەنێو بڵێسەی رۆژە هەڵقرچاوەکەدا، گردۆڵکەی کاردیف دیاربوو، کە هەرچوار لای کەسك دەچۆوە و تیشکی داخی خۆریان بەسەردا بریسکەی دەداوە، دیمەنێکی ناوازەی پێ بەخشیبوو. چەند باڵندەیەك لە ئاسماندا تەمبەڵانە باڵیان لێکدەدا. بێجگە لە هەندێ چێڵیش شوونی ژیان دیار نەبوو، چێڵەکانیش نووستبوون. دڵی تۆم بۆ ئازادبوونێ لێی دەدا، حەزی لێبوو شتێك هەبێ، ئەوەندەی تا کاتی پشوو ماوە، خۆی پێوە خەریك کا. دەستی لە گیرفانی راکرد، رووی گەشاوە و پشییەکی هاتەوەبەر، دەتگوت بێ ئەوەی بزانێ سوپاسگوزاری دەکا. ئینجا دەستی بە قۆدییەکەوە دەرهێنا و سەری کردەوە، قرنەکەی بەرەڵا کرد و خستییە سەر مێزە درێژ و لووسەکە. وا دیاربوو ئەو مەخلوقەش بۆ ئازادکردنی سوپاسگوزار بوو. بەڵام ئازادییەکەی زۆری نەخایاند، کە بە سوپاسەوە ویستی گوزەرکا، تۆم بە دەرزییەك گەڕاندییەوە شوێنی خۆی و ناچاری کرد ئاڕاستەیەکی دیکە بگرێ.

دۆستە نێزیکەکەی تۆم لەپاڵی دانیشتبوو، ئەویش بەهەمان دەردی تۆم چووبوو، بەڵام کە قرنەکەی دیت هەناسەیەکی پڕ ئۆخەی هەڵکێشا و زانی بەزمێکی بوو کاتەکەی پێ بکوژێ. ئەو دۆستە ئازیزەی تۆم، جۆ هارپەر بوو.. ئەو دوو کوڕە بەدرێژایی هەفتە برادەری سوێندخۆری یەکدی بوون. رۆژانی شەمووش لە مەیدانی جەنگدا دەبوونە دوژمن. جۆ دەمبووزێکی لە یاخەی چاکەتەکەی دەرێنا و کەوتە یاریکردنی هاوڕێکەی بۆ راهێنانی مێرووە دیلە بەستەزمانەکە.

یارییەکە گەشەی دەسەند، تۆم هەر زوو گوتی ئێمە بۆ راوەدوونانی مێرووەکە کێبەرکێمانە. وا بێ تام لە یارییەکە ناکەین، ئەوجا تەختەکەی جۆی هێنا و هێڵێکی بەسەریدا کێشا و کردییە دوو لاکێشە، گوتی:

- ئێستا، تاکو قرنەکە لەلای تۆ بێ، تۆ ئازادی بە کامە ئاڕاستە دەیهاژۆی، بەڵام ئەگەر وازت لێهێنا بپەڕێتەوە لاکێشەی لای من، دەبێ تا من دەتوانم رێی پەڕینەوەی لێبگرم بۆ لای تۆ، تۆ لێی بگەڕێ.

- باشە با دەستپێبکەین..

هێندەی نەبرد مێرووەکە لەدەست تۆم رزگاربوو، دەمێك جۆ راوینا، دیسان پەڕییەوە لای تۆم ، چەند جارێك ئەو هاتوچۆیەی کرد. ئەوکاتەی یەکێکیان تەواو خەریکی مێرووەکە دەبوو تا لە دەستی ڕانەکا، ئەوی دی بەوردی چاودێری دەکرد. هەردووك سەریان بەسەر تەختەکەدا شۆڕکردبۆوە. لەدوایی دەتگوت بەخت یاوەری جۆیە، چونکە مێرووەکە چەند هەوڵیدا هەڵبێ، هەر لە ناوچەکەی ئەو دەرنەچوو، مێرووەکەش پێدەچوو وەك دوو کوڕەکە ورووژابێ. شێتانە خۆی بەملا و بەولادا دەدا. لەگەڵ هەر هەوڵێکیشی تۆم خۆی بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام جۆ بەری لە مێرووەکە تەنگ کردبۆوە و ناچاری دەکرد لە بەشەکەیدا بمێنێتەوە. پاشان تۆم توانای چاوەڕوانی نەما و خۆی پێڕانەگیرا، بۆیە دەستی درێژکرد تا لەگەڵ جۆ لە ڕاوی مێرووەکە بەشدار بێ. بەڵام جۆ تووڕە بوو و گوتی:

- تۆم لێی گەڕێ

جۆ، من تەنیا ویستم کەمێك بیورژێنم

- نا بەڕێز ئەوە دادوەری نییە، لێی گەڕێ.

- پێم گوتی: دەمەوێ کەمێك چالاکی کەمەوە.

- گوتم لێی گەڕێ

- نا.. لێیناگەڕێم.

- لێی دەگەڕێ.. لەبەشی لای منە..

- تەماشاکە جۆ هارپەر، ئەم قرنەیە هی کێیە؟

- من گوێ بەوە نادەم هی کێیە، ئێستا لەبەشی لای منە، بۆیە تۆ نابێ دەستی بدەیێ.

- باشە.. من هەروا دەکەم.. چونکە ئەمە قرنەی خۆمە و بشمرم هەر بەکەیفی خۆمی لەگەڵ دەکەم.

شاپیَ زرمەی لەناو شانی تۆم هەستاند و یەکێکیشی خێوانده جۆ. دوو خولەکی پێچوو تا ئەو تۆزەی لە چاکەتی هەردووکیان بڵندبوو، رەوییەوە. قوتابییان هەموو لەو بەزمە رامابوون، ئەو دوو کوڕەش ئەوە خەریکی یارییەکەیان بوون، تەنانەت ئەو بێدەنگییە سامناکەی هاوپۆلەکانیان ئاگا لیَ نەبوو، دەمێك لە پشتیان راوەستا و بزانیَ چ دەکەن ئەو بەیەکجار قێڕەبڕیان کا.

کە نیوڕانیَ قوتابخانە بەربوو، تۆم چووە لای بێکی تاچەر و بە گوێیدا چرپاند:

- کلاَوەکەت لەسەرت نیَ و وا پیشاندە دەچییەوە مالیَ، کە گەیشتییە سووچی کۆلاَنیَ، خۆت لە ولاداشەکانت بدزەوە بە دالاَنەکەدا بگەڕێوە، منیش بە ئاڕاستەی پێچەوانەدا دەڕۆم و پاشان دەگەڕێمەوە.

هەر یەکەیان لەگەلَ کۆمەلَێك هاوپۆلان کەوت و پاش کەمێك هەردووکیان لە دالاَنەکەدا پێکگەیشتنەوە و بەغار هاتنەوە ناو قوتابخاتە و کەسیشیان نەدیت، چونکە کەسی تێدا نەمابوو، ئەوجا پێکەوە دانیشتن و تەختەکەیان لە پێش خۆیان دانا، تۆم پارچە تەباشیرێکی دا بێکی و دەستەکانی گرت تا فێری بکا. بەم شێوەیە وێنەی خانووێکی سەیری دیکەیان کێشا، کە زەوقی هونەریشیان ساردبۆوە دەستیان بە قسان کرد. تۆم لەناو ئاسوودەیی مەلەی دەکرد، لێی پرسی:

- ئەریَ تۆ جرجت خۆش دەویَ؟

- نا.. رقم لێیانە.

- منیش رقم لە جرجی زیندووە، بەلاَم من مەبەستم مردووەکانە، کە بە پەتێك بەدەوری سەری خۆمانیان بادەدەین.

- نا من هیچ بایەخ بە جرجان نادەم.. بەلاَم حەزم لە بنێشتە.

- ئا.. راستدەکەی.. خۆزگە ئێستا هەندێکم پێبا.

- بەراست؟ خۆ من قیچێکم پێیە، لیَ دەگەڕێم دەمێك بیجووی، بەلاَم دەبیَ بمدەیەوە.

دیارە بەمە رازیبوو، بۆیە بەنۆرە دەیانجووی و قاچیان دەهەژاند و دلَخۆشییان لیَ دەڕژا. تۆم پرسی:

- چ جاران تۆ سێرکت دیوە؟

- بەلیَ، لەم زووانە بابم دیسان دەمبا.. ئەگەر عاقلَ بم.

من سێ یاخوود چوار جار، بەڵکو زۆرجار چوومەتە سێرك. هیچ بە کڵێسا ناچێ، چونکە سێرك هەمووکات جمەی دێ و جووڵانەوەی تێدایە، کە گەورە بووم منیش دەبمە قۆشمەچی سێرك.

- ئۆی.. بەڕاست! جوانە.. هەموو قۆشمەچییەکان بە جلە ڕەنگاوڕەنگەکانیانەوە جوانن.

- بەڵێ. وایە.. زۆریشیان پارە چنگ دەکەوێ، بێن ڕۆجەرز دەڵێ زۆرینەیان ڕۆژێ دۆلارێکیان دێتە دەست.. بێکی پێم بڵێ، تۆ پێشتر داخوازی نەکراوی؟

- مانای چییە؟

- مەبەستم بۆ شووکردن نەخوازراوی؟

- نا

- پێم وایە بەڵێ، نازانم، داخوازی بەچی دەچێ؟

- بەچی دەچێ؟ بەهیچ ناچێ.. ئەوەندە بەسە بڵێی: هەرگیزاو هەرگیز لە تۆ زیاتر کەسی دیکەم ناوێ.. پاشان یەکتر ماچ دەکەن.. ئەمە هەموو شتێکە.. هەموو کەسێك دەتوانێ بیکا.

- ماچ بکا؟ جا ماچی بۆچییە؟

- باشە.. ئەمە بۆ.. چونکە.. باشە هەموو هەردەم وا دەکەن.

- هەموو کەسێك

- بەڵێ.. هەموو ئەوانەی یەکتریان خۆشدەوێ.. لەبیرتە چیم لەسەر تەختەکە نووسی؟

- بەڵێ..بەڵێ.

- چیبوو؟

- پێتنالێم

- دەبێ من پێت بڵێم؟

- ئا.. بەڵێ.. بەلاّم کاتێکی دی

- نا. ئێستاکە.

- نا.. ئێستا نا.. سبەی

- نا.. ئێستا، ئێستا.. تکایە بێکی بە چرپە دەیڵێم، زۆر بەدزی دەیچرپێنم.

بێکی دوودڵ بوو. تۆمیش وایدانا بێدەنگییەکەی ڕازیبوونە، بۆیە دوای ئەوەی لێوەکانی لە گوێچکەی وی نێزیك کردەوە بە دەنگێکی ناسك چرپاندییە گوێی. ئەوجا گوتی:

- دە تۆش هەمان وشەم بەگوێدا بچرپێنە..

بێکی دەمێك خۆیگرت، پاشان گوتی:

- سەرت بەولای وەسووڕێنەوە تا نەمبینی، ئەوجا وەدەڵێم، بەڵام نابێ ئەمە بەکەس بڵێی.. وا نییە تۆم؟ بەکەسی ناڵێی..ها.

- نەخێر.. هەرگیز بەکەسی ناڵێم.. دەی بێکی

رووی خۆی لەولای کرد و ئەویش هێدی لێی نێزیك کەوتەوە تا هەناسەی گەیشتە گروازەکانی پرچی. جا بەگوێیدا چرپاند:

- خۆ.. شم.. دەوێی

ئەوجا یەکسەر قیتبۆوە، بەدەوری کورسی و مێزەکاندا غاریدا و تۆمیش بەدوایەوە بوو، لە دواییدا پەنای بردە بەر گۆشەیەکی ژوورەکە و دەموچاوی بە بەروانکە بچووکەکەی ملی داپۆشت، تۆم دەستی کردە ملی و گوتی:

- بێکی ئێستا هەموو شتێك تەواو بووە، تەنیا ماچەکە ماوە.. مەترسێ شتێکی وا نییە..! تکایە بێکی.

بەرەبەرە بەروانکەکە و قۆڵەکانی رادەکێشا و ئەویش خۆی بەدەستەوە نەدەدا، دەستەکانی بەهەردوولا بەربوونەوە، هێندە کێشەی کردبوو، سوور هەڵگەڕابوو.. تۆم لێوە سوورەکانی راموسی و گوتی:

- ئێستا هەموو شتێك کۆتایی هات. دەبێ لە ئێستاوە بزانی کە بۆت نییە لە من زیاتر کەست خۆش بوێ و مێرد بەکەسی دیکە بکەی جگە لە من هەرگیز و هەتاهەتایە.. وا دەکەی؟

- بەڵێ.. تۆم لە تۆ بترازێ کەسم خۆشناوێ و مێرد بەکەسی دی ناکەم، تۆش هیچ کچێکی دیکە ناخوازی..

- بەدڵنیاییەوە، ئێستا ئەمە ئەرکی منە، لەمەودوا دەبێ کە دێی بۆ قوتابخانە و دەگەڕێیەوە ماڵ لەگەڵ من بڕۆی، بەو مەرجەی کەس نەمانبینێ، تۆ دەبێ من بکەیتە هاوبەشی خۆت و من تۆ دەکەمە هاوبەش، هەموو دەزگیرانەکان لەگەڵ یەکتری ئاوان!

- ئەمە شتێکی زۆر جوانە.. قەت پێشتر نەمزانیبوو.

- بەڵێ.. لەمەوپاش ژیانمان زۆر خۆش دەبێ، من و ئێمی لۆرانس..

کیژە چاوی زەق بۆوە، تۆم زانی چتۆ هەڵەی کرد، زمانی خۆی گرت، بەڵام پاشی چی..

- وای تۆم.. دیارە من یەکەم کەس نیم تۆ داخوازی بکەی!؟ یەکسەر دەستی بەگریان کرد.. تۆم گوتی:

- بێکی مەگری.. ئێستا من هەر بایەخی پێ نادەم

- نا بایەخی پێ دەدەی.. چاك دەزانی بایەخی پێ دەدەی.

تۆم ویستی دەستی لە ملکا، بەڵام پاڵی پێوەنا و رووی لە دیواری کرد و هەر دەگریا. تۆم دیسان هەڵیدا بەقسەی خۆش دڵی چاکاتەوە، بەڵام دیسان لێی دوورکەوتەوە، ئەوجارە تۆم لەخۆبایی بوو، لێی دوورکەوتەوە و ژوورەکەی بەجێهێشت. بەڵام بەدوودڵی و دڵتەنگی لە دەرێ وەستا. دەم نادەم تەماشای دەرگەکەی دەکرد، بەڵکو کچە پەشیمان بێتەوە و بێتە لای. بەڵام نەهات. هەنگێ هەستی بەهەڵەی خۆی کرد و لە ناخیدا بووە ململانێی فیز و عەقڵ، بەڵام عەقڵ سەرکەوت، بۆیە گەڕاوە ژوورێ و بینی هەروا لە شوێنی خۆی لە گۆشەی ژوورەکە راوەستاوە و دەگری و رووی لە دیوارە. تۆم دڵی بۆی لەت بوو، لێی نێزیك کەوتەوە و لە بەردەمی راوەستا، بێ ئەوەی بزانێ چ بکا باشە.. پاشان بە دوودڵی گوتی:

- بێکی.. لە تۆ زیاتر من بایەخ بەکەس نادەم.

وەڵامی نەداوە و هەر دەگریا. تۆم بە تکاوە گوتی:

- بێکی.. بێکی.. دە شتێك بڵێ؟

ئەویش هەر دەگریا..

تۆم بەنرخترین شتی خۆی دەرهێنا کە دەسکێکی دەرگە بوو لە مسێکی بریقەدار دروستکرابوو، بۆی راگرت و گوتی:

- تکایە بێکی ئەم دیارییەم لێ وەرگرە.

لێی وەرگرت و فڕێیدا سەرزەوی، یەکسەر تۆم لە ژوورێ چووەدەر و قوتابخانەی جێهێشت و بەگردەکە هەڵگەڕا، دوور رۆیشت و ئەو رۆژە نەگەڕاوە قوتابخانە.

بێکی لە مەسەلەکە کەوتە گومان.. غاریدا لە دەرگە و تەماشایکرد، تۆمی نەدۆزییەوە، غاریدا ناو گۆڕەپانەکە، لەوێش نەبوو، بانگی کرد:

- تۆم.. وەرە.. تۆم..!

هاواریکرد، چ وەڵامێك نەبوو، لەو تەنیایی و بێدەنگییەدا هاوەڵێکی نەدۆزییەوە، دانیشت و دەستی بەگریان کردەوە و لۆمەی خۆی دەکرد.. پاش دەمێك کچان و کوڕانی قوتابی پۆل پۆل هاتنەوە مەکتەب. ناچاربوو دڵتەنگییەکەی بشارێتەوە و دڵەشکاوەکەی ئارامکاتەوە، بە عەقڵێکی پەشێو و دەروونێکی بەژان دەست بەخوێندن بکاتەوە، کەسیشی لە دۆستانی چنگ نەکەوت هانای بۆ ببات و خەم و کەسەرەکانی بۆ بگێڕێتەوە..

# پاژی هەشتەم

تۆم بەم کۆڵان و بەو کۆڵانەدا رۆیی تا بەتەواوی لە رێی گەڕانەوەی قوتابییان دوورکەوتەوە، پاشان خێرایی خۆی هێدی کردەوە. دوو سێ جاران پردۆڵکەکەی بڕی، چونکە بۆچوونێکی خورافی هەبوو کە پەڕینەوە بەسەر ئاودا، حەیرانی نایەڵێ، نیو سەعات دواتر لەودیو تەلاری دۆگلاس ونبوو کە دەکەوتە سەر لووتکەی کاردیف ، لەوێ هەر ئەوەتا قوتابخانەکەی لەنێو دۆڵەکەی پشتە خۆیدا بەدی دەکرد. چووە ناو دارستانە چڕەکە و بێ ئاگا تا ناوجەرگەی رۆیی. لەژێر سێبەری داربەڕووێکی مەزن لەسەر گژوگیا دانیشت. شوێنێك بوو چرپەی لێوە نەدەهات، پێدەچوو قرچەی گەرمای نیوەڕۆ وای لە باڵندەکان کردبێ نەخوێنن.. ناوەناوەش دەنگی تەوری داربڕێك بەرزدەبۆوە، ئەو دەنگە کاریگەریی کپوکپییەکە و هەست بەتەنیایی کردنی تۆمی قووڵتر دەکرد. کورپێژگە روحی لەخەمان نقوومببوون، هەستەکانی تەواو لەگەڵ ئەو کەشوهەوا تەڵخەی دەوروبەری دەگونجان. ماوەیەکی زۆر دەستی لە چۆکان وەرێنا و سەری بە قۆڵەکانی کرد و دانیشت و زۆر بە قووڵی بیری دەکردەوە وایهاتە بەرچاو، کە ژیان لە زنجیرە ئازارێك بترازێ هیچی دیکە نییە، هەرچەند هەندێ جاریش بە رووماندا پێبکەنێ، هەستی کرد ئیرەیی بە جیمی دەبا کە مردووە. وای هەستکرد کە مردن حەسانەوەیەکی یەکجارەکییە و ماندووبوون و خەمی تێدا نییە. کە مرۆڤ رادەکشێ و تاهەتایە چاوەکانی لێکدەنێ خەون دەبینێ..

کاتێ با بەنێو درەختەکاندا دەچرپێنێ و گیاوگۆڵی سەر گۆڕەکەی دەلەرێنێتەوە، ئەوجا لە خەم و پەژارەکان رزگاری دەبێ و چیدی هیچ شتێك بێزاری ناکا. خۆ ئەگەر تۆماری فێرگەی یەکشەمووانی خاوێن با حەزی دەکرد بمرێ، بەلام وا نەبوو، ئێستاش سەبارەت بەو کچە چی لەگەڵ کرد؟ .. هیچ، مەبەستی بوو لە دنیا باشترین شتی بۆ بکا، بەلام ئەو وەك سەگ.. هەر سەگێکی تەواو مامەڵەی لەگەڵ کرد. رۆژێك دادێ پەشیمان دەبێتەوە، رەنگە ئەوکاتەش زۆر درەنگ بێ.. ئاخ خۆزگە دەیتوانی گەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ بمرێ!

بەلاَم ئەو دڵە نەرمەی جحێلاَن ناتوانیٚ تاسەر بە شکاوی بمێنێتەوە. ئەوەندەی پێنەچوو تۆم دووبارە رووی لەژیان کردەوە. چ دەبیٚ ئەگەر ئێستا بەشێوەیەکی تەمومژاوی بزربیٚ؟ چ دەبیٚ ئەگەر دوور دوور رۆیشت، چووە ولاَتە نەناسراوەکانی ئەو دیو دەریا و هەرگیز جارێکی دیکە نەگەڕایەوە! دەبیٚ ئەو دەم هەستی ئەو کیژە چۆن بیٚ؟! ئێستا ئەوەی دێتەوە یاد، کە دەیویست ببێتە قۆشمەچی سێرك، پڕ بەدڵ بێزی لیٚ دەبێتەوە، چونکە قۆشمە و پێکەنین و گاڵتەجاڕی هەرگیز لەگەڵ یەکێك رێك ناکەون، کە کوشتەی دەستی خۆشەویستییەکی بریندار بیٚ.. نا.. دەبێتە سەرباز، پاش چەندین ساڵ و عەیامان، دوای شەڕێکی زۆر بەشەکەتی دەگەڕێتەوە. نا.. باشترە بچیٚ بەگەڵ هیندییە سوورەکان بکەویٚ و راوەگامێش بکا و تا ئەوپەڕی رۆژئاوا بەڕێگەی جەنگ و نێو چیا و دۆڵ و دەشتە پانوبەرینەکاندا بچیٚ. جا لە ئایندەدا وەك سەرکردەیەی مەزن بە پەڕەمووچی سەروکاکۆڵ و قانەرەنگی جەستە و رووی بگەڕێتەوە و سەر لە بەیانی رۆژێکی هاوین سەر بە فێرگەی یەکشەمەوواندا بگریٚ و نەعرەتەی خوێناوی شەڕ لێدا، لەوەدەمە کۆنە دۆستەکانی چاویان زەق دەبێتەوە و بە حەسوودییەوە تێی دەڕوانن. بەلاَم نا شتێکی زۆر لەمە گرنگتر هەیە، چاکترە ببێتە جەردەی دەریا..! بەڵیٚ..! ئێستا دوارۆژی خۆی لەبەرچاوە کە دەبێتە پیاوێکی ناودار و گرنگ، چۆن ناوی لە هەموو دنیادا بلاَودەبێتەوە و خەڵك دەلەرزێنیٚ! چۆن بەخۆی و کەشتییە نزم و درێژەکەی، کە ناوی (گیانی گەردەلوول) دەبیٚ بەنێو دەریا فرەوانەکاندا سەما دەکا و بەیداخە ترسناکەکەشی بەسەریدا دەشەکێتەوە..!جا کە گەیشتە لووتکەی ناوبانگ، لەناکاو بەرەو گوندە کۆنینەکەی دەگەڕێتەوە و دەچێتە کلێسا بە رووێکی لەبەر رۆژ هەڵقرچاو و جلوبەرگێکی ساف لە مەخمەڵی رەش دەبێتە مرۆڤێك، هەرکەس بیبینیٚ چۆکی لەبەری دەلەرزیٚ، ئەو رۆژە.. هەموو بە رێزەوە ئاماژە بە شانوشکۆی دەکەن و لەبەرەخۆیان دەڵێن: ئەوە تۆم سۆیەری جەردەیە..! ئەوە تۆڵەستێنی رەشپۆشە، کە ترسی خستۆتە دڵی جەردە ئیسپانییەکان.

بەڵیٚ، بڕیاری خۆیدا و پیشەی خۆی دیاریکرد، دەبیٚ ماڵ بەجیٚ بێڵیٚ و بەرەو وەدیهێنانی خەونەکانی بچیٚ و سەرلەبەیانی سبەینێش بڕیارەکەی جێبەجیٚ دەکات. بۆیە دەبیٚ هەر لە ئێستاوە خۆی ئامادە بکات و خۆی خڕکاتەوە. بەرەو قەدە دارێکی رزیو چوو، بە قەڵەمبڕەکەی دەستی بە هەڵکۆڵینی کرد، زوو نووکی گەیشتە پارچەدارێك کە بە قۆرتێك دەچوو، دەستی خۆی رەوانکرد و ئەم بالۆرەی خوێند:

- ئەی ئەوەی لێرە نی تۆ وەرە.. ئەوەی لێرەشی هەر لێرە بمێنەوە.

سیان و پیسییەکەی لادا، پارچە دار سنەوبەرێکی لێ دەرکەوت کە بەرزی کردەوە، قۆرتێکی ئاوەلاً کرد، دەتگوت سەکۆی گەنجینە شاردنەوەیە کە ژێر و لایەکی بە پەلەبەرد داپۆشرابوو، پارچە مەڕمەڕێکی تێدابوو، سەرسامی تۆم بێ ئەندازە بوو! بەسەرسووڕماوی سەری خۆی خوراند و گوتی:

- باشە مرۆڤ لەمە تێناگا!

بە بێقیمەتییەوە مەڕمەڕەکەی تێهەڵدا ئەولای، کەوتە بیرکردنەوە، چونکە فێڵ و تەڵەکەی سەری نەگرت، ئەو تەڵەکەیەی کە بەخۆی و هاوڕێکانی وایاندەزانی لەهەموو دەموساتێکدا دێتەدی. باوەڕیان وابوو ئەگەر پارچە مەڕمەڕێك بشارییەوە و بالۆرەیەکی بۆ بخوێنی و ماوەی دوو هەفتان بەجێی بێڵی، پاشان بێی شوێنەکەی هەڵکۆڵی و ئەو بالۆرەیە هەڵدەی کە تازە تۆم گوتی، هەموو ئەو پارچە مەڕمەڕانەی تێدا دەدۆزییەوە، کە لە بۆنەی دیکەدا لێت ونبوون. هەرچەندە لەشوێنی دووریش بن.. بەلاّم فەشەلی هێنا. زۆر جاران گوێی لێ ببوو ئەو فێڵە سەردەگرێ، بەلاّم قەت نەیزانیوە سەرنەکەوێ. ئەوەشی لەبیرچوو، کە هەر بەخۆی چەندین جار تاقیکردۆتەوە، بەلاّم هەموو جارێ ئەو شوێنەی لێ ونبووە، کە گەنجینەکەی تێدا حەشارداوە. دەمێك بیری لێکردەوە، بەلاّم دوایی گەیشتە ئەو بڕیارەی کە پیرەژنێکی جادووگەر دەستی لەکارەکەی وەرداوە و لێی تێکداوە. لای وابوو دەتوانێ ئەم دەرەنجامەی خۆی بسەلمێنێ بە دەوروبەری خۆیدا گەڕا، قانە زیخێکی دیتەوە کە نەوراییەکی وەك قونێلی تێدابوو، لەسەر زەوی راکشا و دەمی لە نەوراییەکە نێزیك کردەوە و هاواریکرد:

- خاڵخاڵۆکە ماڵی خاڵم لەکوێیە.. خاڵخاڵۆکە دە پێم بڵێ چیت پێیە.. زیخەکە هەژا و خاڵخاڵۆکەیەکی رەشی لێهاتەدەر و یەکسەر ترسی لێ نیشت و هەڵیکوتاوە ناو خۆڵێ.

- پێی نەگوتم! کەواتە جادووی لێکراوە، دەمزانی...!

دەیزانی لەگەڵ جادووگەران چی پێناکرێ، بۆیە یەکجاری تەسلیم بوو، بەلاّم پێی وابوو مەڕمەڕەکەی هۆوەی تێهەڵدابوو هەڵبگرێتەوە. هەرچەند بە وردی بەدوایدا گەڕا، نەیدیتەوە، بۆیە گەڕاوە لای مەکۆکەی کە مەڕمەڕەکەی تێهەڵدا چۆن بوو، خۆی ئاوا لێکردەوە، پارچەیەکی دیکەی لە باخەڵی دەرێنا و بەهەمان ئاراستە هەڵیدا و گوتی:

- برا، برۆ برایەکەت وەدۆزەوە!

تا پارچە مەڕمەڕەکە کەوتە سەرزەوی چاوی لێ نەتروکاند، بەلاّم یان کورتی هێنابوو یاخوود سەری کردبوو، بۆیە نەیدۆزییەوە، جا دوو جاری دیکەش هەوڵیدایەوە و دەرەنجام

سەرکەوت، دواجار هەردوو پارچە مەڕمەڕی دۆزییەوە، کە یەك پێ لێك دووربوون. لەو ساتەدا تۆم گوێی لێبوو دەنگی تووڕتووڕەیەك لە دوورڕا دەهات. یەکسەر چاکەت و پانتۆڵەکەی داکەند و شەیالەکەی کردە پشتێن و چووە ناو دەوەنەکانی پشت کۆلکەدارەکە و لێکی جوداکردنەوە و تیروکەوانێك و شمشێرێکی دارین و تووڕتووڕەیەکی تەنەکەی دەرهێنا. بە یەك چرکە هەموو شتەکانی هەڵگرت و بە پێخواسی غاریدا و شاقەلی کراسەکەی لەهەوای تەکەتەکی بوو. لە بن دارێکی گەورە راوەستا و بۆ وەڵامدانەوەی فیڕەی لە تووڕتووڕەکەیەوە هێنا. جا بەسەر نووکی پێیان بەملا و بەولادا رۆیشت. بەترسەوە بە هاوەڵە خەیاڵییەکەی گوت:

- راوەستە پیاوی باش، تا من کەڕەنا لێ دەدەم تۆ خۆت دەرمەخە.

دەمودەست جۆ هارپەر دەرکەوت، جلێکی وەك تۆمی پۆشیبوو چەکەکانیشی وەکو وی بوون.. تۆم هاواریکرد:

- راوەستە.. کێیە دەوێرێ بەبێ ئیزنی من بێتە نێو دارستانی شێروود ؟!

- گای گویسبۆرنە.. پێویستی بە مۆڵەتی کەس نییە.. تۆ کێی.. ؟!

تۆم قسەی پێبڕی و گوتی:

- تۆ کێی تا بەم دەموزارە بمدوێنی.. ؟!

دیاربوو چییان لە کتێبدا خوێندبۆوە، وا قسەیان دەکرد.

- تۆ کێی کە دەوێری بەو جۆرە من بدوێنی؟

- من..! من رۆبن هوودم هەروەك پاش ساتێك بۆت دەردەکەوێ..

- کەواتە تۆ ئەشقیا یاسابەزێنە ناودارەکەی؟.. ئەگەر ئازای لەکوێی لەوێدا راوەستە..

هەردووك شیرە دارینەکانیان هەڵکێشا و کەرەستەکانی دیکەیان فڕێدا سەرزەوی، جا بۆ زۆرانبازی لێك هەڵەنگوتن و بە ئاگەدارییەوە دەستیان بە ململانێ کرد و تا هێزیان تێدابوو شمشێربازیان کرد، تۆم گوتی:

- ئەگەر بۆ هەڵواسینیش چووی چالاکانە بڕۆ

- ئەوەندە یەکتریان هێناوبرد تا هەناسەبڕکێیان گرت و ئارەقەیان بەنێو چاواندا هاتەخوار. تۆم هاواریکرد:

- چۆك دادە و خۆت تەسلیم کە. بۆ چۆك دانادەی!؟

- من نایکەم! تۆ بۆ چۆك دانادەی، تۆ تەنانەت هاوکوفی من نیت.

- بەڕاست..!؟ من ناتوانم تەسلیمی تۆ بم، لە کتێبەکە وا نەهاتووە، کتێبەکە دەڵێ بە یەك شمشێر گای گویسبۆرنی کوشت، تۆ دەبێ پشتم تێکەی، تا منیش لە پشتەوەڕا لێتدەم.

دەرفەت نەبوو لە کتێبەکە لادەن. بۆیە جۆ ڕووی وەرگێڕا، شمشێرێکی بەرکەوت و بەربۆوە.

جۆ هەستاوە و گوتی:

- ئێستا، هەقوایە تۆش لێگەڕێی من بتکوژم.

- بۆ، من ناتوانم، وا لە کتێبەکەدا نەهاتووە.

- هەرچۆنێك بێ.. نامەردییە لێم ناگەڕێی.

- بزانە جۆ، تۆ دەتوانی ببیبە (فرایر تەك) یاخۆ (مەچی) کوڕە ئاشەوان و شیربازیم لەگەڵ بکەی، یان من ببمە شەریفی نۆتینگهام و تۆش بۆ ماوەیەکی کورت ببیبە ڕۆبن هوود و بمکوژی.

جۆ بەمە ڕازی بوو، سەرکێشی دەستی پێکردەوە، پاشان دیسان تۆم بۆوە بە ڕۆبن هوود، کە ژنە ڕەبەنە فێڵبازەکە وای لێکردبوو هێزی نەمێنێ، کە لێ گەڕابوو خوێنی لەبەر برینەکەی بڕوا، لە کۆتاییدا جۆ ڕۆڵی خێڵێکی یاسابەزێنی بینی، کە بە خەمناکییەوە ڕۆبن هوودی ڕاکێشا و تیروکەوانی خۆی دا دەستە ماندووەکانی ڕۆبن هوود و تۆم گوتی:

- ئەو تیرە لەکوێ کەوتەوە، دەبێ جەستەی ڕۆبن هوودی هەژار لەوێ لەژێر سێبەری درەختێکی دارستانی گرینوود بشارنەوە. جا تیرەکەی هاوێشت و بەسەر پشتدا کەوت و مرد. پاش چرکە ساتێك ڤیتبۆوە و زۆر دڵخۆشی پێوە دیار بوو.

کوڕەکان جلوبەرگیان لەبەرکرد و کەرەستەکانی خۆیان شاردەوە و بەو داخەوە ڕۆیشتن، کە ئێستا یاسابەزێن و ئەشقیا نەماون و لە خۆیان دەپرسی شارستانی ئەمڕۆ لەباتی ئەوان چی پێشکەش کردووە. گوتیان خۆزگە بۆ ماوەی ساڵێکیش با دەبووینە یاسابەزێن لە جەنگەڵی شێروود، ئەمەشیان پێ چاتر بوو لەوەی تاهەتایە ببنە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان..

# پاژی نۆیەم

لەو شەوەدا پوورە پۆلی فەرمانی بە تۆم و سید دا، کە وەك ڕۆژان سەعات نۆ و نیو بچنە ناو جێ.. دوای ئەوەی هەردووك نوێژیانکرد و سید یەکسەر خەوی لێکەوت. تۆم بەوەئاگایی راکشا و چاوەڕوان بوو، تەواو بێزار بوو، لەودەمەی کە وایزانی هێندەی نەماوە رۆژهەڵێ. گوێی لێبوو سەعات دە لێیدا، یەکجاری هیوای لێبڕا.. دەیتوانی خۆی وەرگێڕێ و تەنیشت بگۆڕێ، چونکە حاڵەتی شپرزە بوو، بەلاّم دەترسا سید وەئاگابێ. پاشان پەنای بردە بەر بێدەنگی و چاوی لە تاریکایی بڕی.. دنیا ئەوەندە کپ بوو، مێشکی تێکدابوو. بەرەبەرە لەودیو کپ و بێدەنگییەکەدا دەنگە دەنگێکی هێدی پەیدا بوو. سەعاتەکەی قەد دیوار چرکەچرکی دەکرد، کۆڵەگە و پەیژە کۆنەکان جیڕەیان دەهات، بێ شك دێوەزمە لە دەرێ هەبوون، پرخەپرخ لە ژووری پوورە پۆلییەوە دەهات، زیکەزیکەی سیسرکانیش دەستیپێکرد. پاشان چرپەچرپی دەمژمێری مەرگ لەپشت سەری تۆمەوە هات. مانای وابوو یەکێك دەستنیشانکرا بۆ مردن، ئەوجا حەپەی سەگێك بە هەوای سافی شەودا بلاّوبۆوە، کوندەپەپوویەکیش لە دوورەوە وەلاّمی دایەوە، تۆم هەر زراوی رژا، لە کۆتایی تۆم هەستیکرد کات راوەستاوە و سەرمەدییەت دەستی پێکردووە، بەرەبەرە چاوی دەچووە خەو، سەعات یازدە لێیدا، بەلاّم ئەو گوێی لێنەبوو. دەنگێکی وەك میاوەی پشیلە لە دەرەوەڕا هات، دەنگی بەرزبوونەوەی پەنجەرەی دراوسێکەیان بێزاری کرد. یەکێك هاواریکرد، (وەلبە هەی شەیتان)! و بوتلێکی بەتاڵی تێگرت کە بە پەرژینی پوورە پۆلی کەوت، ئەمە تەواو بەئاگای هێنا و جلەکانی لەبەرکرد و بە پەنجەرەدا هاتەخوار.. میاوەیەکی وەکو ئەوی کرد و.. بازیدا سەر چیغەدارینەکە و خۆی هەڵدا سەر زەوی، هەکلبێری فین بەخۆی و پشیلە تۆپیوەکەی لەوێ بوو، پێکەوە بەڕێکەوتن، ئەوەندەی نەبرد تاریکی قوتیدان. لە پاشان نیو سەعات کەوتنە ناو گژوگیا بەرزەکەی قەبرستانێ.

گۆڕستانێك بوو لە شێوازی کۆنی رۆژئاواییەکان. دەکەوێتە سەر گردێك کەمێك و نیوێك لەگوند دووربوو، پەرژینێکی پانوپۆڕی لەدەور هەبوو، لە هەندێ شوێن بەدیوی ناوەوە

داکەوتبوو لە هەندێ شوێنیش بەدیوی دەرەوە، بەڵام هیچ جێیەکی ڕاستی نەبوو، دڕك و گژوگیاش سەرتاپای ئەو گۆڕستانەیان داگرتبوو. هەموو گۆڕە کۆنەکان داڕووخابوون و هیچ کێلێك لە جێی خۆیدا نەمابوو. تەختەی کەوانەی کەرم خواردوو بەسەر کێلەکانەوە بوون، کە هیچ کۆڵەگیانلەبەر نەبوو، پێشتر لەسەریان نووسرابوو، بەیادی فلانی کوڕی فلان، بەڵام ئێستا زۆرینەیان لەبەر رووناکیش نەخوێنرانەوە.

کزەبایەك بەنێو درەختەکاندا هات، تۆم لەوەی ترسا کە گیانی مردووان بێ، گلەیی لەوە بکەن کە بێزار کراون.. کوڕەکان بەدزی چەند قسەیەکیان لەگەڵ یەکتر کرد، چونکە کەشی کات و شوێنەکە و کپی و بێدەنگییەکە دەروونی تێکدابوون. ئەو گۆمەتە خۆڵەیان دۆزییەوە، کە بەدوایدا دەگەڕان، چەند پێیەك لە دووری گۆڕە تازەکە خۆیان لە پەنای سێ درەختی گەورە شاردەوە.

دەمێك بێدەنگبوون کە وایاندەزانی ساڵێکە.. دەنگی کوندەپەپوویەکی دوور کپییەکەی هەژاند، دڵەڕاوکێ تۆمی تۆقاند، زانی دەبێ قسە بکا، جا بە چرپە گوتی:

- ئەرێ هاك پێم بڵێ، دەبێ مردووەکان حەزبکەن ئێمە لێرەین؟

هەکلبێری چرپاندی:

- منیش نازانم، بەڵام لاموایە پێیان خۆش نییە.

- منیش وا تێدەگەم.

دیسان هەردوولا بێدەنگبوون، لە دڵی خۆیان زۆر شتیان لێکدەداوە. جا تۆم چرپاندی:

- هاك پێم بڵێ، پێتوایە هۆس ویلیامز گوێی لە ئێمە بێ کە قسان دەکەین!؟

- بەدڵنیاییەوە، هەر هیچ نەبێ ڕۆحەکەی گوێی لێمانە.

پاش ئێستێك تۆم گوتی:

- دەبووایە بڵێم بەڕێز ویلیامز، مەبەستم نەبوو بێڕێزی بنوێنم، هەموو پێی دەڵێن هۆس.

- تۆم، مرۆڤ کەباسی مردووان دەکا زۆر بە وردی گوێ ناداتێ.

تۆم ئەوەندەی بەسبوو، دیسان بێدەنگبوونەوە.

ئەوەندەی نەبرد تۆم قۆڵی هاوەڵەکەی راوەشاند و گوتی:

- وسسس!

باوەشیان پێکدا کرد و دڵیان بەتوندی لێی دەدا، هاك گوتی:

- ئەوە چییە تۆم؟

- وسبە! ئەوە دووبارە بۆوە، گوێت لێ نییە؟

- من....

- ئەوەتا.. گوێ بدێ

- ئای خوایە، کوڕە تۆم وا دێن.. بەڕاستی دێن.. ئەوجە چ بکەین؟

- نازانم.. پێتوایە دەمانبینن؟

- بەڵێ تۆم، ئەوان وەك پشیلە دەتوانن لە تاریکیدا ببینن، خۆزگە هەر نەهاتباین.

- ئای.. مەترسە، لاموایە بێزارمان ناکەن، چونکە ئێمە هیچ ناکەین، ئەگەر تەواو بێ جووڵە بمێنین، رەنگە هەر تێبینیمان نەکەن.

- باشە تۆم، هەوڵ دەدەم.. بەلاّم وەی خوایە.. زۆر خراپ دەلەرزم.

- گوێ بگرە!

هەردووکیان سەریان نەویکرد و هەناسەیان راگرت، منگە منگەکەیان بیست لەولای گۆڕستانێوە دەهات، تۆم بەچرپە گوتی:

- دەبینی.. ئەوە چییە..؟

- وەی تۆم ئەوە شەیتانە..

هەندێ تارمایی لە تاریکیڕا لێیان وەنێزیککەوتن، یەکێکیان کۆنە چرایەکی پێبوو، کە دەڕۆیشت تەکەتەکی بوو، بە ئاگرێکی کز، ئەرزەکەی رووناك کردەوە. هاك بەترسەوە چرپاندییە گوێی تۆم:

- دڵنیام ئەوانە شەیتانن.. سێ شەیتانن.. فەوتاین تۆم.. دەتوانی دوعا بکەی؟

- هەوڵ دەدەم، بەلاّم تۆش ئەوەندە مەترسە، خۆ ئەوانە ئازارمان نادەن، ئێستاش پاڵدەکەوم تا بنووم، من..

- وس..

- چی بووە، هاك؟

- ئەوانە مرۆڤن! هەر چۆنێ بێ یەکێکیان ئادەمییە، یەکێکیان دەنگی مەف پۆتەری پیرە

- بەڕاست، دڵنیای هەوە؟

- شەرت دەکەم ئەوە دەنگی ئەوە، مەجووڵێ، چاوی هەندە تیژ نییە بەیمان بکا.. دوایی وەکو جاران سەرخۆشیشە، ئای کە پیرەمێردێکی بێکەڵکە.

- باشە ئارام دەبم، ئێستا وا راوەستاون، دەبینی.. دیسان وا بۆ ئێرە دێن، لەسەرەخۆ دەڕۆن، ئەوە خێرایان کرد، دیسان هێدیبوونەوە، ئەوجارەش خێرا دێن، کوڕە هاك من دەنگی یەکێکیان دەناسم، خۆ ئەوە (ئینجەن جۆ)یە.

- راست دەکەی.. ئەو خوێنمژە بەدکارە، خۆزگە هەر شەیتان بووان، سەیرە دەبێ چ بەرەو ئێرەی هێنابن؟!

ئەو دوو هەتیوە چرپە چرپیشیان نەما، هەر سێ پیاو گەیشتنە سەر گۆڕەکە و تەنیا سێ پێ دوور لەوان راوەستان.

دەنگی سێیەم کەس هات کە چراکەشی بەدەستەوە بوو، هەر زوو ناسیانەوە کە دکتۆر رۆبنسۆنی گەنجە، گوتی:

- ئەوەتا.. لێرەیە..

پۆتەر و ئینجەن عارەبانەیەکی دەستیان رادەکێشا کە پەتێك و دوو خاکەناسی تێدابوو. بارەکەیان لەسەر زەوی دانا و دەستیان بە هەڵکۆڵینی گۆڕەکە کرد. پزیشکەکە چراکەی لای سەری گۆڕەکە دانا و بەخۆی دانیشت و پشتی بە یەکێك لەو دارانەدا، کە منداڵەکان خۆیان لەپشت شاردبۆوە و ئەوەندە لێیانەوە نێزیکبوو دەیانتوانی دەستی لێدەن بەدەنگێکی نزم گوتی:

- دەستتان سووککەن، هەر بزانە مانگ دەرکەوت.

سەریان لەقاند و لە هەڵکۆڵینێ بەردەوامبوون، ماوەیەك بەسەرچوو لە دەنگی خاکەناسی زیاتر نەدەهات کە قوڕ و بەردی لادەدا و دووری فڕێدەدان، خشەخشەکی ناخۆشیان لێوەدەهات.. لەدواییدا یەك لە خاکەناسەکان بەر تابووتێك کەوت و دەنگێکی ترسناکی لێوەهات. پاش یەك خولەکی دی دوو پیاوەکە تابووتەکەیان دەرهێنا و لەسەر زەویان دانا، جا بە خاکەناسەکانیان هەڵیانداوە و تەرمەکەیان دەرێنا و بە توندی هەڵیاندا سەر زەوی، لەو ساتەدا مانگ لەپشت هەورانەوە هەڵات و تریفەی کەوتە سەر رووە رەقە هەڵاتووەکە، هەردوو پیاو خێرا عارەبانەکەیان حازرکرد و تەرمەکەیان خستە سەری و بە پەتۆیەك دایانپۆشت بە پەتەکە گرێیاندا، پۆتەر چەقۆکەی لەگیرفانی دەرهێنا و پەتە زیادەکەی پێ بڕی و گوتی:

- ئێستا هەموو شتێك تەواو، ئەگەر پێنج دۆلاری دیکەیان نەدەیێ، تەرمەکە هەر لێرە دەمێنێ.

ئینجەن جۆ گوتی:

- بەلاَی وایە.

ئەوە چییە..؟! ئێوە پێشوەختە کرێی خۆتان داواکرد و پێمدان.

ئینجەن جۆ گوتی:

- وایە.. زیاتریشت کردووە

لە پزیشککە نێزیککەوە، کە هەستابۆوە پێوە و پێی گوت: پێنج ساڵ بەر لە ئێستا لە ناندینی باوکت وەدەرتنام، کاتێ هاتبووم داوای شتێك بکەم بیخۆم و گوتت، کە من بۆ کاری چاك نەهاتووم. کە منیش سوێندم خوارد ئەگەر سەد ساڵیشی پێ بچێ تۆڵەت لێدەکەمەوە، بابت بە تۆمەتی بێ جێیی لە زیندانیی هاوێشتم، لات وایە من لەبیرم کردووە..؟! هێشتا خوێنی ئینجەن لە دەمارم دەسووڕێ و ئێستا تۆم دەستکەوتووە و دەبێ حسێبی خۆت لەگەڵ من یەکلاکەیەوە، تێگەیشتی!

مستەکۆڵەی قیتکردبۆوە و گەفی لە دکتۆر دەکرد، دکتۆریش هەتا مست دەگری لە بناگوێی ئینجەنی داو بەریداوە گۆڕێ، قۆتەر چەقۆکەی تێهەڵدا سەر زەوی و گوتی:

- چیدی لە هاوەڵەکەم مەدە، بەسە

پاشان پۆتەر خۆی لە دکتۆری رووکرد و تێکگیربوون، ئینجەنیش لەناکاو هەستاوە سەرپێ و ئاگری لە چاوی دەباری. چەقۆکەی پۆتەری هەڵگرتەوە و دەتگوت کتکە بەدەوریاندا دەسووڕاوە، لە دەرفەتێك دەگەڕا چەقۆیەك بکوتێتە دڵی پزیشکەکە. لەهیکڕا دکتۆر خۆی دەرباز کرد و تەختەکەی لای سەری گۆڕی ولیامزی بڵند کرد و کوتایە سەر پۆتەر و یەکسەر لەعەردی کوتا، لەو دەمەی ئینجەن دەرفەتی هێنا و تا دەسکی چەقۆکەی لە دڵی دکتۆرە گەنجەکە داو ئەویش بەلاداهات و بەسەر پۆتەردا بەربۆوە و لە خوێنێی وەردا. لەو ساتە هەور بەری مانگیان گرت و منداڵە تۆقیوەکانیش هەتا توانایان لەبەربوو غاریان داو لەو دیمەنە سامناکە دوورکەوتنەوە.

کە دیسان مانگ دەرکەوتەوە، ئینجەن جۆ بەسەر هەردوو بریندارەکەوە راوەستا بوو، لێیان ڕادەما.. دکتۆرەکە هەندێ هوڕێنەی کرد و پاشان هەناسەیەکی توندی هەڵکێشا و گیانی سپارد، ئینجەن منگاندی:

- تۆڵەی خۆم لێکردییەوە.. بەنەفرەت بی

ئەوجا هەرچی لە گیرفانی کوژراوەکەدا هەبوو دزی، پاشان چەقۆکەی خستە دەستەکراوەکەی پۆتەر و لەسەر تابووتە کراوەکەدا دانیشت و کەوتە بیرکردنەوەیەکی قووڵ..

سێ.. چوار.. پێنج خولەك تێپەڕی، ئەوجا پۆتەر دەستی بە بۆڵەبۆڵ و ناڵەناڵ کرد و دەستی لە سیکاردەکە توند کرد، بەرزیکردەوە و تەماشای کرد، دەستی لەرزی و لێی کەوتە خوارەوە. هەستاوە و پاڵێکی بە تەرمەکەوە ناو لەخۆی دوورخستەوە و تێی ڕاما، پاشان تەماشای دەوروبەری خۆی کرد.. چاوی بەچاوی جۆ کەوت، گوتی:

- ئای خوایە..! جۆ ئەوە چۆن روویدا؟

جۆ بێ ئەوەی خۆی ببزوێنێ، گوتی:

- کارێکی پیسە، ئەوە بۆ واتکرد..؟!

- من..! قەت من نەمکردووە!

- تەماشاکە! کەس بەم قسانەت باوەڕ ناکا.

پۆتەر راپەڕی و سپی هەڵگەڕا، گوتی:

- وامدەزانی سەرخۆش نیم، خۆ من ئەمشۆ لە شەرابی نێزیك نەکەوتوومەوە، بەڵام ئێستا سەرمەستترم لەو دەمەی هاتین، بەڕاستی تەواو شپرزەم و ناتوانم خۆم خڕکەمەوە، جۆ بەڕاستی پێم بڵێ ئایا من ئەم تاوانەم کردووە؟ بەسەری خۆم بەشەرەفم جۆ قەت نەمویستووە و مەبەستم نەبووە بیکوژم.. پێم بڵێ چۆن روویدا..؟! وەی خوایە چەند کارێکی خراپە، خۆ هێشتا تازە لاوە..!

- بۆ، ئێوە هەردووکتان تێك گیربببوون، ئەو تەختێکی لێدای و بەریدایەوە. بەڵام هەستایەوە و بەلادا دەهاتی و دەهەژای هەتا چەقۆکەت هەڵگرتەوە و لە سینگت چەقاند، لەو دەمەی کە ئەو خەریکبوو بۆکسێکی دیکەی لێدەدای، تۆش کەوتییە سەرزەوی و تائێستا بەخۆنەهاتییەوە.

- من نەمدەزانی چ دەکەم.. چەندم حەز لێیە ئێستا بمرم، ئەمە هەمووبەهۆی زۆر ویسکی خواردنەوەم و زۆر هەڵچوونم بوو. وابزانم قەت پێشتر چەکم بەکارنەهێناوە.. بەڵێ شەڕم زۆر کردوون، بەڵام هەرگیز چەکم بەکارنەهێناوە.. خۆ خەڵکیش هەموو ئەوە دەزانن، جۆ بەکەس مەڵێ! دە بڵێ بۆ کەسی باس ناکەم، جۆ من تۆم خۆشویستووە و زۆرم داکۆکیی لێکردووی.. لەبیرت نییە؟ تۆ خەبەرم لێنادەی، وانییە جۆ..؟! کابرای بەدبەخت لەبەردەم پیاوکوژەکە چۆکی دادا و بە تکاکارییەوە دەستەکانی تێکگرتن، گوتی:

نا.. مەف پۆتەر تۆ هەمیشە لەگەڵ من راست و دادوەر بووی، بۆیە پشتت تێناکەم، وابزانم دڵسۆزیش نییە لەوە زیاتر.

- ئای جۆ، بەڕاستی تۆ فریشتەی، تا ماوم من دڵسۆزت دەبم.
پۆتەر دەستی بەگریان کرد و جۆ گوتی:
- وەرە، ئێستا بەسە، کاتمان نییە لەو فینگەفینگەی خەسارکەین. تۆ بەو ڕێیەدا بڕۆ، منیش بێرەدا.. دەی بجووڵێ، ئاگەداربە شوونی خۆت بەجێ نەهێڵی..
پۆتەر خێرا بەڕێکەوت، ئەوەندەی نەبرد هەڵات.. پیاوکوژەکە هەر لەوێ بەجێما و بۆڵاندی: ئەو گێلە ئەوەندە تاساوە چەقۆکەی بەجێهێشت، وا بزانم تا دوور نەکەوێتەوە نایەتەوە یادی، هەنگێش ناوێرێ بگەڕێتەوە. ئای ترسنۆکە..!
دوای دوو سێ خولەك لە مانگ بترازێ کەس لەوێ نەما بڕوانێتە کوژراوەکە و تەرمی ژێر بەتانییەکە و تابووتەکە و گۆڕە هەڵدراوەکە. دووبارە کشوماتی هەموو لایەکی داگرت.

## پاژی دەیەم

هەردوو کوڕەکە بەغار بۆ گوند گەڕانەوە، لە ترسان زمانیان نەدەجوولا، بەردەوام ئاوڕی پشتە خۆیان دەداوە. لە ترسی ئەوەی نەبادا یەکێکیان بەدواوە بێ و بزانێ چییان کردووە. هەر درەختێکی دەهاتە ڕێیان وایان دەزانی پیاوێکی دوژمنە و کە دەیان دیت پشییان رادەوەستا، کاتێ بەلای هەندێ کۆخی نێزیکی گوندی داچوون، گوێیان لە وەڕینی سەگان بوون هێندەی دیکە باڵیان گرت. تۆم بەهێنکە بڕاوییەوە چرپاندی:

- هەر بگەیشتباینایە کۆنەگوند دەمانتوانی کەمێك هێدی کەینەوە! من چیدی خۆم راناگرم.

هەکلبێری تەنها بە هێنکەهێنك وەڵامی داوە، هەردووك چاویان بڕییە ئەو ئامانجەی بەتەمابوون بیگەنێ و بەرەبەرە لێی نێزیك دەکەوتنەوە تا لەدوایی توانیان پێکەوە بگەنەوە ئاوەدانی و لەبەر سێبەری ماڵەکان هەستیان بەشەکەتی دەکرد و دڵەکوتەکەیان هێوربۆوە، تۆم بە چرپە گوتی:

- هاك تۆ پێتوایە ئەنجامەکەی چۆن دەبێ؟

- ئەگەر دکتۆر رۆبنسۆن بمرێ، لاموایە هەڵیدەواسن!

- پێتوایە؟

- بەڵێ تۆم من دەزانم

تۆم کەمێك بیری کردەوە، گوتی:

- جا کێ قسە دەکا؟ ئێمە؟

- ئەوە تۆ باسی چ دەکەی؟ وا دانێ شتێك روویدا و ئینجەن جۆ لەدار نەدرا، خۆ رۆژێك دادێ ئێمەش بکوژێ.

- هاك، منیش بیرم لەوە دەکردەوە

- کەواتە با زمان لێدانەکە بۆ مەف پۆتەر لێگەڕێین، ئەگەر ئەوەندە دەبەنگ بێ زۆرینەی کات سەرخۆشە و بەزمانی خۆی ناوەستێ.

تۆم هیچی نەگوت، بیری دەکردەوە پاشان چرپاندی:

- هاك، مەف پۆتەر ئاگای لەهیچ نییە چۆن دەتوانێ باسی بکا؟

- بۆ ئاگای لە هیچ نییە؟

- چونکە بەرلەوەی ئینجەن دکتۆر بکوژێ، ئەو لە هۆشی خۆی چووبوو جا پێتوایە هیچی دیبێ یاخۆ هیچ بزانێ.

- تۆم وەڵلا راست دەکەی!

- جیا لەمەش سەیرکە.. رەنگە ئەویشی کوشتبێ!

- نا تۆم پێناچێ وابێ.. جۆ دەیزانێ پۆتەر سەرخۆشە و دڵنیاش بوو ئاگای لەهیچ نییە، کە سەرخۆشیش دەبێ لە تەپڵی سەریدەی بەئاگا نایە.. بۆیە لاموایە نەیکوشتووە.

دوای بێدەنگییەکی دیکە، تۆم گوتی:

- هاك، دڵنیای کە خۆت پێڕادەگیرێ و قسە ناکەی.

- کورە تۆم دەبێ وەکو مردووان بێدەنگ بین. تۆ دەزانی ئەو ئینجەنە شەیتانە ئەگەر بزانێ ئێمە لەوێ بووین، لەناومان دەبا، یاخوود ئەگەر بزانێ زمانمان لێداوە و هەڵیشنەواسرا. بۆیە ئێستا تەماشاکە تۆم، دەبێ ئێستا سوێند بۆ یەکدی بخۆین. وا دەکەین، سوێند دەخۆین نقەمان لێوەنێ.

- من رازیم، ئەمە باشترین شتە، با دەستی یەك بگرین و سوێند بخۆین کە..

- نا.. نا ئەو سوێندە ئاساییە سوودی نییە، رەنگە هەر گوێی پێنەدەین، بۆ کاری وا گەورە دەبێ سوێندەکە بە خوێن بنووسرێتەوە.

تۆم عەقڵی نەیبڕی، چونکە رەش و تاریك و خەمۆك هاتە بەرچاوی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، چاری نەبوو دەبووایە جێبەجێی بکا، بۆیە پەلەدارێکی خاوێنی هەڵگرتەوە، لەگەڵ پارچە ئاسنێکی تیژ کە لەوناوە کەوتبوون، راوەستا هەتا مانگ دەرکەوت، زۆر بەڕاستی سوێندەکەی لەسەر تەختەکە نووسی، هەر وشەیەکیشی بە زمانی دووپاتکردەوە و دەم و زمانی لێك گیردەکردن.

هاك زۆر بە تۆم سەرسام بوو، کە توانای دەربڕین و نووسینی هەبوو.. یەکسەر دەمبوزێکی لە یاخەی چاکەتەکەی دەرهێنا و ویستی لە گۆشتی خۆی بچەقێنێ، تۆم نەیهێشت و گوتی:

- وا مەکە.. ئەو دەمبوزە لە مس دروستکراوە رەنگە ژەنگاوی بێ

- ژەنگاوی چییە؟!

- ژەهرە، رەنگە ئازارت بدا.

تۆم ئەو دەزووەی خاوکردەوە کە لە یەکێك لە دەرزییەکانی ئالابوو، هەر یەکەیان نووکی دەرزییەکەی لەسەری ئەسپێکوژەی خۆی راکرد و رایگوشی تا دلۆپە خوێنێکی لێڕژا. تۆم توانی یەکەم پیتەکانی ناوی خۆی بەخوێن لەسەر تەختەدارەکە بنووسێ، پەنجەی گەورەی خۆی لەباتی قەڵەم و تەباشیر بەکارهێنا، ئەوجا بە هەکلبێری نیشاندا چۆن دەتوانێ هەردوو پیتی (ه) و (ف) بنووسێ. بەجۆرە سوێندەکە کۆتایی پێهات. ئەوجا پەلەدارەکەیان لەبن دیوارێك شاردەوە پاش ئەوەی هەندێ تەلیسمیان بەسەردا خوێند و بەڵێنیاندا زمانی خۆیان ببەستنەوە و ئاماژە بەو کارەساتە نەکەن. لەو ساتەدا سێبەرێك لە کونی دیواری کاولەکەی بەرامبەریان بەژوورکەوت، بەلاّم ئەوان نەیاندیت.

هاك بەچرپە گوتی:

- ئایا ئەمە پابەندمان دەکا کە تاکو لەژیاندا ماوین هەرگیز هیچ لەبارەی ئەو رووداوە نەدرکێنین؟

- بەدڵنیاییەوە.. هەرچی روویدا دەبێ تەواو بێدەنگ بین و ئەمە گۆڕانی بەسەردا نایە، دەنا بەمردوویی دەکەوینە ئەو گۆڕەی.. نازانی؟

- بەڵێ، لاموایە ئەمە راستە.

بۆ ماوەیەکی کورت هەندێ سرتەسرتیان کرد، لەناکاو گوێیان لێبوو سەگێك بە دەنگێکی بەرز و بەردەوام دەوەڕێ، سەگەکەش تەنیا دە پێ لێیانەوە دووربوون لەهیکرا خۆیان بە باوەشی یەکتر دادا و هەترەشییان چووبوو.

هەکلبێری بە قوڕگێکی نووساوەوە پرسی:

- داخوا مەبەستی کامەمانە

- من نازانم.. برۆ لەو کونەڕا تەماشاکە.

- نا تۆم.. دە تۆ برۆ

- نا.. نا هاك من ناتوانم

- تکایە تۆم وا دیسان دەنگەکە دێ.

تۆم چرپاندی:

- وەی خوایە، سوپاسگوزارم، من ئەو دەنگە دەناسم شەمە بوڵ هاربسیۆنە.

- ئێ دەباشە، تۆم من هێندە نەمابوو لە ترسان بمرم، ترسام سەگێکی بەرەلاّ بێ.

سەگەکە دیسان وەڕییەوە، ئەوانیش دیسان زراویان چوو. هەکلبێری نووزاوە:

- وەی خوایە.. ئەوە بوڵ هاربسیۆن نییە.. وا نییە تۆم!؟

تۆم هەر تۆقیبوو، تەواو تەسلیم ببوو، چاوی لەسەر کونە دیوارەکە نەدەبزاوت، بەزەحمەت دەنگی دەبیسترا کە چرپاندی:

- کوڕە هاك ئەوە سەگێکی بەرەڵایە.

- زووبە تۆم زووبە.. ئەو سەگە مەبەستی کێیە؟!

- کوڕە مەبەستی هەردووکمانە، ئێمە پێکەوەین.

- تۆم کەواتە فەوتاین، بەخۆم دەمزانی چیم بەسەردێ. چونکە زۆر چەتوون بووم..

تۆم بەترسەوە منگەی لێوەهات:

- ئەمە ئەنجامی بەدعەمەلیمە، منیش هەرچی خراپ بێ کردوومە، وەك سید باش دەبووم گەر هەوڵمدابا، بەلاّم نەمکرد. خۆ ئەگەر ئەوجارە قوتاربم لە فێرگەی یەکشەمێ دانابڕێم

هەکلبێری بە مرخەمرخ گوتی:

- تۆ خراپی! ئەوە لەبیرکە، لەچاو من تۆ زۆر باشی ئای خوایە.. خوایە.. خۆزگە من نیو ئەوەندەی تۆ باشبام.

تۆم بەچرپە گوتی:

- هاك تەماشاکە... وا پشتی تێکردین.

هاك بەدڵخۆشییەوە تەماشایکرد:

- راستە، بەڕاستی پشتی تێکردووین! ئەدی پێشتریش وابوو..؟

- بەڵێ.. بەلاّم من بە گێلاتی خۆم بیرم لێنەکردەوە.. دڵنیام ئەوە بوڵە.. بەلاّم نازانم مەبەستی لەم وەڕینەی چییە؟

حەپەحەپ نەما، تۆم گوێیەکانی هەڵخست و چرپاندی:

- وسسسس! ئەوە چییە؟

- تۆم وابزانم پرخەپرخی مرۆڤە.

- راستە هاك، بەلاّم دەنگەکە لەکوێوە دێ.

- وابزانم لەودیوە.. وا پێدەچێ، بابم وا ڕاهاتووە هەندێ جار لەوێ بنوێ، بەلاّم پێم وا نییە هەرگیز بێتە ئێرە.

گیانی سەرکێشی دیسان لەم دوو کوڕە ڕابوو.

- باشە هاك ئەگەر من بە پێشكەوم، تۆ لە دووم دێی؟

- تۆم من زۆرم حەز لێ نییە، دەترسم ئینجەن جۆ بیّ لەویّ نووستبیّ.

تۆم تووشی دوودڵی هات، بەلاّم بەخۆی نەوەستا، هەردووك پێكهاتن هەوڵێك بدەن، بەمەرجێك ئەگەر پرخە پرخەكە راوەستا هەتا پێیان تێدایە غاردەن، جا بەسەر نووكی پێیانەوە بەرەو خوار چوون یەك بەدوای یەكدا چوون. تەنیا پێنج هەنگاویان مابوو بگەنە كابرای نووستوو، تۆم بیّ ئەوەی ئاگای لێبیّ پێی لە دارێك نا، كە لەسەر رێگەكە بوو، قرچەی لێوەهات، شكا. پیاوەكە نالاّندی و كەمێك بۆڵەبۆڵی كرد و پاشان رووی خۆی بەلای مانگێدا وەرگێڕا.. دەركەوت مەف پۆتەرە.. زۆری لێترسان و هێندەی نەمابوو دڵیان راوەستیّ، كە كابرا جولاّوە تەواو شپرزەبوون، پاشان دووبارە ترسەكەیان لەدڵدا رەوییەوە و بەرەو كونەكەی دیواری چوون و لێی هاتنەدەر، پاش ئەوەی ماوەیەك رۆیشتن، بۆ خواحافیزی راوەستان، لەوكاتەدا دیسان وەڕینی سەگێك زۆر بەتوندی دەستی پێكرد، ئەوجارەش منداڵەكان بەرەو سەرچاوەی دەنگەكە چوون، سەگە نامۆكەیان دیت هەرچەند پێیەك روو لە پۆتەر وەستابوو، رووبەڕووی ببۆوە و لموزی بەرەو ئاسمان بەرزكردبۆوە. كوڕەكان بە سەرسامییەوە گوتیان:

- ئای خوایە.. ئەوە هەوە..!

- دەزانی تۆم.. دەیانگوت سەگێكی بەرەلاّ نێزیكەی دوو هەفتە لەمەوبەر لەكاتی نیوەشەویّ وەڕی بوو، باڵندەیەكی شەوگەڕیش لەسەر ستارەكەیان هەڵنیشتبوو و دەیخوێند، كەچی هێشتا كەسیان لیّ نەمردووە.

- دەزانم.. با كەسیش نەمردبیّ، ئەدی شەمووی دواتر گراسی میلەر بە خراپی نەسووتا؟

- بەڵیّ.. بەلاّم نەمرد.. لەوەش زیاتر وا بەرەو چابوونەوە دەچێت.

- باشە با چاوەڕێكەین و ببینین، هەر دەمریّ، هەروەك مەف پۆتەریش دەمریّ. قولەكان لە مەبەستی وەڕینی سەگی بەرەلاّ وا دەڵێن. هاك، ئەوان هەموو شتێك لەم بابەتانە دەزانن..!

ئەوجا لێكدابڕان، هەردووك بەقووڵی بیریان دەكردەوە.. كە تۆم بە پەنجەرەكە هەڵگەڕاو چۆوە ژووری نووستن، شەو ئەوەندەی نەمابوو بەسەرچیّ، زۆر بەئاگەداری جلەكانی داكەند، پاشان كە خەوی لێكەوت. پیرۆزبایی لەخۆی دەكرد، كە كەس بەباسی سەركێشییەكانی نەزانیوە. ئاگای لە سید نەبوو، كە هەرچەندە بەنەرمی پرخەی لێوە دەهات، بەلاّم لەڕاستیدا سەعاتێك دەبوو بەخەبەر بوو.

کاتێ تۆم لەخەو رابوو، سید جلی لەبەرکردبوو، دەڕۆیشت. تۆم ئاوڕی بەدەوری خۆی داوە، دنیا تەواو رووناك بوو، زۆر سەری سووڕما و لەخۆی پرسی، بۆچی تا ئێستا بانگیان نەکردووە و وەك هەموو جارێ وەئاگایان نەهێناوە؟! یەکجاری سەرسامبوو، خێرا لەناو جێیەکەی هەستا و دوای پێنج خولەك خۆی گۆڕیبوو. بەچاوی بەخەوەوە چووە نهۆمی خواردنێ. هێشتا خانەوادەکە هەموو لەسەر خوان دانیشتبوون، هەرچەند لە بەرچایی خواردنیش ببوونەوە. ئەوجارە کەس قسەی پێنەگوت و سەرکۆنەی نەکرد، بەلاّم سەرنجیدا هەموو روویان لێوەرگێڕاوە و بێدەنگن، بەجارێ دڵی بەربۆوە، لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشت و هەوڵیدا دڵخۆشی بنوێنێ، بەلاّم ماندووبوونەکەی بەباچوو، نە کەس زەردەخەنەی هاتێ و نە کەس ئاوڕی لێداوە، بەڵکو هەموو بێدەنگ مانەوە.

کە تۆم لە خواردن تەواوبوو پووری بردییە لایەکی، دڵی شادبوو، خواخوای بوو چینێکی لێدا و ئەو دڵەڕاوکێیەی لەکۆڵکاتەوە، بەلاّم نەیکرد، بەڵکو دەستی بەگریان کرد و لێی پرسی چۆن توانیت بەدزی ماڵێ بەجێبێڵی، کە دەشزانی ئەوە دڵە پیرەکەم وێران دەکا..؟! لە کۆتاییشدا پێی گوت: لێتدەگەڕێم چی دەکەی بیکە و خۆت لەناوبە و ئەو پرچە سپییەی منیش لەتاوان بخە گۆڕەوە. چونکە هەرچەند زیاتر تێت هەڵدەم سوودی نییە. ئەمە لە هەزار قامچی بەسوێتر بوو. ئێستا تۆم دڵی ئازای لە جەستەی زیاتر بوو، گریا و پاڕاوە تا لێی ببوورێ، بەڵێنیدا خۆی چاکتر و چاکترکا، ئەوجا پووری بەرێکرد، دەشیزانی هێشتا بەتەواوی لێی خۆش نەبووە، چونکە متمانەی پێ نییە..

تۆم دۆخەکەی هەند ناخۆش بەجێهێشت، تەنانەت حەزی نەدەکرد تۆڵە لە سیدیش بکاتەوە، بۆیە سیدیش ناچاربوو لە ترسان بە دەرگەی پشتەوەدا بڕوا.. تۆم بە دڵێکی گران و هەنگاوی قورس بەرەو قوتابخانە چوو. دڵخۆشبوو بەوەی مامۆستا لەوی و لە جۆ هارپەری دا، چونکە دوێنێ قاشوانێیان کردبوو. هەستی بە ئازاری لێدانەکە نەکرد، چونکە مێشکی بە خەم و کەسەرەکانی خەریك بوو. پاشان لەجێی خۆی دانیشت و لەسەر مێزەکە ئانیشکی داوە، بە چاوێکی چەسپیو لە دیوارەکەی دەڕوانی دەتگوت پیاوێکە ئازارەکانی گەیشتوونەتە ئەوپەڕی، وا پێدەچوو پاڵ بەشتێکی رەقەوە بنێ. پاش کاتێکی زۆر بەدڵتەنگی هێدی خۆی راستکردەوە، پاشان شتە رەقەکەی هەڵگرتەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا.. شتەکە کاغەزێکی لوولدراو بوو. خاوی کردەوە و هەناسەیەکی قووڵ و درێژی بەدوادا هەڵکێشا، یەکجاری دڵی شکا، کە بینی ئەو دەسکە دەرگەیەی تێدابوو، کە پێشتر دابوویە بێکی. بە تەواوی بێ هیوا بوو.

# پاژی یازدەم

دەوروبەری نیوەڕۆ بوو، کە خەڵکی گوند هەموو بە بیستنی هەواڵە خەمینەکە تاسان. ئەودەمە هێشتا بروسکە نەدۆزرابۆوە، بەلاّم سەربردەکە لە پیاوێك بۆ پیاوێکی دی و لە گرووپێك بۆ یەکێکی دیکە و لەماڵێك بۆ ئەوی دی، بەخێرایی بروسکە گوازرایەوە. ناچار بەڕێوەبەری قوتابخانە پاش نیوەڕۆکەی کردە پشوو، دەیزانی ئەگەر وانەکا هەموو خەڵکی گوند رەخنەی لێدەگرن.

دەیانگوت: سیکاردێکی زلیان لە نێزیك تەرمی کوژراوەکە دۆزیبۆوە. یەکێك ناسیبوویەوە، کە هی مەف پۆتەرە.. هەروەك دەیانگوت کە هاووڵاتییەك درەنگی شەوێ بەرەو ماڵ بۆتەوە، لەو شەوەی تاوانەکە تێیدا روویداوە، پۆتەری دیوە لە ئاوی رووبارێ خۆی شووشتووە. ئەمەش دەوروبەری سەعات دووی بەیانی بوو، پۆتەریش کە هاووڵاتییەکەی دیوە خۆی شاردۆتەوە. ئەمە پتر گومانی دروستکرد، چونکە قەت پۆتەر نەبووە لە کاتێکی وا درەنگی شەودا خۆی لە رووباردا بشوا. هەروەها دەڵێن کە هەموو بەدوای ئەو پیاوکوژەدا دەگەڕێن (دیارە جەماوەر لەم بۆنانەدا بەدوای بەڵگەدا ناگەڕێ، بەڵکو یەکسەر حوکم دەدا)، بەلاّم تا ئێستا نەیاندۆزیوەتەوە، بۆیە ئەسپ سواران هەموو رێوبانێکیان لێگرتووە و بەدوایدا دەگەڕێن، شەریفیش متمانەی وایە، کە بەر لەتاریکی داهاتنێ دەیگرن.

هەموو خەڵکی گوند بەرەو گۆڕستانێ چوون.. تۆمیش کەمێك شنگی هاتبۆوەبەر و بەگەڵ کاروانەکە کەوت، تەنیا لەبەرئەوەی زۆری ئارەزوو کرد و خۆی پێنەگیرا. کە گەیشتە شوێنە بەدەکە، بە جەستە بچووکەکەی لەنێو ئاپۆرای خەڵکی دزەی کرد و چاوی بە دیمەنە ناهەموارەکە کەوت، وایزانی تەمەنێکە لەوەتەی دواجار لێرە بووە. هەستی کرد یەکێك نقورچی لە باسکی دەدا، ئاوڕی داوە بزانی کێیە، چاوی بە هەکلبێری کەوت. یەکسەر هەردووك روویان وەرگێڕا، ترسان نەوەك یەکێك لە تێڕوانینەکانیان تێبگات.. بەلاّم هەموو بەقسان خەریکبوون و تەماشای دیمەنە ناهەموارەکەی بەردەمیان دەکرد. دەیانگوت: "ئای لەو جحێڵە بەستەزمانە".. "گەنجێکی گوناحە".. "ئەوە دەبێ ببێتە پەند بۆ هەموو دزی گۆڕستانان".. " ئەگەر مەف پۆتەر بگیرێ هەڵدەواسرێ".. قەشە گوتی:

-ئەمە حوکمی خودایە، دەبێ بە ویستی ئەو بێ.

تۆم لە تەوقی سەرییەوە تا نووکی پێی راچەنی، چونکە چاوی بە رووی ناشرینی ئینجەن جۆ کەوت. لەو ساتەدا خەڵك ئاماژەیان دەکرد و خۆیان راپێش دەکرد، "ئەوە هەوە! خۆیەتی! وا بەخۆی دێ!" بیست کەس پێکەوە گوتیان:

- کێ..؟ کێ..؟

- مەف پۆتەر..!

یەکێك گوتی:

- ئەوە راوەستا.. سەیرکەن. وا رووی خۆی وەرگێڕا.. لێنەگەڕێن هەڵێ..!

ئەو کەسانەی لەسەر لقی دارەکەی سەر تۆم بوون گوتیان:

- پۆتەر هەوڵی نەدەدا هەڵبێ، بەڵکو دوودڵ و شپرزە بوو.

یەکێکی بەپێوە گوتی:

- وای لەو بێشەرمەی..! ویستی بەهێمنی تەماشای تاوانەکەی بکا. لامواپە بەتەما نەبوو کەس لێرە ببینێ.

خەڵك خۆیان بۆ شەریف لادا کە هات و قۆڵی پۆتەری گرتبوو. پۆتەری نەگبەت زەرد هەڵگەڕا بوو، ترسی هەموو دنیای لە چاویدابوو کە لەبەردەم تەرمی کوژراوەکە راوەستا، بەتوندی سەری خۆی راوەشاند، پاشان رووی خۆی بەدەستەکانی داپۆشت و لە پڕمەی گریانێی دا، بەهەنسکەوە گوتی:

- دۆستان.. من وامنەکردووە، بەشەرەفم سوێند دەخۆم من قەت وامنەکردووە. دەنگێك هاواری کرد:

- جا کێ تۆی تاوانبار کردووە؟!

ئەم پەلارە لەجەرگیدا، پۆتەر سەری بڵند کرد و بەچاوێکی بێ هیوا رووانییە دەوروبەری، کە چاوی بە ئینجەن جۆ کەوت، هاواری لێکرد:

- بەڵێنت پێدام کە..

بەڵام شەریف قسەی پێ بڕی و گوتی:

- ئەم چەقۆیە هی تۆیە؟

پۆتەر هێندەی نەمابوو بەربێتەوە ئەگەر نەیانگرتباوە و هەڵیاننەستاندباوە، گوتی:

- شتێك پێی گوتم ئەگەر نەگەڕابامەوە.. پاشان راچەنی و بەدەستەکانی ئاماژەیەکی بێئومێدانەی بۆ جۆ کرد و گوتی:

- جۆ پێیان بڵێ.. پێیان بڵێ.. بێدەنگبوون چیدی سوودی نییە.

هەکلبێری و تۆم لەجێی خۆیان ڕەقبوونەوە و گوێیان بۆ ئەو چیرۆکە هەڵبەستراوەی ئینجەن ڕادێرا، کە زۆر بە سەیر و چەسپاوی دەیگێڕاوە، وایان چاوەڕوان دەکرد ئەو ئاسمانە ساف و بێ پەڵەیە لەبەر ئەو درۆ زەق و زلانە بروسك باوێ و لە تەپڵی سەری ئەو درۆزنەی بدا، بەلاّم وانەبوو، کە ئینجەن لە چیرۆکەکەی تەواوبوو. بێ ئەوەی کەس دەستی لێدا لە شوێنی خۆی ڕاوەستا، ئەو دوو کوڕە زۆریان حەزکرد سوێندەکەیان بشکێنن هەتا ژیانی ئەو زیندانکراوە بێتاوانە ڕزگارکەن، بەلاّم کە زانیان ئەو ئینجەنە بەدکارە خۆی بەشەیتان فرۆشتووە، نەیانوێرا تێکەڵی کارێك بن کە کەوتبێتە دەست هێزەکانی شەڕخوازییەوە.

یەکێك گوتی:

- بۆ هەڵنەهاتی، بۆ ویستت بێیە ئێرە؟

پۆتەر بەناڵەوە گوتی:

- نەمتوانی.. نەمتوانی هەڵێم، ویستم هەڵبێم، بەلاّم لێرە زیاتر نەمتوانی بچمە هیچ جێیەکی دیکە! دەستی بەگریان کردەوە.

هەرچەند خولەکێك دواتر، ئینجەن جۆ بەوپەڕی هێمنییەوە لە لێکۆڵینەوەدا سوێندی خوارد و سەربردە هەڵبەستراوەکەی خۆی گێڕاوە. کە هیچ بروسکیشی لێنەدا، کوڕیژگەکان دڵنیابوون لەوەی، کە جۆ خۆی بەشەیتان فرۆشتووە.. لای ئەوان ببووە شتێکی زۆر سەیر و ناوازە، کە لە ژیانی خۆیان چاویان پێکەوتبێ. نەیاندەتوانی چاوی خۆیانی لەسەر ببزێون.

پێکەوە بڕیاریاندا شەوێ بچن تەماشای کەن، بەڵکو دەرفەتیان بۆ بڕەخسێ و شەیتانی سەروەری وی ببینن.

ئینجەن جۆ هاریکاری هەڵگرتنی تەرمەکەیدا تا بیخەنە ناو عارەبانە و بیگوازنەوە. چرپەچرپی ئەوە لەنێو ئاپۆراکەدا هەبوو کە برینەکە کەم خوێنی لێهاتووە. کوڕەکان وایاندەزانی ئەم تێبینییە ئاڕاستەی گومانەکان بەرەو ڕاستەڕێ دەگۆڕی، بەلاّم ئەوەندەی نەبرد گوندییەك گوتی:

- مەف پۆتەر هەر سێ پێ دوور بووە کە ئەو چەقۆیەی وەشاندووە.

نهێنییە ترسناکەکانی تۆم و نائارامی ویژدانی بۆ یەك هەفتە دواتر خەویان زڕاند، بەیانییەك لەدەمی بەرچاییدا سید گوتی:

تۆم تۆ زۆر خۆت لەناوجێ هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکەی و بڵمەبڵمت لێوە دێ، نیوەی کاتی شەوێ نایەڵی من بنووم.

تۆم تێکچوو و چاوەکانی بەرداوە، پوورە پۆلی بە جیدیانە گوتی:

- ئەمە نیشانەیەکی خراپە.. تۆم چیت لە مێشکدا خول دەدات؟

تۆم دەستی لەرزیو قاوەکەی دەستی لاربۆوە و بڕێکی لێڕژا و گوتی:

– چ نییە.. چ نییە پووریٚ..

سید گوتی:

– تۆ زۆر وتەی ترسێنەر دووبارە دەکەیەوە، شەوی رابردوو گوتت، ئەوە خوێنە... خوێن، چەندجار ئەمەت دووبارە کردەوە، گوتیشت هێندە ئازارم مەدە، هەموو شتێك دەڵێم. تۆم چیت هەیە بیلێی؟.. هەموو شتێك لەبەرچاوی تۆم دەلەرییەوە، چی لەبارەی رووداوەکە نەگوتبوو، لە خۆشبەختیش، پووری رەنگی کراوە و دەربازی کرد.

– ئەوە.. لەبەر ئەو تاوانە خراپەیە. من زۆرینەی شەوان خەونی پێوە دەبینم و هەندێجار وا دەزانم خۆم کردوومە.

ماریش گوتی، منیش بەهەمان شێوە گەلێك کاریگەر بووم. سیدیش پێدەچوو بەم قسانە قەناعەتی هاتبیٚ. تۆم هەر بۆی هەلکەوت یەکسەر لە ژووریٚ چووەدەر، پاشان گوتی ددانم دێشیٚ یەك هەفتەی تەواو خۆی دەمامکدابوو، نەیدەزانی شەوانە سید دەمامکەکەی دەکاتەوە و خۆی لەسەر ئانیشکان رادەگریٚ و گوێکانی لەزاری تۆم نێزیك دەخاتەوە تا بزانیٚ لەدەمی نووستنێدا چ دەلیٚ، پاشان دووبارە دەمامکەکەی بۆ دەبەستێتەوە..

رۆژبەرۆژ شپرزەیی تۆم رووی لەکەمی بوو، بۆیە وای پیشان دەدا، کە ددانی چابۆوە و دەتوانیٚ دەمامکەکەی فڕێدا. سید تەواو خۆی بێدەنگ کردبوو، ئەوەی لای وابوو لەهوڕێنەکانی دەمی خەوتنی تۆمی تێگەییوە، بۆ کەسی باس نەدەکردن... پاشان تۆم بەتەواوی گۆڕا، پێشتر دەبووە سەرۆکی ئەو کۆڕانەی منداڵاٚن کە باسی پشیلە کوشتنی تێدا دەکرا، بەلاٚم ئێستا لەو کۆڕانە نەدەحەواوە. هەروەها سید تێبینی ئەوەی کرد، کە تۆم وەکو جاران لەو مەجلیسانەدا وەك پێشوو داوای رۆلی لێتۆژ ناکا.. رۆلی شایەدیشی رەتدەکردەوە. لەو مەجلیسانە ساردبوو، تا بۆی رێك کەوتبا حەزی نەدەکرد تیایاندا بەشدار بیٚ..

هەرچەند سید سەری لەو هەلسوکەوتانەی تۆم سوڕما بوو، بەلاٚم دەنگی نەدەکرد. لەگەلٚ هەندێش زۆری نەبرد تۆم گەڕاوە حالەتی سروشتی و ئەو کۆڕانەی لا ئاسایی بۆوە و ئازارەکانی ویژدانی سووکتربوون.

تۆم لەو رۆژە تەنگانەدا هەموو رۆژیٚ یاخۆ رۆژەك نا رۆژەك دەچووە زیندانی دیٚ و چی بتوانیبا دەربازیکا بۆ ئەو زیندانییە بێتاوانەی دەبرد.. زیندانیش برێتی بوو لە کۆنە ژوورێك لەوپەڕی دێدا، پاسەوانیشی نەبوو، چونکە بەدەگمەن بەکار دەهات، ئەو یارمەتییە گچکانەش، ویژدانی تۆمیان هێوردەکردەوە.

## پاژی دوازدەم

هۆکارێکی دیکەش هەبوو کەوایکرد مێشکی تۆم نهێنییە قورسەکە لەبیرکا، چونکە بە شتێکی تازە و قورستر خەریك بوو، کە بێکی تاچەر چیدی بۆ قوتابخانە نەهات. چەند رۆژێك تۆم توانی رکە لەگەڵ نەفسی خۆی بکا و هەرچی یادەوەری ئەوە بیداتە دەم با، بەڵام نەیتوانی. دەستی پێکرد بەشەو دەور و خولی ماڵی بابی دەدا و دڵتەنگ بوو. دەبێ نەخۆش بێ یاخۆ مردبێ، ئەو خەیاڵە تاساندی، چیدی بیری لە شەڕ و جەردەیی نەدەکردەوە، خۆشی لە ژیانیدا نەمابوو، تەنیا دڵتەنگی و خەمگینی بۆ مابۆوە. کەڕەنا و کەرەستەی جەنگی فڕێدا و چیدی چێژی لێ نەدەبینین. پووری بایەخی پێدەدا، هەموو جۆرە چارەسەرێکی لەگەڵ بەکارهێنا. بەخۆی یەك لەو خەڵکە بوو، کە باوەڕی بەسوودی هەموو گیراوە و داودەرمانێك هەبوو، تا تەندروستی بپارێزێ، هەمیشە شتی سەیری تاقیدەکردەوە و هەرکاتێك جۆرە دەرمانێکی تازە دەرکەوتبا تا تاقیدەکردەوە کێچی دەکەوتە کەولی، بەخۆشی نەیدەجەڕباند، چونکە قەت نەخۆش نەکەوتبوو، بەڵکو هەر کەسێکی دیکەی دەستکەوتبا بەوی دەدا. پوورە پۆلی هەموو بڵاوکراوە و پەخشنامە خولییەکانی تەندروستی بۆ دەهات. تەواو باوەڕی بە هەموو بانگەشەیەك هەبوو، کە تێیاندا بڵاودەکراوە و باسی تازەترین رێگەی هەواگۆڕکێ و چۆنێتی نووستن و هەڵسان و خواردن و خواردنەوە و بڕی وەرزشکردنیان دەکرد، کە دەبێ مرۆڤ ئەنجامی بدا، لەپاڵ ئەو دۆخە عەقڵییەی کە پێویستە تێیدا بێ و جۆری ئەو پۆشاکانەی لەبەریاندەکا. ئەو رێنماییانە هەموو لەلای ئەو وەکو ئینجیل پیرۆزبوون. هەرگیز تێبینی ئەوەشی نەدەکرد، کە بڵاوکراوەکانی ئەمڕۆ تەواو پێچەوانەی ئەوانەی مانگێك پێشترن. بەخۆی خانمێکی ساکاری دڵ و دەروون ساف بوو. بۆیە هەردەم بەسانایی دە داوی ئەو شتانە دەکەوت. تازە باسی چارەسەرکردن بە ئاوێ هاتبووە ئارا، باری نارێکی تۆم بۆ ئەو دەرفەتێك بوو، هەموو رۆژێ لەگەڵ زەردەی بەیانی رایدەپێچا سەر کۆڵێ و لە ئاوی ساردی هەڵدەکێشا، پاشان بە پەشتەماڵێکی دڕ وەکو کارتیخ وشکی دەکردەوە. پاشان دەیبردەوە ژوورێ و لە پەڕۆیەکی تەڕی لوولدەدا و بە جاجم و لێفان دایدەپۆشت تاکو گیانی پاك بێتەوە و تۆم گوتەنی ئەو ماکە زەردەی لە کونۆچکەکانی جەستەیەوە دەربێ.

بەڵام ئەمە هەمووی بێ سوود بوو. تا دەهات ئەو کوڕە دڵتەنگتر دەبوو، پتر زەردهەڵدەگەڕا و تەندروستی خراتر دەبوو، بۆیە حەمامی گەرمیشی بۆ زیادکرد لەپاڵ ئاوێژێنکردن و نقووم کردن و شتی دیکەش. بەڵام ئەو کوڕە خراتر بوو باشتر نەبوو. بۆیە دەردخواردانی گاڵ و بەکارهێنانی قیڕ و زفتیشی بۆ چارەسەرییەکەی زیادکرد. بەرەبەرە داوودەرمانی وای بۆ زێدە دەکرد، کە بەڕای خۆی دەرمانی حەفت دەردان بوون.

وای لێهات تۆم گوێی بەو ئەشکەنجەیە نەدەدا.. بەڵام خانمە پیرەکە لەدەست حاڵەتەکەی وەڕسبوو. بڕیاریدا بەهەر نرخێك بێ ئەو بارەی بگۆڕێ. ئێستا پوورە پۆلی بۆ یەکەمجار گوێی لە دەرمانی ژانکوژ بوو، هەندێکی داواکرد، هەرکە گەیشتە دەستی و بڕێکی لێ تامکرد ئۆخەی بە دڵیداهات. دەتگوت ئاگرە بە شلی، یەکسەر بڕیاریدا واز لە چارەسەری بە ئاو و هەموو شتێکی دیکە بهێنێ. هەموو باوەڕی خۆی خستەسەر ئەو ژانکوژە. ملاکە چایەکی لێدایە تۆم، زۆر بە دوودڵی لە چاوەڕوانی ئەنجامەکەی بوو. زوو ترسەکەی رەوییەوە و دەروونی ئارامبۆوە.. چونکە تۆم بێ بایەخێکەی نەما و ئەگەر ئاگری لەبن هەڵکردبا هەر هێندە بایەخی پێدەدا.

تۆم هەستی کرد ئەوە کاتی وەئاگا هاتنەوەیە. ئەو جۆرە ژیانە رەنگە لەگەڵ ئەو خۆدابڕینەی وی رۆمانسیانەتر بووایە، بەڵام دەخوازێ کەمێك پێیدا بچێتەوە و گۆڕانکاریی تیا بکا. بۆیە بیری لە چەند پلانێك کردەوە تا دەربازی کا. لە کۆتاییدا گەیشتە ئەوەی کە ژانکوژەکە بۆ باری وی لەجێیە. ئەوەندەی داوا دەکرد لێی بخواتەوە تا پووری بێزارکرد، ئەویش شووشەکەی دایێ بۆ ئەوەی کەی ویستی چەندی حەز لێ بوو لێی بخواتەوە و ئەوەندە بێزاری نەکا. ئەگەر سید داوای کردبا لێی بێخەم بوو، بەڵام چونکە تۆم بوو زۆر بە وردی چاودێری بوتڵەکەی دەکرد. دیتی بەڕاستی بەرەبەرە دەرمانەکە لەکورتی دەدا. بەڵام قەت بەخەیاڵیدا نەدەهات کە ئەو کوڕە لێی نەخواتەوە، بەڵکو لەو درزەی رووکا کە لە ژووری دانیشتنێ هەبوو..

رۆژێك تۆم خەریکبوو ژەمە دەرمانەکەی لە شەقەکە بهاوێ، کە پشیلە تووك زەردەکەی پووری بەسەرداهات و چاوی بڕییە ملاکەکەی دەستی، وەك بڵێی دەپاڕاوە هەندێکی بداتێ. تۆم گوتی:

- پیتەر ئەگەر پێویستت نییە داوای مەکە
- پیتەر سەری لەقاند و وای پیشاندا کە پێویستە

- چاکترە دڵنیا بی

بەڵام پیتەر دڵنیا بوو

- کە تۆ بەخۆت داوات کرد منیش دەتدەمێ، چونکە ئەمە بۆ من هیچ نییە، بەڵام ئەگەر بەدڵت نەبوو، لەخۆت زیاتر لۆمەی کەس مەکە.

دیاربوو پیتەر رازی بوو، جا تۆم دەمی پشیلەکەی لێککردەوە و ملاکێك ژانکوژی تێکرد. پیتەر لەتاوان دوو گەز خۆی تێهەڵدا، پاشان تا تێیدا بوو میاواندی، جا بە هەر چوارلای ژوورەکەدا بازی دەدا و خۆی بەدار و بەرد دادەدا و مەرکانەکانی بەردەدانەوە و هەموو لایەکی تێکدەشێواند. پاشان هەستاوە سەر پاشیان و بە دەوری خۆیدا دەسوورِاوە، سەری خستبووە سەرشانی و دەنگێکی لێوەدەهات، دەتگوت لەخۆشیان وادەکا. پاشان وەك شێتان بەملاو بەولادا هەڵبەزی و هەرچی هاتە رێی تێکیدا. لەو کاتەدا پوورە پۆلی هاتەژووری، دیتی وا پشیلەکە هەندێك جووڵانەوەی پاڵەوانانە دەکات، پاشان لە پەنجەرە ئاوەلاکەوە خۆی هەڵدا دەرێ و هەر مەرکانێکی لەوێ مابوو لەگەڵ خۆی بە حەوای خستن.. پیرەژن لەجێوە رەقبۆوە و تەواو واقی ورِما، لەسەر پەروازی چاویلکەکەی دەیروانییە کتکەکە و تۆمیش کەوتبووە سەرپشت پێدەکەنی.

- هەتیو تۆم ئەو پشیلە چی بەسەرهاتووە؟

کورِە وەرامی داوە

- نازانم پووریێ

- بۆ، من هەرگیز وام نەدیوە، چی وای لێکردووە وا بکا؟

- بەرِاستی نازانم پووریێ.. بەڵام ئەوەندە دەزانم ئەگەر پشیلە کەیفیان سازبوو، وادەکەن.

- بەرِاست؟ دەنگی پیرەژن ئاوازێکی تێدابوو تۆم لێی ترسا.

- بەڵێ خانم.. پێموایە وادەکەن

- تۆ پێتوایە؟

- بەڵێ خانم..

پیرەژن خۆی نووشتاندەوە، تۆمیش بەترس و دوودڵی سەیری دەکرد. درەنگ لە مەبەستی گەیشت. کلکی ملاکی دەرمانخوارنەوەکە لەبن نوێنانەوە دیاربوو، هەڵیگرتەوە و تێی رِاما. تۆم خۆی کرژکردەوە و چاوی لێوەرگێرِا، پوورە پۆلی بەگوێیان بڵندی کرد و کەشکێکی لێدا و گوتی:

- فەرموو گەورەم ئێستا بڵێ چی وای لێکردی ئەو ئاژەڵە بەستەزمانە چارەکەی، بۆچی؟
- من زگم پێسووتا بۆیە وامکرد، چونکە ئەو هیچ پوورێکی نییە.
- پووری نییە.. هەی بێ مێشك.. جا تۆ بۆچی ناچارتکردووە دەرمان بخوا؟
- چونکە ئەگەر پووری هەبا خۆی داخی دەکرد و ئەو دەرمانەی دەدایە، کە هەناوی دەسووتێنێ، ئەگەر مرۆڤیش با لەمە زیاتر هەستی بەهێ نەدەکرد!

لەهیکڕا پوورە پۆلی هەستی بە ئازاری ویژدان کرد، ئەمە رووناکییەکی تازەی خستە سەرشان، ئەوەی بۆ پشیلەیەك دلڕەقی بێ بۆ منداڵێکیش وایە. بۆیە دڵی نەرم بوو، پەشیمان بۆوە و چاوی کەمێك تەڕبوون، دەستی خستەسەر سەری تۆم و بەنەرمی پێیگوت:

- تۆم من چاکەم بۆ تۆ دەخواست، ئێستاش چاکەکە هاتەدی.

تۆم سەری بڵند کرد و بریسکەی بایەخ لە چاوەکانی دیار بوو.

- پوورێ دەزانم تۆ چاکەی منت دەوێ، منیش وام بۆ پشیلەکە دەویست، دەرمانەکە چارەی کرد، هەر لەوەتەی..
- وەیش تۆم، لەگەڵ تۆ درێژەی ناوێ، دەتەوێ دیسان توورەم بکەی. بەڵام هەوڵدە بۆ یەکجاریش بێ ببیە کوڕێکی باش، ئەو کاتە چیدی پێویست ناکا ئەو دەرمانە بخۆی.

تۆم پێش وەخت گەیشتە قوتابخانە، جێی سەرنج بوو، کە لەوەتی تۆم گەڕاوەتەوە هەموو رۆژێ ئەو دیاردە سەیرە دووبارە دەکاتەوە، ئێستاش وەکو داربی ئەم دواییەی بەتەنیا لەبەر دەروازەی یاریگەکە وەستا، لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ دۆستەکانی یاری بکات.. پێی گوتبوون کەوا نەخۆشە و بە نەخۆشانیش دەچوو. دەیویست وا پیشاندا کە بەهەموو لایەکدا دەڕوانی، بەڵام لەڕاستیدا پتر تەماشای رێیەکی دەکرد. پاش کەمێك جێف تاچەر دەرکەوت، تۆم گەشاوە و کەمێك سەیری کرد، بەڵام هێندەی نەبرد بەدڵی تەنگەوە رووی خۆی وەرگێڕا. کە جێف گەیشتەجێ تۆم پێشوازی لێکرد و هەوڵیدا سەری قسان بەرەو باسی بێکی ببا. کەچی جێف شتێکی باس نەکرد تۆم ئۆقرەی پێ بگرێ، بۆیە لێی پەست بوو و رۆیشت. تۆم هەر چاوی دەگێڕا و تەماشای دەکرد بە ئاوات بوو تیچاوێکی بەو کچە بکەوێ، لە هەر یەکێکی دەڕوانی هەو نەبوو، بەبێ هیوایی و بێزار چووە هۆڵی خوێندن و لەسەر تەختەکە دانیشت، جا دیتی وا کچێکی دیکە دێ، دڵە کوتەی گرت و دەرپەڕییە دەرێ، هاوار هاواری بوو، پێدەکەنی کچەکانی بەملا و بەولادا رادەدا و بەسەر پەرژینەکەدا بازی دەدا و ژیانی خۆی دەخستە مەترسی و جووڵانەوە سەیرەکانی خۆی دەکرد بەلا چاوێکیش سەیری بێکی دەکرد تا بزانێ

ئاگای لێیە، بەلاّم وا دیار بوو ئاگای لە هیچ نەبوو، چونکە هەر ئاوڕێکیشی لێنەداوە..لەخۆی پرسی باشە دەبێ ئاگای لەمن نەبێ؟ زۆر لێی نێزیککەوتەوە هاتوهاواری بوو، کلاّوی قوتابییەکی رفاند و بۆ بنمیچەکەی هەڵدا، خۆی هاوێشتە ناو کۆمەڵە کوڕێك و هەر یەکەی بەلایەکدا تێهەڵدان، بەخۆشی لەبەر پێی بێکی کەوتە سەرزەوی و زۆری نەمابوو ئەویش بەرداتەوە. کەچی ئەو رووی لێوەرگێرا و لووتی بەرزکردەوە و گوێی لێبوو گوتی:

- ئای خوایە، هەندێ کەس لایانوایە زۆر زیرەك و رەزاسووکن.. هەمیشە خۆیان هەڵدەکێشن!

روومەتی تۆم ئاگری لێدەباری، بەگرانی هەستاوە و بە تێکشکاوی لەوێ دوورکەوتەوە..

# پاژی سێزدەم

تۆم بڕیاری خۆیدا، وا تێگەیی کە کوڕێکی بوغزێنراوە و دۆستی نییە و کەس کەیفی پێ نایێ، گوتی، کەس خۆشیناوێم. کە خەڵك بۆیان دەرکەوت ئەوان بەرپرسیارن لە بڕیارەکەی، ڕەنگە هەنگێ سوێیان لێببێتەوە. تا توانای هەبوو ویستی ڕاستەڕێ و چاك بێ، بەلاّم ئەوان نەیانهێشت، چونکە ئەوان خەمی هیچیان لەبەر نییە و تەنیا دەیانەوێ لەدەستی ڕزگار بن.

کەواتە، با وابێ، با بۆ سەرەنجامیش سەرکۆنەی وی بکەن.. جا بۆ سەرکۆنەی ناکەن؟ ئەوی دۆستێکی نەبێ کەی مافی گازاندەی هەیە. بەڵێ.. ئەوان وایان لێکرد لە کۆتاییدا ئەو هەڵوێستە ڕکنە وەرگرێ، وایان لێکرد ژیانی تاوان و تاوانکاری هەڵبژێرێ..

ئێستاکە بەشێکی زۆری ڕێگەی بەرەو میدۆلین بڕیبوو، دەنگی زەنگی قوتابخانەی بە ئاستەم دەگەیشتە گوێ، لێرە کە زانی هەرگیزاو هەرگیز جارێکی دیکە ئەو دەنگەی گوێ لێنابێتەوە. فرمێسکی لە چاوان هاتەخوار. زۆر لەبەر دڵی گران بوو، بەلاّم بەملی داهاتبوو، مادام خەڵك ناچاریان کردبوو ڕوو لەو ژیانە بکات. دەبێ بیکات.. بەلاّم لێشیان دەبووری، لەگەڵ ئەو خەیالاّنە فرمێسکەکان زۆرتر و هەنسکی قووڵتربوون.

لەو دەمەدا چاوی بە جۆ هارپەری هاوەڵی گیانی خۆی کەوت. ڕووانینەکانی جۆ ئەوەی دەردەخست کە شتێکی دە دڵی دایە.. دیاربوو کە هەردووکیان هەرچەند بەگیان لێك جودان، بەلاّم بیر لەیەك شت دەکەنەوە، تۆم چاوی بە قۆڵی کراسەکەی سڕییەوە و هەندێ پرتە و بۆڵەی لێوەهات دەریدەخست، کە لەسەر هەلاّتنێ مکورِە و دەبێ ئەو ژیانە ناخۆشە و ئەو حاڵە بێ بەزەییە جێبێڵێ و بەرەو جیهانێکی فرەوان هەنگاو بنێ. بێ ئەوەی ڕۆژێك بیر لەوە بکاتەوە، کە بگەڕێتەوە نێو ئەو ژیانە پڕ کۆت و بەندە، لە کۆتایی قسەکانی هیوای خواست، کە جۆ لەیادی نەکات.

تۆم یەکجار سەرسام بوو، کە جۆ پێی ڕاگەیاندن ئەویش هەمان نیازی هەیە کە تۆم هەیەتی، بۆیەش هاتووە تا بیدۆزێتەوە و بڕیارە یەکجارەکییەکەی خۆی پێبڵێ.. چونکە دایکی زۆری بە قامچیان لێداوە، لەبەرئەوەی هەندێ سەرتووی خواردووە کە پێشتر نەیدیتبوو،

هیچیشی لەبارەوە نەدەزانی لای وابوو دایکی حەزی لێ ناکا و پێی خۆشە بڕوا و بەجێی بێڵێ، کە ئەوەش ئارەزووی دایکی بێ، ئەم بۆی جێبەجێی نەکا. ئاواتی ئەوەشی هەبوو کە دایکی هەمیشە ئاسوودە بێ و هەرگیز رۆژێك لەوە ژیوان نەبێتەوە، کە کوڕەکەی خۆی خستۆتە ناو ئەو دنیا بێ ئامانە تا بکەوێتە نێو ئەشکەنجە و ئازار و لە دووریدا بمرێ.

کاتێ هەردووکیان بەدڵتەنگییەوە لەپاڵ یەك دەڕۆیشتن، بەڵێنیاندا پشتی یەك بگرن و تا مردن لە کۆڵ ئەو ئازارانەیان دەکاتەوە لێکدانەبڕێ. ئەوجا دەستیان بە پلان دانان کرد، جۆ بڕیاریدا ببێتە خەڵوەتکێشێك کە لە بنەبانی ئەشکەوتێکی دووردا بە وردە شتان بژی، تا رۆژێك لەسەرمان و لە بێ بەشی و لە خەمان دەمرێ، بەڵام کە گوێی بۆ تۆم راگرت، هەستیکرد ژیانی تاوانکاریش تایبەتمەندیی خۆی هەیە و بڕیاریدا ئەویش ببێتە جەردە.

سێ میل لەخوار سانت پیتەرسپۆرگ و لە شوێنێکدا، کە پانایی رووباری میسیسیپی لە میلێك تێپەڕ دەبێ، دوورگەیەکی درێژ و باریکەڵە هەیە کە بەدارستان داپۆشراوە و بەربەستێکی لەلای سەری هەیە. لەوێ راوەستان و بە وردی تێیانڕوانی، کەسی تێدا نیشتەجێ نەبوو، دوور بەرەو کەناری ئەودیو هەڵکەوتبوو، بۆیە بڕیاریاندا دوورگەی جاکسۆن بکەنە پێگە و شوێنی سەرکێشییەکانیان لەباتی ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کێ بکەنە ئامانجی جەردەییەکەیان. چوونە دووی هەکلبێری فین و ئەویش یەکسەر بەگەڵیانکەوت، چونکە هەر کارێك بێ بۆ وی جیاوازی نییە. هەرسێك لێکدابڕان، بەو مەرجەی لەکاتی دیاریکراو کە نیوەشەوە لە شوێنێکی دوورە دەشتی سەرکەنار کە نێزیکەی دوو میل لە گوند دوور بوو پێك بگەنەوە و هەر یەکە پێداویستییەکانی خۆی بێنێ لەگەڵ ئەوەندە خۆراکەی، کە دەتوانێ لە ماڵی خۆیانی بدزێ، ئەدی بڕیاریان نەدابوو ببنە جەردە و یاسابەزێن. بەر لەوەی ئێوارە دابێ، بەدرێژایی و پانایی گوند، بانگەشەی ئەوەیان کردبوو، کە بەم زووانە هەواڵێکی سەیر دەبیستن. بە هەر سێکیشیان دەگوت، داوایان لێدەکرد، بێ دەنگ بێ و چاوەڕێکا.

دەوروبەری نیوەشەوێ تۆم گەیشت و دانە بەرازێکی کوڵاو هەندێ شتی بێقیمەتی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، چووە سەر بەرزاییەك کە بەسەر شوێنی دیاریکراویدا دەڕوانی، ئەستێرە لە ئاسمانێ دەبریسکانەوە و بێدەنگی هەموو لایەکی داگرتبوو، ئەو رووبارە مەزنەش دەتگوت زەریایە. تۆم ساتێك گوێی هەڵخست دەنگێکی نەبیست ئارامییەکە بشڵەژێنێ، فیتەیەکی دیاریکراوی لێدا، لە خوار بەرزاییەکەوە بەفیتەیەك وەڵامی دراوە. تۆم دوو فیتەی دیکەی لێدا و ئاماژەکانی وەك خۆیان وەڵامیان درایەوە. ئەوجا دەنگێك بەئاگادارییەوە پرسی:

- کێ لەوێیە؟
- تۆم سۆیەر، تۆڵەستێنی ڕەشی ئیسپانیان، ناوی خۆتان بڵێن.
- هاك فینی دەست سوور و جۆ هارپەری ترسی دەریا.
تۆم ئەو ناوانەی بۆ هەڵبژاردبوون و لەو کتێبانەی دەرهێنابوون کە حەزی لێدەکردن.
- باشە، وشەی نهێنیم پێ بڵێن
هەردووك پێکەوە بەدەنگێکی گڕگوتیان:
- خوێن
جا تۆم چی هێنابوو بۆی هەڵدانە خوارێ و ئینجا خۆشی بازیدا، شمەکەکانی دڕان و پێستەی داماڵا، بەلاٚم گوێی پێنەدا.. لەژێر بەرزاییەکەدا ڕێیەکی ئاسان دەوکەنار دەڕۆیشت، پێکەوە ئەو ڕێیەیان گرتەبەر، کە هیچ ئازار و ناخۆشییەکی جەردانی تێدا نەبوو.
ترسی دەریا پارچە گۆشتێکی زلی سوێرکراوی بەرازی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، بەلاٚم دەستی سوور لەگەنێك و هەندێ تووتنی دزیبوو و چەند دانە قەسەڵێکی هێنابوو تا بیکاتە قەلوون، بەلاٚم کەس لە هاوەڵە جەردەکانی پێشتر تووتنیان نەکێشابوو و نەشیانجووی بوو. تۆڵەستێنی ڕەش گوتی، ئەو سەرکێشییە بێ ئاگر دەست پێناکا. ڕاستیشی دەکرد، چونکە لەو ڕۆژانەدا بەزەحمەت کەس هەبوو بزانێ شقاتە چییە. سەد گەزێك سەرووتر ئاگریان بەسەر کەڵەکێکەوە بەدیکرد، لێی نێزیك کەوتنەوە و ئەمەیان کردە یەکەم سەرکێشی خۆیان. ناوە ناوە بەیەکتریان دەگوت، وس. لەناکاو هەموو ڕاوەستان و پەنجەیان بەسەر لێویانەوە بوو، دەستی خۆیان بۆ خەنجەرە خەیاڵییەکانیان درێژکرد و بەچرپە فەرمانیان پێکدەدا، "ئەگەر دوژمن سەری هەڵبڕێ بە خەنجەرەکەت بیکوژە"، "پیاوی مردوو ناتوانێ قسە بکا". زۆر باشیان دەزانی خاوەن کەڵەك چووینە گوند بۆ ئەوەی پێداویستیی بکڕن یاخۆ هەندێ کاتی تێدا بەسەربەرن. بەلاٚم ئەمەش بیانوو نەبوو تا کارەکەیان وەکو جەردان ئەنجام نەدەن، بۆیە کەڵەکەکەیان داگیرکرد و بۆ ناو ڕووباریان هەڵدا، تۆم بووە سەرکردە و جۆ سەوڵکەی پێشەوەی گرتە دەست و هاکیش ئەوەی دواوە. تۆم لە ناوەڕاستی کەڵەکەکە ڕاوەستابوو، قۆڵی لەسەر سینگی تێپەڕاندبوو، بەچرپە فەرمانی دەدا هاوڕێکانی:ـ
- بیهێننە بەربا
- بەڵێ بەڵێ گەورەم
- جێگیریکەن

- قایمە گەورەم
- با تۆزێك بەملادابێ
- تەواوە گەورەم

کە منداڵەکان کەڵەکەکەیان بە جێگیر و جارسانە بەرەو ناوەڕاستی رووبارەکە هاژوا، دەرکەوت کە ئەو فەرمانانە تەنها بۆ پۆز لێدان بوون دەنا هیچ مەبەستێکیان نەبوو.

- کەڵەکەکە چی هەڵگرتووە؟
- هەندێ دارکەشتی و ماسی
- چارۆگەکان هەڵدەن و سەوڵەکانتان دەرخەن و چوست و چالاك بن
- بەسەرچاو گەورەم
- یاڵلا هەموو شتێك قایم و جێگیرکەن
- جێگیرە گەورەم

کەڵەکەکە لە ناوەڕاستی رووبار تێپەڕی، کوڕەکان ئاڕاستەی پێشەوەکەیان بەرەو لای راست وەرچەرخاند، جا سەوڵەکانیان لەلایەك دانا.. ئاستی رووبار بەرزنەبوو، بۆیە خێرایی شەپۆلیش لە دوو یاخوود سێ میل تێپەر نەدەبوو، سێ چارەکە سەعات تێپەڕی کەسیان قسەیەکی نەکرد. لەو دەمەدا کەڵەکەکە بە بەردەم شارۆچکەکەدا گورزەی کرد، دوو سێ رووناکی لێوە دیاربوو، پیشانیان دەدا لە کوێیە و چۆن بە ئارامی نووستووە، بێ ئاگا لەوەی بزانن چ کارەساتێکی گەورە لەم ساتەدا لەناو ئاوێدا روودەدا. تۆڵەستێنی رەش بە جێگیری راوەستا بوو، باسکی تێکئاڵاندبوون و تەماشای کۆنە هەواری خۆشی و ناخۆشیانی دەکرد. زۆری حەزدەکرد ئەویش ئێستا بیبینێ، کە چۆن لە بەرزایی دەریاکاندا بەدڵێکی بوێرەوە رووبەڕووی مردن دەبێتەوە و خەندەی هەر لەسەر لێوانە. ئەمە دوایین جار بوو بەدڵێکی شکاو و قەناعەتمەندەوە تەماشایکا. دوو جەردەکەی دیکەش بۆ دواجار تەماشایان دەکرد و هەموو چاویان لەسەر گوند بوو، تا شەپۆل کەڵەکەکەی لە دوورگەکە دوورخستەوە، بەڵام زوو لێی وەئاگاهاتن و توانیان بۆ شوێنێکی ئارام لە سەرووی دوورگەکە بیهاژۆن. دەوروبەری دووی شەو، کاتێ لەکەنار گرتیاندا، پشکنیان تا بزانن چی تێدایە، چارۆگەیەکی کۆنیان دۆزییەوە، لەگەڵ خۆیان بردیان تا بەسەر ئەشکەوتەکەی دادەن و بیکەنە پەنا بۆ خواردەمەنییەکان، بەڵام بەخۆیان بڕیاریاندا ئەگەر کەشوهەوا خۆش بوو وەك جەردە و ئەشقیا لە دەرەوە بخەون.

ئاگرێکی گەورەیان لەپاڵ کۆمەڵە دارێك کردەوە، کە بیست سی هەنگاو لە لێواری دارستانێوە دووربوو. پارچە گۆشتێکی بەرازیان لەنێو لەگەنەکەدا کولاند و شێوی خۆیان خوارد، دڵیان گەلێك خۆش بوو، وایاندەزانی لە هەموو کۆتێك رزگاربوون و ئەم دوورگە دوورەدەست و چۆڵەیان داگیرکردووە. پێیان وانەبوو کەس رۆژێك بیربکاتەوە بۆ ئێرە بێ. گوتیشیان کە هەرگیز کەسیان روو لە ئاوەدانی ناکەنەوە. ئاگرە بەرزەکە رووی رووناك دەکردنەوە و پریشکی بەملا و بەولادا دەهاوێشت و دەپەڕییە سەر ئەو دار و درەختانەی دەوروبەریان.

کە دوا زویێری گۆشتەکەیان لرفکرد و دوا دەنکە دانەوێڵەیان خوارد. بەسەر گژوگیادا راکشان و دڵیان پڕ نەشئە و خۆشی بوو. دەیانتوانی شوێنێکی فێنکتر بدۆزنەوە، بەلاّم خۆیان لەو دیمەنە رۆمانسییەی کەمپەکەیان دوورنەخستەوە. جۆ گوتی:

-هەر ئاوا نییە کوڕینە؟

تۆم گوتی:

- ژیانێکی خۆش نییە! دەبێ ئەگەر کوڕان بمانبینن چ بڵێن؟ دەڵێن هەر دەمرن بۆ ئەوەی بێنە ئێرە.. وا نییە هاك؟

هەکلبێری گوتی: پێموایە.. هەر چۆنێك بێ، بۆ من گونجاوە، من شتێکم ناوێ لەمە چاکتر بێ.. چونکە من هەرگیز تێر خواردن نەبوویمە.. پاشان لێرە کەس ناتوانێ بێتە دوام و راوم بنێ.

تۆم گوتی:

- ئەم ژیانە بەدڵی منە، تۆ ناچار نیت بەیانیان زوو هەستی و ناتەوێ بچییە مەکتەب و دووچاری ئەو هەموو شتە بێکەڵکانە نابیت و کەس لۆمەت ناکا.. بەلاّم من بۆ جۆ خەمبارم، چونکە ئەگەر ببێتە خەڵوەتکێش ناچار دەبێ خۆی لە زۆر شتی خۆش بێبەشکا.

جۆ گوتی:

- وایە، راستە، بەلاّم وەك دەزانی من زۆرم بیر لێنەکردۆتەوە. هەرچۆنێك بێ ئێستا کە پێم باشترە ببمە جەردە، کە جەردەییم تاقیکردەوە.

تۆم گوتی:

- دەزانی خەڵکی ئەمڕۆ لەچاو پێشان کەم دەچنە خەڵوەتەوە. بەڵام جەردەکان هەمیشە جێگەی ڕێزن. بەڵام خەڵوەتکێش دەبێ لە رەقترین شوێن بنوێ و پەڕۆی دڕ و خۆڵەمێش بکاتە سەری و لەبەر باران راوەستێ.

هاك لێی پرسی: باشە بۆ پەڕۆ و مشکی لەسەری خۆیان دەئاڵێنن؟

- نازانم، بەڵام دەبێ وا بکەن. خەڵوەتکێش هەمیشە وان، جا ئەگەر تۆش ببییە یەکێ لەوان، دەبێ وەکو ئەوان بکەی.

هاك گوتی: من ئەمەم پێ قبووڵ ناکرێ

- باشە تۆ چ دەکەی؟

- نازانم، بەڵام ئەوەش ناکەم

- باشە بۆ نا هاك؟

- بۆ.. من هەر بەرگەی ناگرم، هەڵدێم

- هەڵدێی! باشە تۆ دەبییە خەڵوەکێشێکی خاوخلیچکی قشت، دەبییە مایەی شەرمەزاری.

دەستی سوور وەڵامی نەبوو، خەریکی پڕکردنی قەلوونەکەی بوو، پاشان پەنگرێکی هەڵگرتەوە و لە قەننەکەی نێزیك کردەوە تا تووتنەکە دایگرت. بە ئاسوودەییەوە ئەڵقە ئەڵقە ئەو دووکەڵە بۆنخۆشەی بەبادەکرد. دوو جەردەکەی دیکە ئیرەیی پێدەبرد و بیریان لەوە دەکردەوە لە ئایندە ئەوانیش دەست پێبکەن. هاك پرسی:

- ئەرێ دەبێ جەردە چ بکەن؟

تۆم گوتی:

- زۆرینەی کاتی خۆیان بە کەڵەگایی بەسەر دەبەن، کەشتیان داگیردەکەن و دەیانسوتێنن، پارە وەدەستدێنن و لە شوێنی ترسناکی سەر دوورگەی خۆیان حەشاری دەدەن، کە دێوەزمە و شتەکان چاودێری دەکەن و هەرکەسێکی لەسەر کەشتییەکان بێ دەیکوژن.

جۆ گوتی:

- بەڵام ژنەکان بۆ دوورگەکە دەهێننەوە و ژنان ناکوژن

تۆم گوتی:

- نا نایانکوژن، جەردە زۆر مەردن، ژنیش هەموو دەمێ جوانن

جۆ بە حەماسەتەوە گوتی:

- ئەدی جوانترین پۆشاکیش لەبەرناکەن.. هەموو بەرگیان بە زێڕ و زیو و ئەڵماس رازایتەوە.

هاك پرسی: کێ؟

- بۆ، جەردەکان..

هاك بەقێزەوە تەماشای جلە شڕەکانی خۆی کرد و بەدەنگێکی خەمینەوە گوتی:

- لام وایە جلوبەرگی من لە جەردان ناوەشێتەوە، بەڵام لەوانەم زیاتر نییە.

هەردوو کوڕەکەی دی پێیان گوت، هەر زوو دەبێتە خاوەن جوانترین و چاکترین پۆشاك، پاش ئەوەی سەرکێشییەکانیان دەستپێ دەکەن، ئەوەشیان تێگەیاند کە ئەو جلوبەرگەی وی بۆ سەرەتای سەرکێشییەکان زۆر گونجاوە، هەرچەند عادەتیش وایە کە جەردە دەوڵەمەندەکان، کە بۆ کار دەچن بەهادارترین جلوبەرگ دەپۆشن..

بەرەبەرە دەنگی هەر سێکیان کپ دەبوو و چاویان دەچووە خەوێ.. قەلوونەکە لە نێوان پەنجەی دەستی سوور کەوتە خوارێ و لە خەوێکی قووڵ ڕاچوو، وەك هەر کەسێکی ویژدان پاك کە تەواو ماندوو بێ. ترسی دەریا و تۆڵەستێنی رەشیش زەحمەتتر خەویان لێکەوت.. پاش ئەوەی بە دزی دوعاکانی خۆیان خوێند، چونکە کەسی لێنەبوو دەسەڵاتی هەبێ ناچاریان بکا بە ئاشکرا دوعا بخوێنن، لەسەر گژوگیا راکشان، لەڕاستیدا بیریان دەکردەوە هەر وازی لێ بێنن، بەڵام ترسان یەکجار وا دوور بڕۆن، نەوەك لەناکاو بروسکێك لێیاندا. کە چاویان بۆ خەوێ گرانبوو، ویژدانیان ورووژا، لەوەی دەترسان بەو هەڵاتنەیان گوناهێکی گەورەیان کردبێ، ئەوجا بیریان چووە سەر ئەو گۆشتەی دزیبوویان، ئازاری راستەقینەیان لەوێڕا دەستی پێکرد. دەیانویست ئەوە بکەنە بیانوو بۆ ویژدانیان، کە دەیان جار شەکرۆکە و سێویان دزیوە، بەڵام ئەو ویژدانە بەو بیانوانە قایل نەدەبوو. وایان بەخەیاڵ و ئەندێشەدا دەهات کە بردنی شەکرۆکە رفاندن بوو. بەڵام گۆشت بردن و شتی دیکەی بەهادار، دزییە.. ئەمەش حەرامە. جا بەڵێنیان بەیەکدی دا هەموو هەوڵی خۆیان بخەنەگەڕ تا جەردەیی بکەنە پیشەیەکی مەردانە و بەدزی کردن پیسی نەکەن.. ئەوجا ویژدانیان ئارامی گرت و چاوی ئەو دوو جەردە تازەکارە چووە خەوێکی قووڵ.

# پاژی چواردەم

کە سبەینێ تۆم لەخەو هەستا، سەری سوڕما و نەیزانی لەکوێیە، دانیشت و چاوەکانی هەڵگلۆفی و بەدەوروبەری خۆیدا ڕووانی، ئەوجا بەبیری هاتەوە، دەمە و کازیوەیەکی لێڵ بوو، هەستێکی بەچێژی بێدەنگی و ئارامی لەو خامۆشییەدا بوو، کە تەنانەت دارستانیشی داگرتبوو.. هیچ شتێك نەبوو ئارامی سروشت بشێوێنێ، نە گەڵایەك دەهەژا، نە ژاوەژاوی ئاوەدانی هەبوو،خوناو دڵۆپ دڵۆپ لەسەر پەلکی درەخت و گژوگیا وەستا بوو. چینە خۆڵەمێشێکی سپی ئاگرەکەی داپۆشتبوو، کەدووکەڵێکی باریکەڵەی شینی لێوە هەڵدەچوو و یەکسەر بە هەوایدا پەخش دەبوو، جۆ و هاکیش هێشتا نووستبوون.

ئێستا دوور لەنێو دارستاندا باڵندەیەك خوێندی و یەکێکی دی وەڵامی داوە، زۆری نەبرد ترقەترقی دارکونکەرە بیسترا، بەرەبەرە ڕەنگە لێڵەکەی کازیوە سپی بۆوە و دەنگی جۆراوجۆر دەرکەوتن و سیماکانی ژیان دەرکەوتن. سروشتی ناوازە خەوی لەخۆی داتەکاند و خۆی بۆ ئەو کوڕە ڕاماوە دەرخست. کرمێکی سەوزی چکۆڵە هات بەسەر گەڵای درەختێك گینگڵی دەخوارد و دوو لە سێی جەستەی بەرزدەکردەوە و دەوروپشتی خۆی بۆن دەکرد. ئەوجا دووبارە هاتەوە پێش و کە لە تۆم نێزیك کەوتەوە، وەکو بەرد جووڵەی لەخۆی بڕی. بەپێی هاتن و گەڕانەوەی ئەو ئافەریدەیە، ئاواتەکانی تۆمیش یاخۆ هەڵدەچوون یان دادەمرکان. لەدواییدا کاتە گرنگەکە هات، کرمەکە بیری کردەوە، پاشان نیوەی جەستەی خۆی لە هەوادا خوارکردەوە، هێندەی نەبرد خۆی بەرداوە سەرقاچی تۆم، ئەمیش زۆر بەوە دڵخۆش بوو، چونکە لەو ئەفسانانەی گوێی لێبووە، هاتووە کە کرم بەختێکی باشی پێوەیە و هەر کەسێکی کەمێکی لێوە نێزیك کەوێ، جلوبەرگی تازەی دەست دەکەوێ. لای وابوو ئەو جلوبەرگانەی دەستیشی دەکەون پۆشاکی گرانبەهای جەردانن.

ئێستا گەلە مێروویێك لە شوێنێکی نادیارەوە دەرکەوتن و بەرەو کاری خۆیان چوون، یەکێکیان نەبێ کە بەهێزی خۆی هەڵیدەدا تا ئەو جاڵجاڵۆکەیە هەڵگرێ، کە قەبارەکەی پێنج هێندەی خۆی بوو. بە قۆڵەکانی هەڵیگرتبوو، دەیویست بەسەر قەدی دارێکی هەڵگێڕێ. خاڵخاڵۆکەیەکیش بەسەر لکە گیایەکی درێژدا هەڵگەڕا، تۆم خۆی بەسەردا نووشتاندەوە و پێی

گوت: خاڵخاڵۆکه ماڵی خاڵم لەکوێیه.. خاڵخاڵۆکەکەش باڵی لێکدا و فڕی تا ماڵی خاڵی پیشاندا. ئەمەش لای تۆم سەیرنەبوو، چونکە لەمێژبوو بڕوای وابوو خاڵخاڵۆکە بەگوێی خەڵکی دەکا و ماڵە خاڵیان پیشان دەدا. پاشان قالۆچەیەك دەرکەوت کە بەقورسی تۆپەڵە پیسایییەکی غلۆردەکردەوە، تۆم دەستێکی دایە، قالۆچەکە قاچەکانی وێکهێنانەوە تا وا دەرکەوێ کە مردووە. لەو ساتەدا باڵندە و مێروو وردە وردە دەردەکەوتن، ئەو دەوروبەرە لە چریکەی باڵندان تژی ببوو.

قەلێکی زیقن هات و لەهەوای باڵەکانی لێکدا و پاشان بەخێرایی بەسەر لقەدارێکی نێزیك تۆم هەڵنیشتەوە، رووی وەرگێڕا تا بەبایەخەوە لەو بێگانانە بڕوانێ. پاشان سمۆرەیەکی بۆر هات و یەکێکی زلی ڕێوی ئاسای لەگەڵدا بوو، لەوێ هەڵقونجابوو، ناوە ناوە تەماشای کوڕەکانی دەکرد و لێیان و ورد دەبۆوە. پێدەچوو ئەو باڵندە و ئاژەڵە کێویانە پێشتر لەو دوورگەیە چ جاران مرۆڤیان نەدیبێ.. بۆیە نەیاندەزانی نە لەو خەڵکە بترسم نە لەگەڵیان رابێین. سروشت تێکرا وەئاگا هات و جووڵەی تێدا گەڕا، تیشکی درێژی خۆر بەناو گەڵاْ چڕەکانی درەختان دزەیان دەکرد. پەپوولە بەسەر گوڵاْندا نیشتنەوە و بەسەر ئەو دیمەنەدا باڵە رەنگینەکانیان لێك دەدا.

تۆم دوو جەردەکەی دیکەی وەئاگا هێنان، هەر سێك بەهاتوهاوار دوورکەوتنەوە. پاش یەك دوو خولەك جلەکانیان داکەنی و بەدوای یەککەوتن، لێرە و لەوێ ساتمەیان دەکرد، تا گەیشتنە ئەو ئاوە لێڵەی سەر بەربەستە زیخە سپییەکە، کەسیان غەریبی ئەو گوندە بچووکەیان نەدەکرد کە لەودیو ئاوێکی بەریندا نووستووە. شەپۆلێکی بەهێز یاخوود ئاو بەرزبوونەوەیەکی ساکار کەڵەکەکەی لێ دوورخستبوونەوە، دڵیان بەمە خۆش بوو، چونکە ئەو پردۆڵکەیەش رما کە بە ئاوەدانی دەبەستنەوە.

کە بۆ ئۆردوگەکەیان گەڕانەوە، چالاك و دڵخۆش و برسیبوون، دیسان بڵێسەی ئاگرەکەیان بەرزکردەوە. هاك کانیاوێکی ئاوی پاك و فێنکی لەو نێزیکانە دۆزییەوە. گەڵاْی دار بەرڕوویان لەباتی پەرداخ بەکارهێنا تا ئاوی پێ نۆشکەن. تامی ئەو ئاوە لەو دەوروبەرە جوانەدا وای لێکردبوون، پێویستییان بە خواردنەوەی قاوە نەبێ. جۆ خەریك بوو گۆشت بەرازەکەی بۆ بەرچایی قاش قاش دەکرد. هاك و تۆم داوایان لێکرد تۆزێ ئارام بگرێ، جا قولابەکانیان هەڵگرت و چوونە سەر رووبار و هێندەی نەبرد بەشی خۆیان ماسی پێوەبوو. جۆ ئارامی نەمابوو، بەر لەگەڕانەوەیان بە هێمنی شتێکی خۆشی دەچڕی. پشیلەماسییەکی بچووکیان

راوکرد، پێدەچوو بەشی خێزانێك بکەن. ماسییەکانیان لەگەڵ گۆشتەکە برژاند، سەرسام بوون چونکە هەرگیز ماسی ئەوەندە بەتامیان نەخواردبوو. نەیاندەزانی ئەگەر ماسی راوکراو دەمودەست سۆرکراوە تامی چاتر دەبێ. ئەوەشیان بۆ دەرکەوت کە هەموو شتێك لە شوێنی کراوەدا جیاوازە، نووستن و مەشقکردن و خۆشووشتن و تەنانەت برسیبوونش.

دوای نانی بەیانی ئەوان لە سێبەرێك لێی راکشان و هاکیش خەریکی قەلوونکێشانێ بوو. پاشان بۆ شارەزابوون بەرەو دارستان چوون. پێیان لە پارچەداری رزیو دەنا و بەسەر گژوگیا تێك ئالاوەکەدا دەرۆیشتن. دارسێوەکان دەتگوت پاشای دارستانن و هێشووە ترێکانیان دەتگوت تانجە سەر بەرەو ژێر شۆڕبۆتەوە. لەسەر ئەو خاکە پیاسەیان دەکرد، کە مافوری گژوگیای بەگوڵزاری رازاوە داپۆشرابوو.

زۆر شتیان دۆزییەوە دڵی خۆشکردن، بەلاّم مایەی سەرسامبوونیان نەبوون. زانیان کە دوورگەکە نێزیکەی سێ میل درێژە و چارەکە میلێك بەرینە و جۆگەلەیەکی تەنگ لەکەنار جیای دەکاتەوە، کە دوو سەد یاردە دەبێ و نابێ. کە هەر ساتێك دەتوانن بەمەلە لێیدەن. پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ گەڕانەوە ئۆردووگەکەیان زۆر برسیبوون، نەیانتوانی بۆ ماسی گرتن بوەستن. بۆیە گۆشت بەرازەکەیان بەساردی دابەرێ، ئەوجا خۆیان هاوێشتە بەر سێبەرێك و دەستیان بە قسان کرد.بەلاّم زوو لە قسان بێزاربوون و لێك بێدەنگبوون. ئەو کپ و خامۆشی و هەستی تەنیایی و غوربەتە دەروونی پڕ دڵەڕاوکێ کردن. بۆیە غەریبییان هەستا، تەنانەت هاکی دەست سووریش خەیاڵی بەر دەرگە و تەویلەی بەرازانی دەکرد،بەلاّم هەموویان شەرمیان لەو لاوازییەی خۆیان دەکردەوە و کەسیان نەوێران باسی خەیاڵەکانیان بکەن.

پاش ماوەیەك گوێیان لە دەنگێکی نامۆ و سەیر بوو کە لە دوورەوە دەهات. هەروەك ئەوەی مرۆڤ چرکەی سەعات دەبیستێ و گوێی ناداتێ، بەلاّم ئەو دەنگە نامۆیە وای لێهات ئەوەندە بەهێز بوو، نەیانتوانی پشتگوێی بخەن. کوڕگەل راپەڕین و هەرکەسی تەماشای ئەوی دیکەی کرد و گوێیان هەڵخست.. بۆ ساتێك بێدەنگییەکی قووڵ هەموو لایەکی داگرت، پاشان رمبەیەك هات لەو ناوە دەنگی داوە.

جۆ بەهەناسەبڕکێوە گوتی:

- ئەوە چییە؟

تۆم بەچرپە گوتی:

- من سەرم سوڕماوە

هەکلبێری بەشپرزەییەوە گوتی:

- گەواڵە نییە.. چونکە گەواڵە..

تۆم قسەکەی پێ بڕی:

- هاك! گوێ بدێ.. قسەکەیە.

ماوەیەك چاوەڕوانبوون کە دەتگوت عومرێکە، دیسان رمبەیەکی دی ئەو کشوماتییەی هەژاند.

- با بچین بزانین چییە؟

هەستانە سەرپێ و بەپەلە بەرەو کەناری روو لە شارۆچکەکە چوون. دەوەنەکانیان لێکدابڕی و تەماشای سەر ئاوییان کرد. کەڵەکە بچووکەکەیان دیت نێزیکەی میلێك دوور لەگوندی لەگەڵ شەپۆلان دەلەراوە. کەناری ئەوبەریش زۆر قەرەباڵغ بوو. ژمارەیەکی زۆر بەلەمیش لە نێزیك کەڵەکەکە بوون، بەڵام کوڕەکان نەیانزانی ئەو خەڵکەی سەر بەلەمەکان چ دەکەن. لەناکاو دووکەڵێکی سپی لەلای کەڵەکەکە بەرزبۆوە، زۆری نەبرد پەرت بوو و بووە پەڵە هەورێکی سست و هەمان دەنگ و رمبەکەش کەوتە بەرگوێیان.

تۆم گوتی:

- من ئێستا دەزانم.. یەکێك خنکاوە.

هاك گوتی:

- راستە، کە بیل تێرنەر پار هاوینێ خنکا، دیتم وایانکرد، تۆپیان بەسەر ئاوێدا هاوێشت، ئەمەش وایکرد سەرئاو بکەوێ. هەروەها هەندێ نان دەهێنن و جیوەی تێدەکەن و دەیخەنە ناو ئاو و سەردەکەوێ، چونکە لایان وایە ئەو نانانە دەچنە ئەو شوێنەی کەسەکەی تێدا خنکاوە و لەوێ رادەوەستن.

جۆ گوتی:

- بەڵێ، منیش ئەمەم بیستووە، پێم سەیرە ئەو نانە چۆن وادەکا.

تۆم گوتی:

- نانەکە وا ناکا، بەڵکو ئەوە کاری ئەو شتانەیە، کە خەڵك بەسەر نانەکەیدا دەخوێنن پێش ئەوەی هەڵیدەنە ناو ئاوێ.

هاك گوتی:

- بەڵام من چەند جارم بەخۆم دیوە، قەت کەس هیچ ناڵێ

تۆم گوتی:

- ئەوە سەیرە، رەنگە لە دڵی خۆیان تەلیسمەکانیان بخوێنن، دڵنیاشم وا دەکەن. هەموو کەسێك دەتوانێ ئەمە بزانێ.

دوو کوڕەکەی دی قسەکانی تۆمیان پێ باش بوو، چونکە رێی تێناچێ پارچە نانێکی هیچ نەزان بەبێ تەلیسم بەو زیرەکییە رەفتار بکا، لەو دەمەی ئەو ئەرکە قورسەی پێڕادەسپێرن.

جۆ گوتی:

- بە نەفرەت بی شەیتان، خۆزگە منیش لەوێ بام.

هاك گوتی:

منیش هەرچی هەمە دەیدەم بەس بزانم کێ خنکاوە.

کوڕەکان گوێیان راگرتبوو سەیریان دەکرد، لەناکاو تۆم بیرێکی بۆ هات، هاواری کرد:

- کوڕینە، دەزانم کێ خنکاوە.. ئەوە ئێمەین!

یەکسەر هەستیانکرد پاڵەوانن، ئەوە سەرکەوتنی راستەقینەیە، هەموو خەڵك یادیان کردوون و بۆیان دڵتەنگبوون..دڵەکان بۆیان خەمبارن و چاوەکان فرمێسکیان بۆ دەڕێژن. بێگومان ئەو کەسانەی خراپەیان لەگەڵدا کردوون ئێستا ئازار دەچێژن، پاش ئەوەی بەبیریان دێتەوە چۆن بێ بەزەییانە رەفتاریان لەگەڵدا دەکردن. لە هەمووش گرنگتر ئەوەیە ئێستا هەموو گوند باسیان دەکا و کوڕانی دی ئێرەییان پێدەبەن. بۆیە بۆیان دەرکەوت، کە جەردەیی کارێکی گرنگ و شایستە.

کە تاریکی داهات، کەڵەکەکە گەڕایەوە شوێنی خۆی و بەلەمەکانیش ونبوون. جەردەکان گەڕانەوە خێوەتگە، پڕ فیز و لە خۆباییبوون ببوون، لەبەر ئەو کێشە و هەراوزەنایەی دروستیان کردبوو، ماسیان راوکرد و شێویان لێنا و خواردیان، ئەوجا بیریان لەوە کردەوە، کە خەڵکی گوند ئێستا چۆن لەبارەیانەوە دەدوێن و وێنەی ئەو بێ ئارامییەیان دەهێنا بەرچاو، کە بەهۆی بزربوونیان هەموو خەڵکی گوندی گرتۆتەوە بەتێڕوانینی خۆیان زۆریش ئاسوودەبوون. بەڵام کە شەویان لێداهات.، وازیان لەقسان هێنا و چاویان بڕیبووە ئاگرەکە و خەیاڵی هەر یەکەیان بەلایەکدا چوو و زەوقیان نەما. تۆم و جۆ نەیانتوانی خۆیان لە غەریبی ماڵەوە ببوێرن. زۆری نەبرد ئەو غەریبییە بووە شپرزەبوون و دڵتەنگی، بێ ئەوەی ئاگایان لێبێ ئاخ و هەناسەیان هەڵدەکێشا.. بەرەبەرە جۆ بە ئاگەدارییەوە چووە ناو باسی هەستی خەڵك، کە دەیانبینن دوای ئەو سەرکێشییەیان دەگەڕێنەوە.. ئێستا نا.. بەڵام..

تۆم ئەو بیرۆکەی بەدڵ نەبوو هاکیش کە تاکو ئێستا بێدەنگ بوو هاتە پاڵ تۆم و رەتی کردەوە. جۆ خێرا هەڵوێستەکەی روونکردەوە و دڵنیایکردنەوە کە هەرگیز سۆزی ماڵەوەی نەبووە، بەم جۆرە یاخیبوونەکەیان بەکۆتا هێنا.

کە شەو تێپەڕی، وەنەوز یاری بەچاوەکانی هاك دەکرد، زۆری نەبرد پرخەی لێ بەرزبۆوە، پاش ئەویش جۆ خەوت، بەلاّم تۆم لەسەر زگ راکشابوو، هەنیشکی چەقاندبوو و جووڵەی لە خۆبڕیبوو. ماوەیەك بەبایەخەوە دەیڕوانییە هاوەڵەکانی، پاشان هەستاوە سەر چۆکان و چوو تا لەنێو گیادا و لەبەر رووناکی ئاگرەکەدا بگەڕێ. چەند پارچەدارێکی تەنکی لوولدراوی هەڵگرتەوە، دووانی لێ هەڵبژاردن کە زانی بەکەڵکی دێن. جا لە نێزیك ئاگرەکە چۆك دادەدا و بە شتێکی تیژ لەسەر هەر یەك لەو پارچانە شتێکی نووسی. پاشان یەکێکی لوولداوە و خستییە نێو گیرفانی چاکەتەکەی، ئەوی دیکەشی خستە نێو کلاّوی جۆ، پاش ئەوەی کەمێك لە خاوەنەکەی دوورخستەوە. هەروەها هەندێ گەنجینەی قوتابخانەشی خستە ناو کلاّوەکە، کە زۆری لا خۆشەویست بوون، لەوانەش پارچە مەڕمەڕێك.. ئەوجا بەسەر پەنجەی پێیان رۆیشت و لەناو داران دوورکەوتەوە تا دڵنیابوو کە نایبیستن، لەوێوە بەغار هەڵیکوتا لای بەربەستە زیخەکە.

# پاژی پازدەم

پاش چەند خولەکێك تۆم ملی بەلێلاوەکە وەنا و رووی لە لێواری ئیلینۆی کرد. بەر لەوەی قوولاییەکە بگاتە ناوەڕاستی نیوەی ڕێگەکەی بڕیبوو، ئەوجا شەپۆلەکان توندیان کرد و ئەویش بەمتمانەوە سەد گەزەکەی دیکەی بە مەلەوانی بڕی، هەرچۆنێك بوو لەکۆتاییدا گەیشتە کەنار و زۆرگەڕا تا شوێنێکی نزمی دۆزییەوە خۆی لێهەڵدا دەرێ، دەستی لەگیرفانی راکرد و تەلیشەدارەکەی دەرهێنا و کەنار و قەدئاوی گرت و بە دارستانێدا چوو. کەمێك پێش سەعات دە چووە لاتێکی رووتەن لە بەرامبەر گوندەکە، دیتی کەڵەکێکی هەڵمین لە سێبەری داران و لای کەنارە بەرزەکە لەنگەری گرتووە. هەموو شتێك لەژێر جریوەی ئەستێرەکاندا کپ و ئارام بوو. تا گەیشتەوە کەنار رووبار لەسەر زگ خشی و بە ئاگەدارییەوە لە هەموو دەوروبەری خۆی دەڕوانی، ئەوجا خۆی شۆڕکردەوە ناو ئاوێ و کەمێك مەلەی کرد تا گەیشتە کەڵەکەکە و خۆی تێهاوێشت و لە پەنایدا خۆی مات کرد.

پاش کەمێك زەنگی کەڵەکەکە لێیدا و یەکێك فەرمانی بەڕێکەوتنی دا، یەك دوو خولەکی پێچوو کەڵەکەکە جوولاو بەڕێکەوت. تۆم شادمان بوو کە سەرکەوتنی وەدەست هێنا. چونکە دەیزانی ئەمە دوا گەشتی ئەمشەوی ئەم کەڵەکەیە. پاش چارەکە سەعاتێکی دوورودرێژ کەڵەکەکە راوەستا و تۆم لە پەناگەکەی هاتە دەرێ و خۆی هەڵدا ناو ئاوێ و بەو تاریکییە تا کەنار مەلەی کرد و نێزیکەی پەنجا گەز لە دووری کەڵەکەکە لە ئاوێ هاتەدەر، نەوەك کەس بیبینێ.

بە هەندێ رێگەی لاچەپدا چوو، پاش کەمێك خۆی لەبەردەم پەرژینی پشتەوەی ماڵی پووری دۆزییەوە، پێهەڵگەڕا، گەیشتە پەنجەرە و تەماشای ژووری دانیشتنی کرد، چونکە ئەوێ رووناك بوو. دیتی وا پوورە پۆلی و سید و ماری و دایکی جۆ هاپەر پێکەوە کۆبووینەوە و قسان دەکەن، لەپاڵ چارپایەکە دانیشتوون کە کەوتبووە نێوان ئەوان و دەرگەی ژوورەکە. تۆم هێدی لە دەرگە نێزیك کەوتەوە و بێ خشپە سورگییەکەی داکەلاند و بەهێواشی پاڵی پێوەنا و کەمێکی کردەوە، پاشان بەئاگەدارییەوە پاڵێکی دیکەی پێوەنا، هەرچەند جاری جیڕەی لێوە

دەهات ئەو لەجێی خۆی رادەپەڕێ، ئەوەندەی کردەوە بتوانێ بەسەرچۆکان پێیدا تێپەڕێ، سەری بردە ژوور.

-پووری گوتی:

-ئەرێ ئەوە ئاگری مۆمەکان بۆ وا دەلەرزن؟

تۆم خێرا چووە ژوورێ. پووری تێیهەڵکردەوە

-ئەوە چییە، پێموایە دەرگە کراوەتەوە.. بەڵێ، کراوەتەوە. ئەو شتە سەیرانە هەر کۆتاییان نایە، سید هەستە پێیوەدە.

تۆم لەکاتێکی گونجاودا لەبن چارپایەکە ونبوو. دەمێك خۆی ماتکرد تا هەناسەیەك بدا. ئەوجا خشییە پێش تا لە پێی پووری نێزیك کەوتەوە و ئەوەندەی نەمابوو پێی بکەوێ. پوورە پۆلی گوتی:

-هەروەك گوتم، تۆم شەڕانگێز نەبوو.. تەنیا بزۆز بوو، تەنیا پەل بوو، نەیدەویست دڵم بشکێنێ، هەرگیز مەبەستی نەبوو کەس ئازار بدا، دڵیشی لە هەموو منداڵان باشتر بوو، نابێ هەموو شتێکی بخەینە ملی. ئەوجا دەستی بەگریان کرد.

-جۆی کوڕی منیش هەروا بوو.. هەموو دەمێ شەیتانی دەکرد هەموو بەدکارییەکی دەکرد، بەڵام هیچ منانی نەبوو تا پێی دەکرا باش بوو. خوا لێم ببورێ کە لەبەر قەیماغ خواردن قامچیکاریم دەکرد. کە من لەبیرم چوو بوو فڕێیدەم، چونکە ترشا بوو. بەڵام من چ جاری دی لەم دنیایە نایبینمەوە.. هەرگیزاوهەرگیز، وەیش ئەو کوڕە هەژارە بەدبەختەم. ئەوجا خاتوو هارپەر وای لە پڕمەی گریانێ دا دەتگوت دڵی لەگەڵ هەڵدەتەکێ.

سید گوتی:

- ئاواتەخوازم تۆم لە هەر کوێیەکە ئاسوودە بێ، بەڵام دەبوایە باشتر..

پووری قسەکەی وا لەناکاو پێ بڕی تۆم هەستی کرد پووری چۆن بەتووڕەیی تەماشای سید دەکا، گوتی:

- تۆمی من لێرە نەماوە، کەس وشەیەکی پێنەڵێ. خودا چاوەدێری بێ، بەڕێز تۆ خۆتی بۆ تەنگاو مەکە! وای خاتوو هارپەر نازانم چۆن لەبیری بکەم و خۆم بدەمە دەست قەدەر. نازانم، خۆ ئەو مایەی حەسانەوەی دڵم بوو، هەرچەند هەندێ سەرکێشی دەکرد کە ئازاری دەدام.

- خوا دەیدا و خوا دەیباتەوە، ناوی خوا بەرز و پیرۆز بێ، بەڵام زۆر زەحمەتە، شەمووی رابردوو جۆی کوڕم تۆنترەقەیەکی لەپێش کەپووم تەقاند، زللەیەکی خراپم لێدا. من ئەو کات هیچم نەدەزانی.. چەند.. زوو بوو، ئەگەر ئەو رۆژە بگەڕێتەوە تێر لە ئامێزی دەگرم.

- بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ، چاك دەزانم هەست بە چ دەكەی خاتوو هارپەر، چاك دەزانم هەست بە چ دەكەی.. هەر دوێنێ نیوەڕۆ بوو، تۆم پشیلەكەی گرت و دەرمانی ژانكوژی پێدا، وامزانی ئەو پشیلەیە ئێستا ماڵەكە وێران دەكا.. خوا لێم ببورێ، من كەشكەكی خراپم لەسەریدا.. كوڕە هەژارەكەم.. بەڵام ئێستا لە دەرەوەی هەموو ئەو كێشانەیە، دوا وشەش كە من لێم بیست سەركۆنە بوو.

ئەو یادەوەرییە بۆ ئەو پیرەژنە زۆر قورس بوو، بۆیە لە پرمەی گریانیدا. تۆمیش لەوكاتە لە هەموو دەمێ زیاتری سووی لەخۆی بوو. گوێی لە ماری بوو دەگریا و ناوە ناوە قسەیەكی دەكرد، دەردەكەوت چەندی سوێ لێیە. خۆی لە هەموو كاتێ خانەدانتر هاتە بەرچاو. زۆر كاریگەر ببوو بەو خەمە زۆرەی پووری لێی دەخوارد، حەزی دەكرد لەبن چارپایەكە دەرپەڕێ و تێر تێر ماچی كا.. بەڵام خۆ بەزل زانینە سروشتییەكەی نەیهێشت و خۆی ڕاگرت.

تۆم لە گوێ گرتن بەردەوام بوو لە گفتوگۆی ژنەكان تێگەیشت، كە لە سەرەتا وایانزانیوە كە ئەو كوڕانە بۆ مەلە چووینە و خنكاون. پاشان زانیویانە كەڵەكەكە بزر بووە. ئەوجا چەند كوڕێك ئەوەیان دركاندووە، كە ئەو كوڕانە گوتوویانە، كە لەم زووانە گوند هەواڵێكی گرنگ دەبیستێ، بۆیە زانیویانە كە ئەوان بە كەڵەكەكە هەڵاتوون و ئەوەندەش نابا لە شارێكی نێزیك دەردەكەون. بەڵام دەمەو نیوەڕۆ كەڵەكەكە دۆزراوە كە پێنج شەش میل لەخوار گوندەكە بەر لێواری میسیسیپی كەوتبوو. بۆیە هەموو دڵنیابوون لەوەی كوڕەكان خنكاون، ئەگەرنا خۆ هەر لە برسانیش با ئێوارێ دەهاتنەوە، ئەوە ئەگەر پێشتر نەهاتباناوە. پێشیان وابوو گەڕان بەدوای جەستەكانیان هەوڵێكی بێ سوودە، چونكە ئەگەر خنكا بن، بێشك لە ناوەندی شەپۆلەكەدا خنكاون، چونكە ئەوان مەلەی دەزانن و ئەگەر شەپۆل ڕاینەماڵیبن، ئەوا دەیانتوانی بەسەلامەتی بگەنەوە ماڵێ. ڕووداوەكەش لە شەوی چوارشەم بووە، خەڵكی گوند وایان خەملاندووە كە ئەگەر تا ڕۆژی یەكشەم دەرنەكەون. تەمای دۆزینەوەیان نامێنێ. بۆیە لەبۆ بەیانی نوێژی مردوویان لەسەر دەكرێ. تۆم ڕاچەنی.

خاتوو هارپەر بەگرانی هەستاوە و هەردوو ژن بەگریان دەستیان لەملی یەكتر كرد. هەر یەك هەوڵیدا دڵی ئەوی دی بداتەوە، تا لێك جودابوونەوە. پوورە پۆلی كە سید و ماری بۆ ناو نوێن بەڕێكرد هێند ناسك بوو، قەت وا نەبوو، تۆم تێبینی كرد كە سید لووتی هەڵبڕیوە، بەڵام ماری بەكوڵ دەگری.

پووره پۆلی دانەوییەوە سەرچۆکانی و زۆر بەگەرمی نزای بۆ تۆم دەکرد. وتەکانی خۆشەویستییەکی بێ پایانیان پیشان دەدا، دەنگیشی زۆر کاریگەر بوو، تەنانەت بەر لەوەی پووری تەواو بێ تۆم خۆی پێنەگیرا و هۆن هۆن فرمێسکی لە چاوی هاتەخوار. کە پووری چووە سەرجێ، ناوە ناوە زۆر بەتوندی هەناسەی هەڵدەکێشا و تەنیشتەکانی خۆی دەگۆڕی و ئاخ و ئۆفی بوو، بۆیە تۆم ناچاربوو ماوەیەکی زۆر خۆی بێدەنگ کا.. بەلاّم دوایی پووری خەوی لێکەوت، ئەوجا ئەویش لە مۆڵگەکەی هاتە دەرێ و لەپاڵ چارپایەکە راوەستا و بەدەستی سێبەری لەمۆمەکە کرد و لە پووری وردبۆوە، سۆزی زۆر بۆ بزوا، پاشان لولەکە نووسراوەکەی لەگیرفانی دەرهێنا و لەپاڵ مۆمدانەکەی دانا، بەلاّم شتێکی بەخەیاڵدا هات، وای لێکرد دەمێك ئارامبگرێ، ئەوجا خێرا لولەکەکەی خستەوە گیرفانی و ئاسوودەیی لە رووی دەرکەوت، چونکە گەیشتبووە بڕیارێك. دواتر خۆی نوشتاندەوە و بەهێمنی لێوی پوورە نووستووەکەی ماچکرد، ئینجا هێدی لەدەرگەوە دزەی کرد و سورگییەکەی داخستەوە.

گەڕاوە شوێنی لەنگەری کەڵەکەکە، دیتی کەسی تێدا نییە، ئازایانە بەسەر کەوت، چونکە چاك دەیزانی کە پاسەوانە پیرەکە هەر فورسەتی بوو هەوڵ دەدا سەرخەوێکی قووڵ بشکێنێ، کە حەزدەکا تا هەتایە بەردەوام بێ. ئەو زنجیرانەی کردەوە کە کەڵەکەکەیان بەکەنار دەبەستەوە. هەر زوو تا میلێك لە دێ دوورکەوتەوە، بەهێمنی سەوڵی لێدا. لەوێ چالاکانە کەوتەکار تا بەئاسانی بگاتە ئەوبەر، لەو کارە راهاتبوو، زۆریشی حەزدەکرد کەڵەکەکە داگیرکا، بەخۆی دەگوت: کە دەکرێ ئەم کەڵەکە بە کەشتی دابنێن. بۆیە دروستە جەردەی دەریا داگیریکا. دەشیزانی ئەوەندە نابا خاوەنەکەی دنیا بەدوایدا دەگەڕێ و رەنگە ئەمەش بەزمی خۆی هەبێ و دۆستەکان هەڵماڵێ، پاشان لێی دابەزییە سەرکەنار و وازی لێهێنا، جا خێرا گەڕایەوە ناو دارستان.

دەمێك دانیشت تا بحەسێتەوە، خۆی خەریك دەکرد تا وەئاگا بمێنێتەوە، پاشان رووی کردەوە ئۆردووگە، شەویش لەسەر تەواوبوون بوو، کە گەیشتە بەربەستەکە رۆژهەلاّت بوو، دیسان هەستاوە تا خۆر گەییە نێوەندی ئاسمانێ، ئەوجا زێیەکەی بە مەلە بڕی و پاش دەمێك بەجلوبەرگی تەڕەوە گەیشتەوە دەروازەی ئۆردووگە و بەسەر ئەو قسانەدا چوو کە جۆ بە هاکی دەگوت.

-نا.. تۆم کوڕێکی مەردانەیە و دیسان دەگەڕێتەوە.. هەڵنایە، چونکە دەزانێ هەلاٚتن بۆ جەردان نەنگییە. تۆمیش لەولایەنە زۆری را لەخۆیە. دلٚنیامە چووە شتێکمان بۆ بێنێ.. بەلاٚم ئێستا نازانم چییە.

- هەر چۆنێك بێ، ئێستا شتەکان مولٚکی ئێمەن.. وانییە؟!

-نێزیکە بەلاٚم جارێ نا هاك، نووسینەکە دەڵێ ئەگەر تا کاتی بەرچایی نەهاتەوە دەبنە هی خۆمان.

تۆم هاواری کرد و هاتەوە ناو ئۆردووگە:

- وا هاتمەوە

پێکەوە بەرچاییەکی زەریفیان کرد، کە لە قاورمەی بەراز و ماسی پێکهاتبوو. تۆم سەروبەندی سەرکێشییەکەی بەتاموخوێیەکی زۆرەوە بۆ هاوڕێکانی گێڕاوە، کە تەواو بوو، هەموو هەستیان دەکرد پاڵەوانن، پاشان تۆم خۆی کوتا گۆشەیەکی نسێ تا تانیوەڕۆ بنوێ، جەردەکانی دیش خۆیان بۆ گەڕان و راوەماسی سازکرد.

# پاژی شازدەم

پاش نیوەڕۆ خواردنیٚ، چوون تا بەدوای هێلکەی کیسەڵدا بگەڕێن. دارێکیان بەدەستەوە بوو لە لمیان دەچەقاند و هەر جێیەکی فشۆڵیان دۆزیباوە، بەسەر چۆکاندا دەهاتن و بەدەستی هەڵیان دەکۆڵی. هەندیٚ جار پەنجا شەست هێلکەیان لەیەك قۆرت دەدیتەوە. هێلکەکانیش تەواو خڕبوون و رەنگیان سپی بوو، کەمێك لە گوێزی ئینگلیزی بچووکتربوون. ئەو شەوە ژەمێکی بەتامی هێلکەی برژاویان خوارد بۆ بەیانی کە هەینی بوو هەروەتر.

کە نانی بەیانیان خوارد چوونە سەر بەربەستە لمینەکە و لەویٚ هەراوزەنا و هەڵبەزە و دابەزی زۆریان کرد و یەکتریان راودەنا و لەکاتی غاردانیٚ پارچە پارچە جلەکانیان دادەکەند و رووتدەبوونەوە، ئەوجا لە راونانی یەکتری بەردەوامبوون و دەچوونە ناو لێلاٚوەکە و خۆیان دەخستەبەر تەوژمە بەهێزەکە و هاوسەنگی خۆیان لەدەست دەدا و رووەوڕوو دەکەوتنە ناو ئاویٚ و بەمەش دڵیان زیاتر خۆش دەبوو، جارجارەش خڕدەبوونەوە و شەڕە ئاویان دەکرد و بە لەپان ئاویان پێکدادەکرد، هەر یەك هەوڵی دەدا هاوسەنگی ئاوی دی تێکدا و پێکەوە دەکەوتنەوە ناو ئاویٚ و دەست و پیٚ سپیلکەکانیان تێکدەئالاٚ، ئەوجا پێکەوە سەرئاو دەکەوتنەوە و پێدەکەنین و پێکڕا هەناسەیان دەدا.

کە تەواو کەشەنگ دەبوون، غاریان دەدا دەریٚ و خۆیان لە لمە گەرم و وشکەکە دەگەوزاند و لەویٚ پاڵیان دەداوە و خۆیان بەخۆڵەپۆکی دادەپۆشت، کە دەحسانەوە دووبارە تیٚهەڵدەچوونەوە. لە کۆتاییدا وایان بۆ دەرکەوت کە مەبەستە رووتەکانیان بە هی قۆشمەچییەکان دەچیٚ، بۆیە بازنەیەکیان لەنێو زیخەکەدا کێشا و کردیانە سێرك و هەر سێك تیایدا بوونە قۆشمەچی، چونکە کەسیان ڕێی نەدەدا ئەو شانازییە تەنیا بە یەکێکیان ببڕیٚ.

پاشان دەستیان بەیاری جۆراوجۆر کرد، تا بێزاربوون یاریانکرد. پاشان جۆ و هاك دووبارە چوونە ناو ئاویٚ، بەلاٚم تۆم نەچوو، چونکە لەکاتی داکەندنی شەرواڵەکەی نوشتەیەکی لیٚ بزرببوو کە لای وابوو لە هەموو شتێکی ترسناك دەیپاریٚزیٚ، بۆیە تا نەیدۆزێتەوە ناوێریٚ مەلەبکات و نەیدەزانی بیٚ پارێزگاری ئەو تەلیسمە چەند دەتوانیٚ مەلە بکا بەر لەوەی

ماسولکەکانی لە کاربکەون. منداڵەکانی دیکەش ماندووبوون و ئامادەی حەسانەوە بوون، هەر یەك بەلایەکداچوو تا بەرەبەرە لێك دووركەوتنەوە و هەر یەکەیان بەشەوق و سۆزەوە تەماشای ئەوبەری رووبارە بەرینەکەی دەکرد کە گوندەکەی لێبوو. تۆم بێ ئاگا خەریك بوو بە پەنجەی پێی ناوی بێکی لەسەر لمەکەدا دەنووسی، بەلاَم زوو سڕییەوە و لە لاوازییەکەی خۆی تووڕە بوو، بەلاَم دووبارە خۆی پێنەگیرا و نووسییەوە.. دووبارە سڕییەوە، بەلاَم بەخۆی نەدەوەستا، بۆیە بانگی کوڕەکانی دی کرد و بەگەڵیان کەوت.

جۆ هەر بەتەواوی رووخابوو، ئەوەندەی غەریبی ماڵێ دەکرد چیدی خۆی پێنەگیرا و فرمێسکی لە چاوان قەتیس ما. هاکیش خەمبار بوو، تۆمیش دڵی داخورپا بوو، بەلاَم زۆری هەوڵدا لێی دەرنەکەوێ.. رازێکیشی لە دڵیدا بوو کە هێشتا ئامادە نەبوو بیڵێ. بۆیە بڕیاریدا هەڵیگرێ تا ئەوکاتەی هاوەڵەکانی لێ یاخی دەبن. بەدڵخۆشییەکەوە گوتی:

- مەرج دەکەم ئەو دوورگەیە پێشتر جەردەی تێدا هەبووە، بۆیە دووبارە دەیپشکنینەوە، چونکە گەنجینەیەکیان لە جێگەیەکدا شاردۆتەوە. دەبێ هەستتان چۆن بێ کە کۆنە سەندوقێکی پڕ زێڕ و زیو بدۆزینەوە.. ها؟

بەلاَم ئەمە تەنیا کەمێك حەماسەتی بزواندن کە هەر زوو بزربوو، کەسیش وەلاَمی نەداوە، تۆم یەك دوو هەوڵی دیکەشیدا تا بیانوروژێنی، بەلاَم بێ سوود بوو، جۆ خەریکبوو چیلکەی لە لم وەردەدا و زۆر خەمۆك دیار بوو، لەدواییدا گوتی:

- کوڕینە با ئەوەندە بەس بێ، دەمەوێ بچمەوە ماڵێ، ئێرە زۆر تەنیاییە.

تۆم گوتی:

- نا.. جۆ بەرەبەرە باشتر دەبی، تەنیا بیر لە راوەماسی ئێرە بکەوە

- گوێ نادەمە راوەماسی، دەمەوێ بچمەوە ماڵێ

- بەلاَم جۆ هیچ شوێنی دیکە نییە ئەوەندە بۆ مەلەوانی چاك بێ

- مەلەوانی هەر باش نییە، بایەخیشی پێنادەم لەبەر ئێوە نەبا هەر مەلەم نەدەکرد، هەر چۆنێك بێ، دەبێ بچمەوە ماڵێ.

- بەسە هەی بەبۆکە! پێموایە دەتەوێ دایکت ببینی.

-بەڵێ، دەمەوێ دایکم ببینم، تۆش ئەگەر دایکت هەبا وا دەبووی

- من لە تۆ منداڵتر نیم، لووتی خۆشی بڵندکرد

تۆم بە قەشمەرییەوە گوتی:

- باشه.. با لێگەڕێین ئەو منداڵە گرینۆکە بچتەوە لای دایکی، وا نییە هاك؟ وای کە گوناحە، دەیەوێ دایکی ببینیٚ؟ دەباشە ببینە، تۆ حەزت لێرەیە، وا نییە هاك؟ ئێمە دەمێنینەوە وا نییە؟

هاك بە نادڵی گوتی:

- بە..ڵێ

جۆ هەستاوە گوتی:

- تۆم لێرە بەدواوە هەتا ماوم جارێکی دی قسەت لەگەڵ ناکەم، لێیان دوورکەوتەوە و جلەکانی لەبەرکرد.

تۆم گوتی:

- هەر منەتم پێ نییە، کەس نایەوێ تۆ قسەی لەگەڵ بکەی.. بڕۆوە گوند تا هەموو گاڵتەت پێبکەن و پێت پێبکەنن. ئای کە جەردەی چاکی ، من و هاك منداڵۆکەی گرینۆك نین. هاك لێی گەڕێ ئەگەر حەزی لێیە با بڕوا، لاموایە بێ ئەویش لێرە دەتوانین بژین.

تۆم هێشتا مورتاح نەبوو، زراوی لەوە چووبوو، جۆ گوێی نەداتێ و جلەکانی لەبەرکا. بەوەش زیاتر شپرزەبوو کە دیتی هاك بە ئێرەییەوە تەماشای خۆ ئامادەکرنی جۆ دەکات و زۆر بێدەنگ و گوماناوییە. کە جۆ بەرەو کەناری ئیلینۆی بەڕێکەوت، دڵی تۆم داخورپا. تەماشای هاکی کرد، هاك بەرگەی تێڕاونینەکەی نەگرت و چاوی داگرت و گوتی:

- تۆم منیش دەمەوێ بڕۆم، هەر لە سەرەتاوە تەنیایی لێرە زەحمەت بوو، وا بزانم چیدی بەرگەی ناگرین.. تۆم دەبا ئێمەش بڕۆین.

- من ناڕۆم، ئێوە هەردووك دەتوانن بڕۆن ئەگەر دەتانەوێ، من دەمێنمەوە.

- تۆم.. وا چاکە بڕۆم

- باشە بڕۆ، کێ ڕێی لێگرتووی؟

هاك جلە پەرت و بڵاوەکانی خڕکردەوە و گوتی:

- تۆم حەز دەکەی تۆش بێی.. ئیتر تەواو، ئێمە کە گەیشتینە کەنار چاوەڕێت دەکەین.

- باشە، کەواتە زۆر چاوەڕێ دەکەن.

هاك بەخەمباری ڕۆیی و تۆمیش هەر تەماشای دەکرد و زۆری حەز دەکرد واز لە فیزەکەی بێنێ و بەگەڵ هاوەڵەکانی کەوێ. بە ئاوات بوو کوڕەکان ڕاوەستن، بەڵام ئەوان هێدی هێدی

شۆڕبوونەوە. لە هیکرِا تۆم هەستیکرد کە شوێنەکە یەکجار بێدەنگ و خامۆشە، دوایین ململانێی لەگەڵ فیزبەرزی خۆی کرد.. دوای دۆستەکانی کەوت و هاواریکرد:

- راوەستن، راوەستن، دەمەوێ شتێکتان پێ بڵێم.

هەردوو کوڕەکە راوەستان و ئاوڕیان لێداوە، کەگەیشتەلایان، نهێنییەکەی بۆ ئاشکراکردن، کە تێگەیشتن چ ئامانجێکی هەیە، نەعرەتەی جەنگیان کێشا و هاواریانکرد، زۆر باشە، ئەگەر لە سەرەتاوەش پێی گوتبان نەدەڕۆیشتن. تۆم هۆیەکی پێ گوتن، بەلاّم نهێنییە راستەقینەکەی لا نەدرکاندن، نەوەك ئەو نهێنییەش وایان لێنەکا بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵیدا بمێننەوە، بۆیە بڕیاریدا ئەو نهێنییە ئاشکرا نەکا و بیکاتە دوا هەوڵی رازیکردنیان.

کوڕەکان بەدڵخۆشی بۆ خێوەتگەکە گەڕانەوە و دەستیان بە وەرزش کردەوە و لەبارەی پلانە ناوازەکەی تۆم دەدوان و سەرسامی خۆیان بەرامبەر بلیمەتی وی پیشاندا. دوای ئەوەی ژەمێکی تێر هێلکە و ماسیان خوارد، تۆم گوتی دەیەوێ فێری قەننەکێشان بێ، جۆ کەیفی بە بیرۆکەکە هات و گوتی ئەویش حەزدەکا هەوڵدا. هاك یەکسەر قەننەی بۆ ئامادەکردن و پڕ تووتنی کرد،کەسیان پێشتر لە جگەرەی گەلاّمێوز یاتریان نەکێشابوو، لە دەمودوویان نەدەوەشاوە و پیاوانە نەبوو.

جا راکشان و هەنیشکیان دا بن سەریان و بەدڵخۆشی و کەمێك لەخۆبایییبوونەوە دەستیان بە قەننەکێشان کرد. دووکەڵەکە تامێکی ناخۆشی هەبوو، کەمێك قوڕگیان گیرا، بەلاّم تۆم گوتی:

- بۆ.. خۆ ئەمە زۆر ئاسانە، ئەگەر بمزانیبا هەر ئەوەندەیە، لەمێژبوو خۆم فێردەکرد، جۆ گوتی: ئەمنیش، ئەوە هەر هیچ نییە

تۆم گوتی:

- زۆرجار تەماشای خەڵکم کردووە قەننەیان کێشاوە و حەزم کردووە وەکو ئەوان بکەم، بەلاّم باوەڕم وا نەبوو پێم بکرێ.

جۆ گوتی:

- منیش هەر دەق ئاوابووم، وانییە هاك؟ ئەدی پێشتریش پێم نەگوتوی؟ هاك بۆ من مەڵێ بۆ خوای بڵێ. هاك گوتی:

- باشه، خۆ منیش سەدان جارم پێ گوتوی، جارەك لە قەسابخانە بووین پێم گوتی، لە بیرت نییە هاك؟ بۆب تێنەر لەوێ بوو، لەگەڵ جۆنی میلەر و جیف تاچەر، کە پێم گوتی.. هاك لەبیرت نییە کە وام پێگوتی؟

هاك گوتی:

- بەڵێ وایە، لەو رۆژە کە من قەڵەمبڕە سپییەکەم بزرکرد، نا.. نا، هەر رۆژی پێشتربوو.

تۆم گوتی:

ئەها.. هاك چاکی لەبیرە، پێم نەگوتی.

جۆ گوتی:

- پێموایە دەتوانم بەدرێژایی رۆژێ قەننە بکێشم و هیچ دڵیشم تێك نەچێ.

تۆم گوتی:

- منیش هەروا، دەتوانم بەدرێژایی رۆژ بیکێشم، بەڵام مەرج دەکەم جێف تاچەر پێینەکرێ.

- جێف تاچەر! ئەگەر هەردوو قومی لێدا لەسەرڕا بەردەبێتەوە، لێگەڕێ با جارێك هەوڵدا، ئەوجا خۆی دەبینێتەوە!

- بەڵێ، خۆی دەبینێتەوە، جۆنی میلەریش هەروەتر، چەندم حەزلێیە جۆنی میلەر ببینم یەکجار قەلوون بکێشێ.

جۆ گوتی:

- نا.. بۆ، مەرج دەکەم جۆنی میلەر هەر ناتوانێ، بەیەك قوم ڕمبەی لێوە دێ.

- راستدەکەی جۆ.. چەند حەزدەکەم ئێستا ئەو کوڕانە بمانبینن.

- منیش حەزدەکەم

- لەوەی گەڕێن کوڕینە.. کە جارێك لەناو کوڕان بێمە لات و لە پێشەوان لێت بپرسم، ئەرێ جۆ قەلوونت پێیە؟ دەمەوێ قەلوونێ بکێشم، تۆش بەجۆرێ بێ باکانە وەك بلێی، بەڵێ کۆنە قەلوونەکەی خۆم و یەکێکی دیکەم پێیە. بەڵام تووتنەکەم زۆرباش نییە، منیش دەڵێم، کێشە نییە، ئەگەر تەواو بەهێزبێ. ئەوجا تۆ هەردوو قەننەکەت دەردێنی و هەر یەکمان یەکێکی پێدەکەین، ئەوجا بەس بیانبینە چۆن سەیرت دەکەن.

- ئایهای.. ئەوە دەبێتە بەزم.. تۆم! حەزدەکەم ئێستا بووایە

- منیش، کە پێیان دەڵێین ئێمە کە جەردەییمان دەکرد فێری بووین، خۆزگە ناخوازن لەگەڵمان بووان؟

- تەنیا پێم وا نییە، بەڵکو مەرجەدەکەم وابن.

گفتوگۆیەکە بەمجۆرە بەڕێوەچوو، بەڵام زۆری نەبرد ساردبۆوە و دواتر نەما، ماوەی درێژ درێژ بێدەنگ دەبوون و بەڵغەمیان زۆر فڕێدەدا. هەرچی کونۆچکەی روومەتیان هەبوو دەتگوت کانییە ئاوی لێدێ، بەحاڵ پێڕا دەگەیشتن ئەو هەموو لیکاوەیان قووتدەنەوە، کە لەژێر زمان و گەروویاندا دەچۆڕا و بەدوای یەك هێڵنجیان دەهاتێ، هەردووك رەنگ زەرد و داماو، زۆری پێنەچوو قەلوونەکەی جۆ لەنێو پەنجە سڕەکانیدا بەربۆوە و ئەوەی تۆمیشی بەدوا داهات. چاویان هەڵدەقولا و پشیان تەنگ ببوو. جۆ بەشەکەتییەوە گوتی:

- چەقۆکەم بزرکردووە، وا چاکە بچم بەدوایدا بگەڕێم.

تۆم بەلێوە لەرزە و زمان تێك ئالاوی گوتی:

- من یارمەتیت دەدەم. دەتۆ بەو رێیەدا بچۆ، منیش لە دەوری کانیاوێدا بۆی دەگەڕێم، هاك، نا.. پێویست ناکا تۆ بێی، ئێمە دەتوانین بیدۆزینەوە.

جا هاك دانیشتەوەوسەعاتێك چاوەڕێ بوو، هەستی بەتەنیایی کرد، چوو بەدوایاندا بگەڕێ، لەنێو داران لەدوو شوێنی لێك دوور دۆزینییەوە. هەردووك رەنگ زەرد، لەوێ خەویان لێکەوتبوو. بەڵام دڵی خەبەریدا کە ئەگەر هەر یەکێکیان کێشەیەکیان هەبا دەیتوانی خۆی لێ دەربازکا.

ئەو شەوی لەکاتی شێوان کەسیان زۆربلێ نەبوون، چاویان کەوتبوو. کە هاك دوای جەمێ پایپەکەی خۆی ئامادەکرد و خەریکبوو هی ئەوانیش حازرکا، گوتیان نا، ڕەوشتیان زۆر باش نییە. لەژەمی نێوەڕۆیێ شتێکیان خواردووە و لێیان نەکەوتووە.

دەوروبەری نیوەشەوێ جۆ وەئاگاهات و گازی ئەوانی دیشی کرد کەشوهەوا خنك و تەنگ بوو.. نوقلانەی خراپەی لێدەدا پێکەوە خڕبوونەوە و لە ئاگرەکەوە نێزیککەوتن.. هەرچەند زۆر گەرماش بوو، بەبێ جووڵە دانیشتن، گوێیان هەڵخست و چاوەدێربوون، بێدەنگییە خەمۆکەکە بەردەوام بوو، لەودیو ئاگرەکە تاریکییەك بوو چاو چاوی نەدەدی، لەناکاو تیشکێك بریسکەیدا دارستانی رووناك کردەوە، پاشان نەما دوای چرکەیەك تیشکەکە دیسان بریسکەی داوە، ئەمجارە هەندێك بەهێزتر بوو، یەکێکی دیکەشی بەدوا داهات. پاشان دەنگێکیان لەنێو لقی دارەکان بەرگوێ کەوت دەتگوت ناڵەناڵێکی لاوازە. هەستیانکرد هەناسەیەکی گەرم

بەبناگوێیان دەکەوێ، لە ترسان ڕاچەنین و لایان وابوو ئەمە گیانی تاریکەشەوە بەلایاندا ڕەتدەبێ. خامۆشی تاوێکی خایاند، بەلاّم بروسکەکان یەك بەدوای یەکدا هاتن و شەویان کردە ڕۆژ و دەوروبەریان ڕووناك کردەوە، بەشێوەیەك دەیانتوانی گژوگیای دەروپشتیان بەباشی ببینن.. ئەو کوڕیژگانە لەتاوان زەرد هەلّگەڕابوون. دواتر ڕمبەی گەوالّەیەك خاکی بەرپێیانی هەژاند و هەموو ئاسمانی داگرت و لە شوێنی زۆر دوور ونبوو. بایەکی سارد هەلّیکرد و وردە تەزرەی لەگەلّ خۆیدا هێنا کە کەوتە سەر گەلاّی داران و بەسەر ئاگرەکەیاندا پەرشبوو، ئەوجا بروسکێکی توندی هاوێشت و گەوالّە وا گرمەی هات، وایانزانی درەختەکان لەبنوبۆتکەوە هەلّدەکێشێ و بە تەپلّی سەریان دا دەدا، بۆیە بەترس و تۆقینەوە تێك وڕووکابوون. پاشان دنیا تاریك داهاتەوە و بەلێزمە بارانێکی سەر بەقەپووچکە بەسەر درەختەکاندا باری.

تۆم هاواری کرد: کوڕینە، غاردەنە بن خێوەتان!

هەر یەك بەلایەکدا بازی دا، پێیان لە گژوگیا تێك ئالاّوەکە گیردەبوو، گەوالّەیەکی دیکەش گرمەی لێوەهات، هەرچی لەسەر زەوی هەیە بەلەرزە و هەژانی خست، بایەکە توندتری کرد، یەك بەدوای یەك بروسکی دەدا، بارانەکە بووە سێلاّو، هەر یەك بانگی ئەوی دی دەکرد، بەلاّم دەنگیان لەنێو ئەو گرموهۆڕەدا گوم دەبوو. هەرچۆنێ بوو دوایی توانیان خۆ بگەیەننە ئۆردووگەکەیان و لە سەرمان و لە ترسانیش دەلەرزین و جلوبەرگیان ئاوی لێدەتکا، تەنیا بەوە دلّیان ئارامبوو کە پێکەوە بوون. ئەو کۆنە چارۆگەی کردبوویانە خێوەت و بەهێز دەلەرییەوە و فڕکەفڕکی بوو، تۆفەکە تا دەهات توندتر دەبوو، لە هیکڕا چارۆگەکەی لەبنڕا هەلّکێشا لەگەلّ خۆی لوولیدا، کوڕەکان دەستی یەکیان گرت و هەلاّتن ، لەبەرئەوەی چەندین جار ساتمەیانکرد و بەربوونەوە. هەر یەکە و چەند جێیەکیان بەخوێندا هاتبوو یاخۆ داماڵاّبوو. تا گەیشتنە داربەڕووە مەزنەکەی لێوار ڕووبار و خۆیان پێ پەنادا. لەودەمانە زریانەکە گەیشتبووە ئەوپەڕی و بریسکەی بروسکان دنیای ڕووناك دەکرد. ئاوی ڕووباریش هەلّستا بوو، هاژەی دەهات و پڕوشکی دوور دەهاوێشت، کوڕەکان تێبینی ئەوەیان کرد کە زۆر دارودرەخت بەرگەی ڕەشەباکەیان نەدەگرت و لە ڕەگەوە دەشکانەوە و بەسەر دەوەنەکان بەردەبوونەوە، گرمەی گەوالّە ئەوەندە زیادیکرد گوێچکەی کاس دەکردن. هەموو ڕەگەزەکانی سروشت هاریکاربوون، دەتگوت دەیانەوێ ئەو دوورگەی هەلّتەکێنن و بیسووتێنن و نقوومی کەن و هەر زیندەوەرێکی لەسەریشی دەژی کاس و کەڕی کەن. شەوێك بوو تا بلّێی ترسناك بۆ ئەو مندالّە بێ جێگایانە.

پاشان رەشەباکە هێور بۆوە و هێزە تووڕەکانی سروشت بەرەبەرە پاشەکشەیان کرد و هێمنی و ئارامی دووبارە بۆ دوورگەکە گەڕایەوە و کوڕێژگەکان گەڕانەوە ئۆردووگەکەیان، لە ترسان حەجمانیان نەبوو، بەلاّم کە دیتیان ئەو درەختە گەورەی لەژێریشی دەنووستن کە ئەوان لەوێ نەبوون هەلْتەکاوە و بەربۆتەوە، سوپاسی خودایان کرد. هەرچی لەئۆردووگەکەیان هەبوو لە ئاوێدا غەرق بوو، ئاگرەکەشیان کوژابۆوە، لە هەمووشی زیاتر بەمە کاریگەربوون، چونکە لە سەرمان و لە تەڕییان لەرزیان گرتبوو، بەلاّم کە بۆیان دەرکەوت پەنگرە ئاگرێکی کز لەژێر کۆتەلە دارێکی گەورەدا ماوە، کە ئاگرەکەیان لەپالْ هەلْکردبوو، پشییەکیان هاتەوەبەر.

یەکسەر قۆلْ و باسکیان هەلْکرد و پارچە دار و لکی وشکیان کۆکردەوە و ئاگرەکەیان زیندووکردەوە تا بلْێسەی لێهەستا. فەرەحنایی دلْی داگرتن، خۆیان دا بەر ئاگر و جلوبەرگەکەیان وشك کردەوە و ئەو گۆشتە کولاّوەشیان وشککردەوە کە مایانبوو، جا بە دەوری ئاگریدا شێویان خوارد و تا رۆژیان لیْ هەلاّت وەئاگابوون، چونکە شوێنێکی وشکیان دەسنەکەوت تا تێیدا بحەوێنەوە و سەرخەوێك بشکێنن.

کە خۆرهەلاّت، هەستیانکرد خەو یاری بە پێلْوویان دەکا، چوونەسەر بەربەستە لمینەکە و لێی نووستن. پاشماوەیەك بەخەبەر هاتن، بەخەم و دلْتەنگییەوە خەریکی بەرچایی حازرکردنێ بوون، کە لەخواردنێ بوونەوە، جومگەکانیان هەموو رەق ببوو، دیسان سۆزی نیشتمانیش جەستە و سۆزی داگیرکردن. تۆم هەرچەند بە پێی توانا هەولْی دەدا، کە دلْی هاوەلْەکانیشی خۆشکا، بەلاّم ئەویش ئەو هەستەی بە دەموچاوەوە دیاربوو.

کە زانی دۆستەکانی زۆریان حەز لە جێهێشتنی دوورگەکەیە، راز و نهێنییەکەی گۆرینی وەبیر هێنانەوە و دووبارە توانی بایەخیان ببزوێنێ، زۆری نەبرد هانای وەبەر فێلْێکی دیکەش برد تا تەواو سوود لەو بایەخە وەرگرێ. پێی گوتن، وا چاکە بۆ گۆڕانکاریی واز لە رۆلْی جەردان بێنین و خۆیان بکەنە هیندی سوور. ئەو قسانە دوو کوڕەکەی دیکەیان ورژاند، هەموو خۆیان رووتکردەوە و جەستەی خۆیان بە قوڕولیتە وەك کەری کێوی خەت خەت کرد، ئەوجا بەنێو دارستاندا غاریاندا تا هێرش ببەنە سەر کۆمەلْگە ئینگلیزییەکان، چونکە هەرسێك خۆیان پیْ سەرۆك خێلْ بوو.

پاشان بوونە سیْ خێلْی دوژمن، هێرشیان بۆ یەکدی دەبرد و نەعرەتەی شەڕیان دەکێشا. بەمجۆرە رۆژەکە بەخۆشی و شادی تێپەڕی و لەدەمی شێواندا لە ئۆردووگەکە گردبوونەوە و لە برسان لاکەیان لێوە دەهات. بەلاّم هێشتا دلْخۆشبوون. لێرە تووشی گرفتێك هاتن، خۆ

هیندییه دوژمنەکان تا لەگەڵ یەك پێك نەیەنەوە نان پێکەوە ناخۆن. مەترسیش مەحاڵە ئەگەر وەك هێمای ئاشتی قەلوونێك بەیەکەوە نەکێشن. هیچ ئامرازێکی دیکە نەبوو تا ئەو کۆسپەی پێ ببەزێنن. بۆیە دوو لەو هیندییانە خۆزگەیان خواست هەر جەردە بان، بەلاّم خۆیان پێ لەو کۆتە دەرباز نەدەبوو. پاش ساتێك قەلوون داگیرسا و لەنێو خۆ ئالۆگۆڕیان پێدەکرد و خۆیان ئاسوودە پیشان دەدا، شادمانبوون بەوەی رۆڵی هیندییانیان بینی، پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت ئەمجارە قەننەکێشان ناچاری نەکردن بچن لە قەڵەمبڕە ونبووکە بگەڕێن، با چاتر بڵێین ئەوجارە وەك جاری پێشوو نەبووە هۆی ئەوەی بەخراپی بڕشێنەوە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا دوای نانخواردن چی دیکەیان نەکێشا و ئێوارەیەکی خۆشیان بەسەربرد. ئێستا با لەو خۆشی و قەلوونکێشان و گفتوگۆیە واز لەو منداڵانە بێنین، چونکە ئێستا هیچ سوودێکی لە باسوخواسی وان نابینین.

# پاژی حەڤدەم

دوای نیوەڕۆی ڕۆژی شەمەی ئەولاتر، لەو گوندە بچووکە کەسێك نەبوو دڵی خۆش بێ. خانەوادەی هارپەر و پوورە پۆلی پرسەبار و ڕەشپۆشبوون، خەمین و خەمناکبوون و فرمێسکیان لە چاوان وشك نەدەبوو. خامۆشییەکی نائاسایی هەموو گوندی داگرتبوو، هەرچەند بەخۆشی تەواو بێدەنگ بوو. خەڵکەکە بە کاروباری ئاسایی خۆیانەوە خەریکبوون. بەڵام وڕ و کەمدووبوون و ئاخ هەڵکێشانیان زۆر بوو. پشووی شەمەی بۆ منداڵان ببووە بارێکی گران، هیچ دڵیان بە وەرزشەکانیان خۆش نەبوو، بەرە بەرە وازیان لێهێنا.

پاش نیوەڕۆ، بێکی تاچەر هەستیکرد وا بەدڵێکی یەکجار تەنگەوە بەرەو گۆڕەپانە چۆڵەکەی قوتابخانە دەچێ، هیچی نەدۆزییەوە دڵی ئارامکاتەوە، بۆ خۆی دەناورایەوە!

- ئۆف، خۆزگە دەمتوانی دەسکە دەرگە مسینەکە بگەڕێنمەوە، خۆ من شتێکم نییە تۆمم بەبیر بێنێتەوە. هەنسك قسەیان پێ بڕی، ڕاوەستا و بەخۆی گوت:

- هەر ئەلێرە بوو، وەیش، ئەگەر ئەو ڕۆژە دەهاتەوە، ئەگەر هەموو دنیاشم دانابا، چم نەدەگوت زویری کا، بەڵام تازە ڕۆیشت من هەرگیزاوهەرگیز جارێکی دی نایبینمەوە.

ئەو خەیاڵانە دڵیان داخورپاند و ئەوێی بەجێهێشت و فرمێسك بەسەر گۆناکانیدا دەهاتەخوارێ. لەو ساتەدا کۆمەڵە کوڕ و کچێك کە لەگەڵ تۆم و جۆ پێڕی گەمان بوون، هاتنە ئەوێ و لەوێ ڕاوەستان و چاویان بڕییە پەرچینەکە و بەچرپە دەیانگێڕاوە، کە تۆم دواجار لێرە ئاواوئاوای دەکرد، جۆش واووای دەگوت. هەر یەکەیان ئاماژەی بەوە دەدا، کە ئەو دوو کوڕە دواجار دەقاودەق لەکوێ ڕاوەستابوون، جار هەبوو شتێکیان بۆ زێدە دەکرد وەك "من هەر لێرە ڕاوەستا بووم، لەم شوێنەی ئێستام، تۆش لەجێگەی وی بی، ئاوا لێی نێزیك بووم، زەردەخەنەیەکی ئاواشی بۆ کردم، هەنگێ تووشی هەستێکی سەیر بووم، دڵم تەنگ بوو، بەڵام دیارە قەت نەمزانی مانای چییە، کەچی ئێستا وا تێی دەگەم.

مشتومڕێك لەنێو کوڕەکان پەیدا بوو کە ئاخۆ کێ دواجار ئەو دوو کوڕەی لە ژیاندا دیوە. کە دواییش دەرکەوت بەڕاستی کێ دوا کەس بووە ئەوانی دیوە و دواجار لەگەڵیان دواوە، ئەوانە خۆیان بەبایەخ و گرنگ دەزانی و ئەوانی دیش بەئێرەییەوە تەماشایان دەکردن.

کوڕیژگەیەکی هەژاریش لەنێو ئەو کۆمەڵە دابوو، شتێکی نەدۆزییەوە خۆی پێ هەڵکێشێ، بەشانازییەوە گێڕایەوە:

- باشە، منیش تۆم جارێك زۆر باشی تێهەڵدام.

بەڵام نەیتوانی سەرنجی کەس ڕاکێشێ، چونکە هەموویان دەیانتوانی وا بڵێن و ئەمە شانازییەکەشی پووچ کردەوە. کۆمەڵەکە بەملا و بەولادا دەگەڕان و بە کەسەرەوە یادی ئەو دوو پاڵەوانەیان دەکردەوە.

بەیانی ڕۆژی دواتر کە فێرگەی یەکشەمێ بەربوون، زەنگی کڵێسا لەباتی دەنگە ئاساییەکەی زۆر بەخەمناکی دەیژەنی، ڕۆژێکی خامۆش و خەمگین بوو. زرنگەی خەمناکی ئاژیری کڵێسا لەگەڵ ئەو کەشە ناهەموارەدا کۆك بوو، کە گوندەکەی تەنیبۆوە. گوندییەکان بەرەبەرە کۆدەبوونەوە، ناوە ناوە خۆیان دەگنخاند تا بەچرپە دوو وشان ئاڵوگۆڕکەن لە باسی ئەو بەسەرهاتە پڕ ژان و بە سوێیە، بەڵام کە دەگەیشتنە هۆڵی نوێژ چرپە نەدەما و تەنیا خشەخشی جلی ئافرەتان دەبیسترا، کە لە هۆڵەکەدا جێی خۆیان دەگرت و خۆیان خڕدەکردەوە. کەس لەبیری نەبوو جارێکی دیکە ئەو کڵێسا بچووکە وا پڕ بووبێ. دوای تاوێك بێدەنگی، پوورە پۆلی هاتە ژوورێ و سید و ماری و ئەوجا خانەوادەی هارپەریش بەدوایدا هاتن. هەموو ڕەشێکی تۆخیان پۆشیبوو. نوێژ خوێنان تێکڕا لەگەڵ پیرە قەشەکەش هەستانە پێوە تا خانەوادە پرسەبارەکان گەیشتنە ریزی پێشەوەی کورسییەکان. دیسان خامۆشی هەموو لایەکی داگرت و تەنیا دەنگی هەنسکان بێدەنگییەکەی دەشێواند. ئەوجا قەشەکە دەستەکانی بەرەو پێش دانا و گوتی: من رابوون و ژیانم.

لەدەمی ڕێوڕەسمەکەدا قەشە باسی سیفەتەکانی ئەو کوڕیژگە ونبوانەی وێنا دەکرد و ئەو ئاواتانەی دەهێنایە بەرچاو، کە ڕەنگبوو لەوان بهاتنایەدی. وێنەکان هێندە بەرچاو بوون، دڵی هەموو ئامادەبووانی جۆشاند و سوێی کردنەوە، بەتایبەت کە دەهاتەوە یادیان چۆن تەنیا هەڵەی ئەو کوڕانەیان دەدی و هەستیان بە پەسنە باشەکانیان نەدەکرد. هەروەك گەلێك بۆنەی کاریگەریی ژیانی ئەو کوڕانەی وەبیرهێنانەوە و سروشتە جوان و شیرینەکەی دەرخستن و بە کەسەرەوە قۆناخ بە قۆناخی ژیانی ئەوانی دەخستنەڕوو تاکو قەشەکەش پتر بە بابەتە کاریگەرەکەیدا رۆدەچوو، خەڵکەکە زیاتر هەڵدەچوو خۆیان پێنەدەگیرا و هەموویان لە پڕمەی گریانیاندا، تەنانەت قەشەش خۆی پێنەگیرا و هەر لەسەر سەکۆکەوە لە پڕمەی گریانیدا.

دەنگە دەنگێکی هێدی لەناو دالانەکەدا پەیدابوو، بەلاّم کەس تێبینی نەکرد پاش کەمێك دەرگەی کلێسا کرایەوە، قەشە چاوە ئەسریناوییەکانی لەسەر دەستەسڕەکەی بلّندکرد، لەجێی خۆی رەق داگەڕا. چاوەکان یەك یەك بەدوای چاوانی قەشە کەوتن، لەهیکڕا هەموو پێکەوە هەستانەوە، لەکاتێك کە هەرسێ کوڕە مردووەکە بەرەو پێش هەلّدەکشان، تۆم لە کۆنە جلکەکانی خۆی گرمۆلّە و سەرکزکردبوو. پێشتریش لە ڕێڕەوە لاچەپەکەی کلێسا خۆیان شاردبۆوە تا گوێ بدەنە ئەو ڕێوڕەسمەی بۆیان سازکرابوو.

پوورە پۆلی و ماری و خانەوادەی هارپەر خۆیان بەسەر مندالّەکانیان دادا، کە لە مردن راستبوونەوە و ماچبارانیان کردن و بەدەنگی بەرز سوپاسگوزارییان بۆ خودا دەردەبڕی، بەلاّم هاکی گوناح بەتەنێ راوەستابوو، کەس لێی نەدەپێچاوە، نەیدەزانی چ بکا یاخۆ چۆن خۆی لەو هەموو تێڕوانینە ناڕەزایانە بشارێتەوە. پاشەوپاش کشاوە، بەلاّم تۆم قۆلّی گرت و گوتی:

- پوورە پۆلی، ئەمە دار نییە، دەبێ یەکێکیش هەبێ بەهاتنەوەی هاك دلّخۆش بێ.

پووری گوتی:

- وایە.. منیش بەبینینەوەی ئەو هەتیوە بێ دایکە زۆر دلّخۆشم، ئەوجا بۆی نوشتاوە و ماچیکرد. ئەمەش یەکجاری هاکی شپرزە و پەشێو کرد.

لەناکاو قەشە هاواریکرد:

- پیرۆزی بۆ ئەو خودایەی رێژەنی بەسەرماندا هەلّدەڕێژێ، بخوێنن، لەناخی دلّتانەوە سروود بخوێنن.

هەموو پێکەوە بەدەنگێکی کاریگەر دەستیان بە گۆرانییەکی سەدسالّە کرد و تۆم سۆیەری جەردەش بە چواردەوری خۆیدا دەیڕوانییە ئەو کیژۆلاّنەی بە ئێرەییەوە تەماشایان دەکرد، ئەمە وای لێکرد ئەو ساتەی خۆی بە ئاسوودەترین ساتەکانی ژیانی دابنێ.

کە نوێژخوێنان لە کلێساوە دەردەچوون گوتیان کەوا ئامادەن دیسان ببنە گالّتەجاڕ و جارێکی دیکەش ئەو گۆرانییە سەد سالّییەیان گوێ لێبێ. بەهۆی بارودۆخی دەروونی پوورە پۆلی ئەو رۆژی تۆم زۆر تەقە و ماچی دیکەی بەرکەوتن کە سالّێك هێندەی بەرنەدەکەوت. بەلاّم ئەو بەزەحمەتیش نەیدەزانی ئەو هەموو ماچە بۆ سوپاسی خودان یاخۆ لەخۆشەویستی ئەون.

# پاژی هەژدەیەم

ئەمە نهێنییە گەورەکەی تۆم بوو، پلانی گەڕانەوەیان بۆ ماڵ لەگەڵ هەردوو برادەرەکەی و ئامادەبوونیان لەپرسەکەدا. لە تاریك و ڕوونی بەیانی ڕۆژی شەمە بەسەر کۆلکەدارێکی ئەستووردا پەڕینەوە کەناری میسوری و پێنج شەش میل لەخوار گوند گەیشتنە وشکایی. لەرۆخی شاری تا نێزیکەی ڕۆژهەڵات لە دارستاندا نووستن، ئەوجا ڕێچکە و کۆلانەکانی پشتەوەیان گرتەبەر، تا گەیشتنە ڕێڕەوە لاچەپەکەی کلێسا و لەنێو کورسییە شکاوەکاندا نووستنەکەیان تەواوکرد.

لەدەمی بەرچایی دووشەمێ، پوورە پۆلی و ماری و زۆریان خۆشەویستیی بۆ تۆم دەردەبڕی و چی حەزلێبا بۆیان دەکرد. بەشێوەیەکی نائاسایی قسەوگفتوگۆیان هەبوو. پوورە پۆلی بەخۆشییەوە گوتی:

- باشە تۆم، من نالێم سوحبەتێکی خۆش نەبوو، کە هەموو کەسێك لێرە یەك هەفتەی تەواولەئازاروئەشکەنجەدابوون، لەکاتێکدا ئێوە کاتێکی خۆشتان لەو دوورگەیەدا بەسەردەبرد، بەلام ئەوەی بەڕاستی جێی داخە چۆن ئەو دڵە ڕەقەی تۆ هێشتی ئەوەندە ئازاری من بدەی. کە بتوانن بەسەر کۆلکە دارێکدا بێنەوە تا پرسەی خۆتان ببینن، دەشتتوانی جارێك بێیەوە و ئاماژەیەکم پێ بدەی کە نەمردووی و تەنیا هەلاتووی.

ماری گوتی:

- بەڵێ تۆم، دەتتوانی وا بکەی، لاموایە دەبوا واش بکەی ئەگەر ئەوەت بەخەیاڵ داهاتبا.

پوورە پۆلی بە شەوقەوە لێی پرسی:

- باشە تۆم ئەگەر بەخەیاڵت داهاتبا واتدەکرد، دەپێم بڵێ، واتدەکرد ئەگەر بیرت لێکردباوە.

- من.. باشە، نازانم، خۆ ئەوە هەموو شتێکی تێکدەدا.

پوورە پۆلی بە دەنگێکی پڕژان کە تۆمی شپرزە کرد گوتی:

- تۆم. بەئاوات بووم ئەوەندە منت خۆشویستبا، ئەگەر هەر بایەخیشت بەوەدابا بیری لێ بکەیەوە و جێبەجێشت نەکردبا، دلّم پێدەحەساوە.

ماری تکای کرد:

- وەی پووریێ دە گوێی مەدێ خۆ ئەوە لە لاساری تۆمە، ئەوەندە سەرکێشە بیر لە هیچ ناکاتەوە.

-بەڕاستی جێی داخە،ئەگەر سید با بیری لێ دەکردەوە، سید با دەهاتەوە و ئاماژەیەکیشی دەدامێ. تۆم رۆژێك دادێ سەیری دواوە دەکەی، بەلاّم ئەوکات زۆر درەنگ دەبێ.

هەنگێ خۆزگە دەخوازی پترت بایەخ بەمن دابا، کە ئەوە زۆریشی تێنەدەچوو.

تۆم گوتی:

- نا پووریێ، خۆ تۆ دەزانی من بایەخت پێدەدەم.

- چاکترم دەزانی ئەگەر کردارت وابا.

تۆم بە پەشیمانییەوە گوتی:

- خۆزگە بیرم لێ بکردباوە، بەلاّم هەر چۆنێك بێ، خەونم پێوە دیتووی، ئەوەش هیچ نییە، وا نییە؟

- شتێکی وا نییە، پشیلەش ئەوەندەی پێدەکرێ، بەلاّم لە هیچ باشترە، چ خەونێکت دیت؟

- چوارشەمی رابردوو لە خەونمدا بوو تۆ لێرێهێ لەپالّ چارپاکە دانیشتبووی و سیدیش لەلای سندوقە دارینەکە دانیشتبوو، ماریش لەلای وی بوو.

- باشە، خۆ وا بووین، ئێمە هەروا دادەنیشین، شادم بەوەی لە خەونیش ئەوەندە خۆت پێمان خەریك کردووە.

- هەروەها لەخەونمدا بوو دایکی جۆ هارپەریش لێرەبوو.

- ئۆ، ئەویش لێرەبوو، چیدیت لەخەونێدا نەدی؟!

- زۆری دیکە، بەلاّم وا لەبیرم دەچن.

- باشە، هەولّدە بەبیرت بێنەوە، ناتوانی؟

- هەندێك، وامزانی کە با یاری.. یاری بە..

- دەی تۆم پتر خۆ ماندووکە با یاری بەشتێك دەکرد.. دەی!

- تۆم پەنجەی خستە سەر نێوچەوانی و دەمێك داما، پاشان گوتی:

- ئا. بەبیرم هاتەوە، یاری بە ئاگری مۆمەکە دەکرد.

- ئای خوایە، دەی تۆم بەردەوامبە، دەی!
- وا بزانم تۆش دەتگوت "ئەریٚ پیٚموایە دەرگەکە..
- بەردەوامبە تۆ.
- لیٚگەڕیٚ دەمیٚك بیرکەمەوە.. یەك چرکە، نا بەڵیٚ تۆ گوتت پیٚموایە دەرگەکە کراوەتەوە.
- کە لیٚرە دانیشتبووم وامگوت، وا نییە ماری؟ دەی بەردەوامبە!
- ئەوجا.. ئەوجا، باشە، دڵنیا نیم، بەڵاٚم لاموایە بە سیدت گوت بچیٚ.. بچیٚ و..
- باشە؟ باشە؟ پیٚمگوت چ بکا تۆم؟ پیٚمگوت چ بکا؟
- پیٚتگوت، تۆ، ئا.. پیٚتگوت بچیٚ دەرگەکە داخا.
- بۆ خاتری خوا! من هەرگیز چ رۆژیٚك شتی وام نەبیستووە.! چیدی مەڵیٚن خەون هیچی تیٚدا نییە و پڕوپووچە. بەر لەوەی یەك سەعاتی دی لە عومرم تیٚپەڕیٚ دەبیٚ سیریٚنی هارپەر بەمە بزانیٚ، دەمەویٚ ببینم بە قسە زیادەکانی چۆن ئەمە لیٚك دەداتەوە، بەردەوامبە تۆم.
- ئا، ئیٚستا هەموو شتیٚکم وەکو رۆژ لا روونە و هەمووم بەبیرهاتەوە، پاشان گوتت، کە من خراپ نەبووم، هەرچەند شەیتان و لاسار بووم، نابیٚ کەسیش لە توانای خۆم زیاترم لیٚ.. لیٚ چاوەڕوان کا.
- بەڕاستی وام گوت.. ئای هاوار.. بەردەوامبە تۆم
- ئەوجا دەستت بەگریان کرد.
- بەڵیٚ.. بەڵیٚ گریام، یەکەم جاریشم نەبوو، ئیٚ ئەوجا؟
- خاتوو هارپەریش گریا و گوتی، جۆش وەکو من وابوو. خۆزگەشی دەخواست قامچی کاری نەکردبا، چونکە سەرتووی بۆگەنی خواردبوو.
- تۆم! تۆ رۆحیٚکت هاتۆتەبەر! پیٚشبینیت کردووە. تۆ واتکردووە بەردەوامبە بدویٚ
- ئەوجا سید.. سید گوتی:
سید گوتی:
- پیٚم وانییە هیچم گوتبیٚ
ماری گوتی
- با سید گوتت
- دەمتان داخەن و لیٚگەڕیٚن تۆم بەردەوام بیٚ، چی گوت تۆم؟

- گوتی.. وا بزانم گوتی هیوادارم لەکوێیە هەر ئاسوودە بێ، بەلاّم ئەگەر هەندێ جار باشتر بوومایە..

- گوێتان لێیە؟ ئەوە هەمان وشەکانی سیدە

- ئەوجا تۆ بەتوندی بێدەنگت کرد.

- وامکرد! دەبێ فریشتەیەك لێرە بووبێ، بێشك فریشتەیەك لێرە لە شوێنێك بووە!

- ئەوجا خاتوو هارپەر گوتی، جۆ ترساندوویّتی، کە تۆنترەقەیەکی لەپێش تەقاندووە، تۆش باسی پشیلەکە و دەرمانە ژانکوژەکەت گێڕاوە.

- چۆن من زیندووم ئەمەش ئاوا راستە!

ئەوجا پاشان زۆرتان قسەکرد، لەبارەی گەڕان بەدوامان لەنێو رووبار و لەبارەی پرسە لە رۆژی یەکشەم و ئەوجا تۆ و خاتوو هارپەری پیر دەستتان کردە ملی یەك و گریان.. جا ئەو رۆیی.

- دەقاودەق ئەمە روویدا، تۆم ئەگەر تۆ لێرەش بای، نەتدەتوانی وا بەوردی رووداوەکان بگێڕییەوە.. ئێ پاشان..؟ بەردەوامبە

- پاشان وامزانی تۆ دوعام بۆ دەکەی، دەشمتوانی بتبینم و چیت دەگوت گوێم لێ بێ. ئینجا چوویە ناو جێگەکەت و منیش زۆر بۆت خەمبار بووم، بۆیە پارچەدارێکی لولدراوم هێنا و لەسەرم نووسی کە "ئێمە نەمردووین، بەلّکو بزر بووین تا ببینە چەتەی دەریا" ئەو نامەیەم لەسەر مێزەکە لەپالّ مۆمدانەکە دانا، جا تەماشام کردی، کە تۆ نووستبووی.. وامزانی کە خۆم نوشتاندەوە سەرت و لێوەکانم ماچکردی.

- بەڕاست تۆم، بەڕاست واتکرد، لەبەر ئەمە لە هەموو شتێکت خۆش دەبم.

ئەوجا توند تۆمی بەسنگەوە گوشی، ئەمە وای لێکرد خۆی بە تاوانبارترین کەسی دنیا تێبگا.

سید بە دەنگێکی بیستراو منگەی لێوەهات:

- ئەگەر ئەوە هەر خەون بووە، بەلاّم کردەوەیەکی بە بەزەیی بووە.

- بێدەنگ سید، جەستە وەئاگا بێ چ دەکا، لە خەونیشدا وادەکا.

ها تۆم ئەو سێوە گەورەیە بگرە کە بۆم هەلّگرتبووی، گەر دۆزرایەوە بتدەمێ، ئێستاش بڕۆ قوتابخانە. سوپاسگوزاری خودای بە بەزەییم کە تۆ گەڕایەوە لام، ئەگەر دلۆڤانی و بەزەیی

خودا نەبێ بۆ بەندەکانی من شایستەی لێخۆشبوون نیم. ئێستاش سید، ماری، تۆم بڕۆنە قوتابخانە، چونکە کاتێکی زۆرتان لێگرتم.

منداڵەکان بەرەو قوتابخانە بەڕێکەوتن، پیرەژنیش چوو بانگی خاتوو هارپەر بکا تا باسی کەتواری خەونە سەیر و ناوازەکەی تۆمی بۆ بکا. سید بەر لەوەی لە ماڵێ دەرچێ بیرێکی لا گەلاڵە بوو کە "زۆر سەیرە.. ئەگەر چی خەونیشە، چۆن هەڵەی تێدا نەبوو.."

تۆم بوو بە پاڵەوانێکی ناودار، وەکو پێشان هەراوهۆریای نەدەکرد تا سەرنجی خەڵکی راکێشێ، وەکو جەردەیەك بە لەخۆڕازیبوونەوە دەڕۆیشت کە هەست بکا چاوی خەڵکی لەسەرە. بەڕاستی چاوی خەڵکیشی لەسەر بوو، هەوڵیدا وا پیشاندا کە ئاگای لە تەماشاکردنەکان نییە و ئەو قسانەی گوێ لێ نییە، کە بەڕێوە پێی دەڵێن. ئەگەرچی ئەو سەیرکردن و قسانەش لای ئەو وەکو خواردن و خواردنەوەیان لێهاتبوو. کە دەڕۆیشت منداڵی لە خۆی وردتر بەدوایدا دەچوون، کە دۆستەکانیان لەگەڵ تۆم دەیاندیتن، کەیفیان بەخۆ دەهات، ئەویش پێیان قەڵس نەبوو. وای لێهاتبوو دەتگوت دەهۆڵکوتی پێشەوەی کاروانە یاخۆ ئەو فیلەیە کە لەنێو شاردا سەرکردایەتیی نمایشی کۆمەڵێك ئاژەڵی دڕندە دەکات. کوڕەکانی هاوتەمەنی خۆشی وایان خۆ دەنواند کە هەر ئاگایان لە ونبوونی وی نەبووە، بەڵام ئێرەیی دڵی دەخواردن، گومان لەوەدا نییە ئامادەشبوون هەموو شتێك ببەخشن تا پێستە هەڵقڕاوەکەی ئەویان دەستکەوێ کە رۆژ بردبووی. لەگەڵ ئەو تێڕوانینە بریسکەدارە لاسارانەی کە تۆم هەیبوو، بەڵام تۆم هەرگیز دەسبەرداری هیچ کامیان نەدەبوو.

لە قوتابخانەش منداڵان زۆر رێزیان بۆ تۆم و بۆ جۆ نواند و بوون بەمایەی سەرسامی هەموویان. هەردووك بۆ گوێگرە تینووەکان دەستیان بە گێڕانەوەی سەربردەکەیان کرد، بەڵام ئەمە تەنیا سەرەتا بوو، چونکە لەگەڵ ئەو خەیاڵ فرەوانەی ئەوان پێنەدەچوو کۆتایی هەبێ لە کۆتاییدا کە قەلوونەکانی خۆیان دەرهێنا و دووکەڵیان بەدەوروبەردا هەڵدەدا، بەمە گەیشتنە لووتکەی سەروەری.

تۆم وای بەباش زانی کە لەو ساتەدا لە بێکی تاچەر دووربێ، ئەوەندە سەروەرییەی بەسبوو کە دوای گەڕانەوەکەی پێی بڕابوو. ئێستا کە تۆم ناوبانگی دەرکردووە، رەنگە ئەو بیەوێ بەخۆی دابچێتەوە. باشە، لێیگەڕێ با ئەویش بزانێ کە تۆم دەتوانێ وەکو هەندێك خەڵك جودابێ و ناز بنوێنێ. پاش دەمێك بێکی گەیشت، تۆم وای پیشاندا کە نەیدیوە و لەوێ دوورکەوتەوە و چووە ناو کۆمەڵە کوڕ و کیژێك و دەستی بە قسان کرد. زوو تێبینی کرد کە

بێکی بە دڵخۆشییەوە دەهات و دەچوو، کوڵمەی سوور هەڵگەڕابوون و چاوەکانی دەبریسکانەوە. وای پیشان دەدا بەدوای هاوپۆلانی کەوتووە و کە یەکێکیانیشی دەگرت بە قیژەقیژ پێدەکەنی. تۆم هەستیکرد کە بێکی بە قەستی لە نێزیکە وی هاوڕێکانی دەگرێ و هەموو جارێك تیچاوێکیش دەداتە تۆم. ئەو هەڵسوکەوتە فیزی تۆمی تێرکرد، لەجیاتی ئەوەی وای لێبکا لەگەڵی ئاشت بێتەوە، یەکجاری بێتامی کرد و تەواو رووی لێوەرگێڕا.

پاشان کیژە وازی لە جووڵەجووڵەکانی هێنا و بەهەنگاوی هێدی هێدی بەلایدا تێپەڕێ و یەك دووجار هەناسەی هەڵکێشا و بەدزییەوە تەماشای ئەوێی کرد کە تۆمی لێوەستابوو. کەچی تێبینیکرد کە تۆم لە هەمووان پتر رووداوەتە ئێمی لۆرانس و قسەی لەگەڵ دەکا. هەستی بە ژانێکی قووڵ کرد و تووشی دوودڵی هات و ویستی دوورکەوێتەوە، بەڵام قاچەکانی بەدوایدا نەهاتن، بەڵکو بردیانە نێو ئەو کۆمەڵەی تۆمی تێدا راوەستابوو. ئەوجا بە کچێکی گوت کە لە نێزیك تۆم وەستابوو:

- ها ماری ئۆستن، کچی خراپ ئەوە بۆ نەهاتییە فێرگەی یەکشەمێ؟

- هاتبووم، بۆ منت نەدی؟!

- نا.. بەڕاست هاتبووی؟ لەکوێ دانیشتبووی؟

- لە پۆلی خاتوو پیتەرز، هەمووجار هەر لەوێ دادەنیشم، تۆشم لەوێ دی.

- بەڕاست؟ سەیرە من نەمبینی، حەزم دەکرد باسی ئەو گەشتەت بۆ بکەم کە بەتەماین بیکەین.

- ئای کە خۆشە، بەڵام کێ رێکی دەخا؟

- دایکم

- جوانە! هیوادارم لێگەڕێ منیش بێم

- بەڵێ.. ئەو گەشتەی بۆ من رێکخستووە، بۆیە کێی من بمەوێ لێدەگەڕێ بێ، منیش دەمەوێ تۆ بێی.

- سوپاسی هەستی جوانت دەکەم.. کەی ئەو گەشتە دەکرێ؟

- بەمزووانە.. رەنگە لە پشوودابێ.

- بێگومان سەیرانێکی خۆش دەبێ.. ئەرێ هەموو کوڕان و کیژان بانگ دەکەی؟

- بەڵێ، هەر کێ هاوڕێم بێ یاخۆ بیەوێ ببێتە هاوڕێم.

بە لاچاوێکیش سەیری تۆمی کرد، بەڵام ئەو باسی ئەو ڕەشەبایەی بۆ ئێمی لۆرانسی دەگێڕاوە، کە لەسەر دوورگەکە هەڵیکرد، کە چۆن درەختێکی زلی لە ڕەگەوە هەڵکێشا، لەو دەمەی تۆم تەنیا سێ پێ لێی دوور بوو!

گراسی میلەر پرسی:

- ئەرێ منیش بۆ گەشتەکە دێم

- بەڵێ، بێگومان تۆ هەر دێی.

سالی ڕۆجەرز گوتی: ئەی من؟

- بەڵێ تۆش

- سوزی هارپەریش گوتی: ئەی من و جۆ؟

- بەڵێ.

هەراوهۆریا و چەپڵەلێدان بەردەوامبوو، بێجگە لە تۆم و ئێمی لۆرانس هەموو داوایانکرد بۆ ئەو گەشتە بانگهێشت بکرێن. تۆم بە ساردی ڕووی وەرگێڕا، لە قسان بەردەوام بوو، ئێمیشی لەگەڵ خۆی برد. لێوەکانی بێکی وەلەرزە کەوتن و فرمێسکی زایە چاوانی، بەڵام بەسەرخۆیدا نەهێنا و بەخورتی خۆی ڕووخۆش پیشاندا و وتووێژی دەکرد، بەڵام گەشتەکەی تاموچێژی تێدا نەما، هەر کە دەرفەتیشی بۆ ڕەخسا یەکسەر دوورکەوتەوە و خۆی لە چاوان ونکرد و تێرتێر گریا، کە دڵی داکەوت، بە شکۆمەندییەکەی بریندارەوە تا زەنگی لێدا دانیشت. ئەوجا هەستاوە، ڕقێکی لەچاواندا دیار بوو، کە هی یەکێك بوو بڕیاری تۆڵەکردنەوەی دابێ.

لەلای پشتەوەش تۆم خەریك بوو بۆ ئێمی پان دەکردەوە و زۆر دڵی بەخۆشی شادبوو. لەوێ بۆ ئەوێ دەگەڕا تا بێکی بدۆزێتەوە و زیاتر خەمی بداتێ. لە دواییدا بەدیکرد، بەڵام لەناکاو کێچی کەوتە کەوڵی، چونکە دیتی وا پێکەوە لەگەڵ ئەلفرێد تێمپڵ لەسەر کورسییەکی پشت مەکتەبێ دانیشتوون و تەماشای کتێبێکی وێنەدار دەکەن و سەریان بۆ سەر کتێبەکە تەواو لێك نێزیك خستۆتەوە و ئاگایان لەهیچ شتێکی ئەم دنیایە نەماوە. ئێرەیی بە دەمارەکانی تۆمدا گەڕا، لەخۆی تووڕە بوو، چونکە ئەو دەرفەتەی نەقۆستەوە کە بێکی بۆ پێکهاتنەوە ڕەخساندی، خۆی پێ گێل و دەبەنگ هەموو شتێکی خراپ بوو، لەداخان هێند پڕبوو گریانی دەهات، کە لە پیاسەکەیان بەردەوامبوون ئێمی هەر بەدڵخۆشییەوە دەیدواند، چونکە دڵی لەخۆشیان سەمای دەکرد، بەڵام تۆم دەمی ببووە تەڵەی تەقیوو و زمانی لە گۆ کەوتبوو.

قسەکانی ئێمیشی نەدەبیست، بەلاّم کە ناوە ناوە رادەوەستا، سەرێکی بۆ دەلەقاند کە زۆرجار لەجێی خۆی نەبوو. چەندین جار بەو دەوروبەرە سووڕایەوە تا چاوی بەو دیمەنە بوغزێنراوە ئاودا. بەخۆی نەدەوەستا هێندەی نەمابوو لەتاوان شێت بێ. بەوەش زیاتر دەتەقی، کە بێکی تاچەر هەر بەهیچ تێی دەڕوانی و وای پیشان دەدا کە ئێستا وا دەزانێ هەر زیندووش نییە، بەلاّم لەلایەکی دیکەوە بێکی دەیزانی لە جەنگەکەدا سەرکەوت و دڵی بەوە خۆشبوو، کە دەیبینی بەخۆی چۆنی ئازار کێشا، تۆم ئاوا ئازار دەبینێ.

زۆر گوتنی ئێمی تۆمی بێزار کرد، بەبیانووی ئەوەی دەیەوێ بە شتێکی دیکە رابگا و کاری دیکەی هەیە و درەنگییەتی، مۆڵەتی لە ئێمی خواست، بەلاّم کیژە هەر گوێی پێنەدا. تۆم لە دڵی خۆیدا گوتی: هەی بەنەفرەت بیت.. دەڵێی ناتوانم خۆی لێ دەربازکەم؟ لەدواییدا هەر بەبیانووی ئەو کارانە کە ناکرێ دواخرێن، بەجێیهێشت و ئەویش بێشەرمانە گوتی: کە بەربوون لەم ناوە دەبم، بەلاّم ئەو رقی لێ بۆوە و بەخێرایی رۆیشت.

تۆم ددانی جیڕکردەوە و بەخۆی گوت: باشە لەو هەتیوە زیاتر کەست نەدیتەوە، لەو گوندەی هەر کوڕێکی دیکە با جگە لەو هەتیوە تڕ زلەی لایوایە لە هەموو منداڵانی گوند کەشخە و ئەرستیۆکراتترە، باشە، رۆژت دێتەوە، یەکەم رۆژ چاوت پێکەوت چۆنم لێدای، ئەوجارەش وات تێهەڵدەدەم راوەستە بابتگرم دەبێ گۆبەندێکت پێ بکەم.

تۆم هەر هەڕەشە و گەفوگوڕی بوو، چۆن لە منداڵێك بسرەوێنی ئاوا شاپ و شولاقی بەملا و بەولادا دەهاوێشت و دەیگوت: "وا دەکەی، دەبخۆ دەی" بۆ هاوار دەکەی، ئاوات لێ دەکەم.. با چاك فێر بی. بەمجۆرە لە شەڕە خەیاڵییەکەی دڵی داکەوت.

نیوەڕۆ تۆم خێرا چۆوە ماڵێ، چیدی ویژدانی خۆی لەبەر دڵخۆشی و زۆر گوتنی ئێمی رانەگرت، دڵێشی چیدیکە بەرگەی نەدەگرت. لەهەمان کاتدا بێکی لە تەماشاکردنی کتێبە وێنەدارەکە لەگەڵ ئەلفرێد بەردەوام بوو، بەلاّم کە کات تێدەپەڕی و تۆم نەدەهاتەوە، تامی سەرکەوتنی لەلا کزتر دەبوو، زۆری پێنەچوو، زەوقی سەیرکردنی وێنەکانیشی نەما، داڵغەی زۆر لێ دەدا، دوو سێ جاریش گوێی دەدا ترپەی پێیان، بەلاّم ئاواتێکی ساختە دەردەچوو، چونکە تۆم چیدی نەهاتەوە.. لە کۆتاییدا تەواو خەمین بوو. خۆزگەی دەخواست ئەوەندە خۆی بێتام نەکردبا. کە ئەلفرێدی هەژار هەستیکرد کچەی لەدەست دەچێ. دەیویست سەرنجی راکێشێ، بۆیە ناوە ناوە هاواری دەکرد: "ئەیهای.. تەماشای ئەو رەسمەی بکە". بەلاّم بێکی

کە ئارامی لێبڕابوو، گوتی: "دە چیدی بێزارم مەکە، من هەر گوێشیان پێنادەم. ئەوجا لە پڕمەی گریانی دا و هەستا ڕۆیی و دوورکەوتەوە.

ئەلفرێد بەدوای کەوت و دەیویست هێوری بکاتەوە، بەڵام ئەو گوتی:

- بڕۆ بەتەنیا لێمگەڕێ، ناتوانی، من ڕقم لێتە!

کوڕەکە بێ ئەوەی بزانێ چی کردووە و بۆ وا لێی زویر بووە وازی لێهێنا، هەرچەند بێکی پێشی گوتبوو بەدرێژایی نیوەڕۆ لەگەڵی دادەنیشێ و سەیری هەموو وێنەکان دەکات، کەچی بەگریان لێی دوورکەوتەوە. ئەلفرێد بەتووڕەیی و دڵشکاوی گەڕاوە ناو پۆلە چۆلەکە. زۆر زەحمەت نەبوو لە ڕاستیەکە تێبگا. زانی ئەو کچە کردبوویە ئامرازێك تا کینەی خۆی بەرامبەر تۆم سۆیەر پێ هەڵڕێژێ. کە ئەو هزرەی بۆ هات، ڕقی لە تۆم دە هێندە ببۆوە، حەزی دەکرد ڕێگەیەك بدۆزێتەوە تا کێشە بۆ ئەو کوڕە دروستکا. بێ ئەوەی خۆی تێوە بگلێنێ.. لەناکاو پەڕاوی نووسینەوەی تۆمی کەوتەبەر چاوی، هەستیکرد ئەوە دەرفەتێکە بۆی هەڵکەوتووە تا تۆڵەی لێ بکاتەوە. ئەوجا لاپەڕی ئەو وانەیەی کردەوە، کە پاش نیوەڕۆ دەیخوێنن، مەرەکەبی بەسەردا ڕشت.

بێکی لەو ساتەدا لە پەنجەرەی پشتەوەڕا تەماشای دەکرد و دیتی چ دەکا. جا خێرا لەبەر پەنجەرەکە دوورکەوتەوە، نەوەك ئەلفرێد بیبینێ و یەکڕاست گەڕایەوە ماڵ، بەتەما بوو تۆم ببینێ و ڕاستییەکەی پێ بڵێ، بێگومان تۆمیش سوپاسی ئەو کارە چاکەی دەکرد و پێك دەهاتنەوە.. بەڵام لە ڕێگە پەشیمان بۆوە و هەڵسوکەوتە ناشیاوەکەی تۆمی بیرهاتەوە، لەو کاتەی باسی گەشتەکەی دەکرد، کە چۆن بەهیچی دانەنا و پشتی تێکرد. بۆیە وازی لێهێنا تا لەبەر پیسبوونی پەڕاوەکەی دارکاری بکرێ و بڕیاریدا تاهەتایە ڕقی لێبێتەوە، لەپای ئەو خراپەی لەگەڵیدا کرد.

# پاژی نۆزدەیەم

تۆم بەوپەڕی بێزەوقییەوە گەییشەوە ماڵێ، یەکەم وتووێژی لەگەڵ پووری ئەوەی بۆ دەرخست، کە کەس گوێ بە خەم و کەسەرەکانی نادا. پووری پێی گوت:

- بەنیازم هەر بەزیندوویی کەوڵت کەم!

- بۆ پووریێ چیم کردووە؟

- باشە چ ماوە نەیکەی، کە چوومە لای سێرێنی هارپەر، چاوەڕوان بووم وای لێبکەم باوەڕ بەو هەموو شتە پڕوپووچانە بکا کە لەبارەی خەونەکەتەوە پێت گوتم، کەچی ئەو لە جۆی کوڕی زانیبووی تۆ ئەو شەوە هاتبوویەوە و بەدزی گوێتدابووە قسەکانمان. تۆم، نازانم کوڕێك کارێکی وا بکا، دەبێ چی لێ بکرێ. کە بیر لەمە دەکەمەوە تۆ وات لێ کردم بچمە لای سێرێنی هارپەر و ئاوا شەرمەزار بم، تەزیم پێدادێ و نازانم چ بڵێم.

ئەمە لایەنێکی تازەی بەزمەکە بوو، تۆم وایدەزانی ئەو لێزانییەی سبەینێ پیشانیدا، سوحبەتێکی خۆش بوو کە بلیمەتی وی پیشان دەدا، بەلاّم ئێستا ئەوپەڕی بێ نرخی بوو، بۆیە سەری داخست و نەیتوانی بیر لەهیچ بکاتەوە و بۆ ماوەیەك هیچی پێ نەگوترا، پاشان گوتی:

- پووریێ خۆزگە وام نەکردبا.. بەلاّم بیرم لێ نەکردەوە.

- ئای هەتیوی منداڵ.. بیرت لێ نەکردەوە، تۆ لە منانێتی خۆت بترازێ بیر لەهیچ ناکەیەوە. تۆ دەتوانی بیر لەوە بکەیەوە کە بە نیوەشەوێ ئەو گەشتە درێژە بۆ دوورگەی جاکسۆن بکەی و گاڵتە بە کێشە و خەمەکانمان بکەی، دەتوانی بیر لەوە بکەیەوە بە درۆیەکی زل لەبارەی ئەو خەونەوە بەمن رابوێری، بەلاّم هەرگیز بیر لەوە ناکەیەوە کە بەزەییت پێماندا بێتەوە و نەهێڵی خەم و ئازار بچێژین.

- پووریێ، ئێستا بۆم.. ئێستا بۆم دەرکەوت کارێکە چەند نارێك بووە، بەلاّم بەڕاستی نەمدەویست وابێ، دوایی من ئەو شەوەش بۆ ئەوە نەهاتبوومەوە تا گاڵتەتان پێ بکەم.

- ئەدی بۆ هاتبوویەوە؟

- بۆیە تا پێت بڵێم، لێمان بەخەم نەبی، چونکە ئێمە نەخنکاوین.

- تۆم، تۆم، من دەبمە ئاسوودەترین ژنی سەرزەوی ئەگەر بتوانم باوەڕ بکەم کە تۆ هزرێکی وا چاکت بۆ هاتووە، بەلاّم تۆم خۆتیش دەزانی وا نییە و منیش دەزانم.

- پووریێ، بەڕاستی ئەمەیە راستی، هیوادارم ئەگەر وانەبێ لێرە رەق ببمەوە.

- ئای تۆم، درۆیان مەکە،چونکە ئەو شتە سەد هێندەی دیکە خراپت دەکا.

- پووریێ من درۆناکەم، ئەمە راستییە، دەمویست چیدی دلّت نەترسێ بۆیە هاتم.

- هەموودنیادەدەم تاباوەڕ بەم قسانەت بکەم، چونکە ئەمە هەموو گوناهەکانی دیکەت دەسڕێتەوە، وەخت دەبێ بەڕاکردن و خراپەکارییەکانیشت شاد بم، بەلاّم ئەمە بە عەقلّی کەسدا ناچێ. چونکە ئەگەر وابا بۆ پێتنەدەگوتم؟!

- بۆ، دەزانی کە ئێوە باسی پرسەکەتان دەکرد، ئەوەم بە مێشك داهات کە بێین و لە کلّێسا خۆمان بشارینەوە، تا پرسەی خۆمان بەچاوی خۆمان ببینین. جا ئەو پارچە دارەم هەلّگرتەوە، کە نامەکەم لەسەر نووسیبوو، خستمەوە گیرفانم و خۆم بێدەنگ کرد.

- کامە نامە..؟

ئەو تەلیشەدارەی نامەم بۆ تۆ لەسەر نووسیبوو، تا پێت بلّێم ئێمە بۆ جەردەیی چووین. خۆزگە کە ماچم کردی هەستابای. بەڕاستی خۆزگە دەخوازم.

- تۆم تۆ منت ماچ کرد؟

- بەلّێ، بۆ؟

- دلّنیای؟

- بۆ، بەلّێ پووریێ تەواو دلّنیام

- جا بۆ منت ماچ کرد تۆم؟

- چونکە تۆم خۆشدەوێ، تۆ لەوێ پالّکەوتبووی نالّەنالّت بوو، منیش زۆرم خەم لێخواردی.

زۆر پێدەچوو قسەکانی راست بن، بۆیە پیرەژن نەیتوانی هەست و سۆزی خۆی لە دەنگە لەرزۆکەکەی خۆی بشارێتەوە:

- تۆم، دیسان ماچم بکە و بڕۆ قوتابخانە و لەوە زیاتر بێزارم مەکە. کە ئەو رۆیی، پووری غاریدا نادینەکە و چاکەتە شڕەکەی تۆمی دەرهێنا کە لەکاتی جەردەیی لەبەریکردبوو، راوەستا و چاکەتەکەی بەدەستەوە بوو، بەخۆی گوت:

- وای لەو هەتیوە گوناحەی، لاموایە دیسان درۆدەکا، بەلاّم درۆیەکی باشە، زۆریش باشە، چونکە حەسانەوەم پێدەبەخشێ، سوپاسی خوا دەکەم، دلّنیام خوداش لێی خۆش دەبێ، چونکە لەباشی دلّی خۆیەوە ئەو قسەیەی کرد، منیش نامەوێ ئەو درۆیەم بۆ دەرکەوێ.

چاکەتەکەی لەولای داناوە، دەمێ راوەستا بیری کردەوە، بە لەرزۆکییەوە دوو جاران دەستی درێژکرد تا چاکەتەکە هەلّگرێتەوە.. هێزی دایەوە بەرخۆی و گوتی ئەوە درۆیەکی چاکە، بەلّێ درۆیەکی چاکە، لێ ناگەرێم دلّم تەنگ کا. ئەوجا بەرکی چاکەتەکەی کۆلّییەوە، پاش ساتێك نامەکەی تۆمی بەدەستەوە بوو. دەیخوێندەوە و دەگریا، جا گوتی "ئێستا دەتوانم لەو کورە خۆشبم، تەنانەت ئەگەر یەك ملیۆن گوناهیشی هەبێ".

# پاژی بیستەم

شتێکی نائاسایی لە هەڵوێستی پوورە پۆلی هەبوو کە ماچی کرد، ئەمە وای لە تۆم کرد دووبارە دڵخۆشی و ئاسوودەیی بۆ بگەڕێتەوە. بەرەو قوتابخانە بەڕێکەوت و بەخت هاریکاری بووکەلەسەری مێدولەین رووبەڕووی بێکی تاچەربۆوە،لەبەرئەوەی هەموو هەڵسوکەوتەکانی بەپێی باری دەروونی خۆیبوو، بێ دوودڵی بەرەو رووی بێکی غاریدا و گوتی:

- بێکی ئەمڕۆ زۆر بە بڵحی هەڵسوکەوتم کرد، بۆیە داوای لێبوردنت لێ دەکەم، هەرگیز جارێکی دیکە وا ناکەمەوە.. تا لە ژیاندا مابم، جا تکایە لەگەڵم چابەوە. کچەکە راوەستا و بە تەوسێکەوە تەماشای کرد و گوتی:

- بەڕێز تۆماس سۆیەر، من هەرگیز جارێکی دی ناتدوێنم.

جا لموزی بڵند کرد و رۆیشت، تۆمیش لەجێی خۆی چەقی، تەنانەت بۆی نەهات پێی بڵێ "جا کێ باکی بەقسەی تۆیە خانم" تا دەرفەتەکەی لەدەستچوو، هیچی نەگوت، بەڵام لەتاوان پڕوشکی دەهێنا، بە رق و کینەوە بەرەو قوتابخانە چوو، حەزی دەکرد کوڕ بووایە و بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر کوڕ با چۆنی دەکوتا. کە لەبەر دەروازەی مەکتەبێی دی، سەرنجێکی زۆر رەقی لێ بیست، ئەویش بەقسەیەکی رەقتر وەڵامی داوە و رقی خۆی هەڵڕشت. بێکی هێند تووڕە بوو، لایوابوو ناتوانێ تا کاتی دەرسێ راوەستێ و دارکاری تۆم ببینێ، بەهۆی ئەو مەرەکەبەی بەسەر پەڕاوەکەیدا رژابوو. هەرچەند تەمای وابوو کردەوەکەی ئەلفرێد تێمپڵ ئاشکراکا، بەڵام دەمەوەرییەکەی تۆم وایکرد بەیەکجاری لە مێشکی خۆی دەرباوێ.

ئەو کچە گوناحە، نەیدەزانی بەخۆی چەند لە گێروگرفت نێزیکە، مامۆستا دۆبینز لە ناوەڕاستی تەمەندا بوو، ئاواتی وەدی نەهاتبوون، زۆری حەزدەکرد ببێتە دکتۆر، بەڵام هەژاری لێ نەگەڕابوو لە مامۆستای قوتابخانەی گوندێك زیاتر ببێتە شتێکی دیکە. هەر رۆژەی کتێبێکی سەیری لە چەکمەچەی مێزەکەی دەردێنا و لێی دەخوێندەوە و قوتابییانیش بە وانەکانیدا دەچوونەوە. ئەو کتێبەی بە قوفڵ و کلیل دەپاراست و دەیویست نهێنی بێ. بۆیە هەرکێی لە قوتابخانەکەدا بوو حەزی دەکرد چاوێك بە نێوەڕۆکەکەیدا بخشێنێ. بەڵام ئەو دەرفەتە بۆ کەس نەڕەخسابوو، هەر کوڕێك و هەر کچێك بۆچوونی خۆیان لەبارەی سروشتی

ئەو کتێبە هەبوو. بەڵام قەت ڕای دووانیان وەکو یەك نەبوو. چ ڕێگەیەکیش نەبوو حەقیقەتەکەی پێ بزانن. مێزەکەی لەلای دەرگە دانرابوو، کە بێکی بەلایدا هات، دیتی وا کلیل لەناو قوفڵەکەیە! ئەمە ساتێکی زێڕین بوو، بەملا و بەولای خۆیدا ڕووانی زانی هەر خۆی بەتەنیایە یەکسەر کتێبەکەی دەرهێنا، لە لاپەڕی ناونیشانەکە نووسرابوو "توێکاری پرۆفیسۆر فلاّن" ئەو لە واتای توێکاری نەگەیی، لاپەڕەکانی هەڵگێڕ و وەرگێڕ کرد، وێنەیەکی ڕەنگین و سەرنجڕاکێشی جەستەیی ڕووتی مرۆڤی لەپێشەوەڕا دۆزییەوە، لەهەمان کات سێبەرێك کەوتە سەر لاپەڕەکە و تۆم سۆیەر لە دەرگە هاتەژووریّ و وێنەکەی کەوتە بەرچاوی، بێکی پەشۆکا، کە ویستیشی کتێبەکە داخاتەوە، لە بەدبەختی ئەو لاپەڕەی وێنەکەی تێدابوو لە ناوەڕاستەوە دڕا، کتێبەکەی لە چەکمەچەکە داناوە و لە شەرمەزاریان دەستی بەگریان کرد و هاواریکرد:

- تۆم سۆیەر تۆ زۆر پەڕپووت و هیچ و پووچی.. چونکە چاو دەبڕییە ئەو شتانەی خەڵکی دی سەیری دەکەن.

- جا من چۆن بزانم تۆ تەماشای شتێکی وا دەکەی

- تۆم سۆیەر تۆ حەقە شەرم لەخۆت بکەیەوە، بێگومان تۆ باسم دەکەی، جا باشە من چ بکەم، چی بکەم! قامچیکاری دەکرێم و قەتیش لە قوتابخانە لێم نەدراوە.

ئەوجا پێیە گچکەکانی لە زەوی گیر کرد و گوتی:

- ئەگەر حەزت لێیە هیچ و پووچ بە، منیش دەزانم شتێکت بەسەردێ، ڕاوەستە و خۆت دەبینییەوە، من ڕقم لێتە، ڕقم لێتە، ڕقم لێتە.

ئەوجا بەهەنسکەوە لە ژووریّ وەدەرکەوت.

تۆم لەویّ ڕاوەستا، سەرسام بوو، بەلاّم بەخۆی گوت:

- ئای لەو کچە گێل و دەبەنگەی، چ جار لە مەکتەبێ لێی نەدراوە، قسەی قۆڕ. جا لێدان چییی؟ بەلاّم کیژان هەروان، ئەوەندە هەستیار و ڕوو تەنکن و دڵیان هێندە لاوازە. باشە خۆ من قەت بە دۆبینزی پیر نالێم ئەو گێلۆکە چی کردووە، چونکە شێوازی دیکە هەیە بۆ ئەوەی تۆڵەی لیّ بکەمەوە، ئەوەندەش پڕوپووچ نیم. بەلاّم دەبیّ چ ڕوویدا؟ خۆ دۆبینزی پیر دەپرسیّ کیّ کتێبەکەی دڕاندووە، کەس وەلاّم ناداتەوە، ئەوجا وەك هەموو جارێك هەمان ڕێگە دەگرێتەبەر لە یەکەم قوتابی بەردەمی دەپرسیّ و دوایی پێدا دەچیّ، کە دەگاتە کیژە تاوانبارەکەش هەر لەخۆڕا بیّ ئەوەی کەس پێی بڵێ دەزانیّ، چونکە کچان بەڕوویانەوە دیارە.

ئەوجا زۆر ببێ بەزەییانە لێیدەدا، هەرچۆنێ بێ بۆ بێکی تاچەر زۆر ناخۆش دەبێ، چونکە لێی دەرباز نابێ. تۆم زۆری بیر لێکردەوە جا گوتی: "باشە ئەو هەر خۆزگە دەخوازێ من وا ببینێ، دەبا بیخوا نۆشی بێ".

تۆم چووە ناو هاوەڵەکانی کە لە گۆڕەپان یاریان دەکرد، پاش چەند خولەکێك مامۆستا گەیشت و قوتابیان چوونە پۆل، تۆم زۆری حەز لە دەرسێ نەبوو، هەرجاری تیچاوێکیشی دەبڕییە لای کچان، چاوی بە بێکی دەکەوت تووشی دڵەڕاوکێ دەبوو. سەرەڕای هەموو شتێك حەزی نەدەکرد بەزەیی پێدابێتەوە، کەچی بۆ یارمەتیدانیشی هەر ئەوەندەی پێدەکرا، کە ئاماژە بەناوی نەدا.

زۆری نەبرد، تۆم ئەوەی بۆ دەرکەوت، کە پەڕاوەکەی مەرەکەبی پێدارژاوە، بۆیە ئاگای لەکەس نەما و بەخەمی خۆیەوە خەریکبوو. بێکی خۆی قیت کردەوە تا بە وردی چاودێری رووداوەکان بکات. لای وابوو ئەگەر تۆم نکۆڵی لەم کارە بکا لێی دەرباز نابێ و بۆچوونەکەشی راستبوو. چونکە وا پێدەچوو نکۆڵیکردن بارەکەی پتر لێ تێکدابێ. بێکی لای وابوو بەمە دڵخۆش دەبێ، بەلاّم بۆی دەرکەوت کە دڵنیا نییە، کە بارەکە پتر تێکچوو. حەزیکرد هەستێتەوە و کەتنەکەی ئەلفرێد تێمپلێ ئاشکراکا. بەلاّم زۆری لەخۆی کرد تا خۆی راگرێ، چونکە هەروەك بەخۆی گوت: "ئەو هەر ناوی من دەدا کە وێنەکەم دڕاندووە، بۆیە یەك وشە چییە نایلێم ئەگەر ئەو لە مەرگیش قوتاری کا".

تۆم قامچییەکانی خۆی خوارد و گەڕاوە شوێنی خۆی، خۆشی پێ ستەملێکراو نەبوو، چونکە لای وابوو رەنگە بەبێ ئاگایی مەرەکەبدانەکەی وەرگێڕابێتە سەر پەڕاوەکەی. راستە نکۆڵی لێکرد، بەلاّم لەبەرئەوە نەبوو کە زۆری بڕوا پێیە، بەڵکو هەروا لێڕاهاتبوو.

سەعاتێك تێپەڕی.. ئەوجا مامۆستا چووە سەر تەختەکەی خۆی. هەر منگە منگی خوێندنەوە ئەو ناوەی پڕکردبوو، بەڕێز دۆبینز بەرە بەرە خۆی راستکردەوە و باویشکێکی دا، ئەوجا چەکمەچەکەی کردەوە و کتێبەکەی دەرهێنا، زۆرینەی قوتابیان سەریان بڵندکرد و بەساردییەکەوە تێیانڕوانی، بەلاّم دووانیان زۆر بە وردی تەماشای جووڵەکانیان دەکرد.. بەڕێز دۆبینز دەمێك بەخاوی لاپەڕەکانی هەڵداوە، ئەوجا سەری لەقاند و بۆ خوێندنەوە ئامادە بوو. تۆم چاوێکی بڕییە بێکی زگی پێسووتا و چەقەچەقەکەی لەبیرچوو. دەبووا بە خێرایی شتێك بکا، بەلاّم دۆخەکە ئەوەندە ترکزە بوو بیرکردنەوەی لەکارخست. وای بۆ هات کتێبەکە بڕفێنی و هەڵێ و لەدەرکەی دەرپەڕێ، بڕیارەکەی ساتێکی خایاند، کە دەرفەتەکەی لەدەست چوو،

چونکە مامۆستا کتێبەکەی کردەوە و گوتی ئێستا هەلّم نەما یارمەتی بێکی بدەم. دواتر مامۆستا چاوێکی بڕییە قوتابیان، هەموو لە ترسان چاوی خۆیان داگرت.. ساتێك خامۆش و بێدەنگبوون، ئەوجا بەدەنگێکی ترسناك گوتی: "کێ ئەم کتێبەی دڕاندووە؟"

کەس دەنگی لێوە نەهات، دەرزیت هەلّباوێشتبا زرنگەی دەهات.

خامۆشی بەردەوامبوو، مامۆستا یەك یەك سەروچاوەکانی بەسەردەکردەوە، بەلّکو نیشانەیەکی تاوانەکە بدۆزێتەوە.

- بێنجامین رۆجەرز، تۆ ئەم کتێبەت دڕاند؟

نکۆلّی لێکرد و بێدەنگییەکی دی بەدوا داهات

- ئەی تۆ جۆزێف هارپەر؟

ئەویش نکۆلّی کرد، تۆم بەرە بەرە بەم کردە لەسەرەخۆ و درێژخایەنە پتر تێکدەچوو، مامۆستا چاوی بەناو کوڕاندا گێڕا، دەمێك راما، ئاوڕی لە کچەکان دایەوە:

- ئێمی لۆرانس؟

ئێمی بە نەخێر سەری لەقاند

- گراسی میلەر؟

هەمان ئاماژەی کرد

- سوزان هارپەر، تۆ واتکردووە؟

نایەکی دیکە، دوا کچ بێکی تاچەر بوو، تۆم ئەوەند هەلّچوو بوو، لە تەوقی سەرییەوە تا بنی پێی دەلەرزی، هەستیشی دەکرد هەلّوێستەکە تروسکایی هیوای تێدا نەماوەتەوە.

- رێبێکا تاچەر "تۆم روانییە دەموچاوی لەترسا سپی هەلّگەڕا بوو" ئایا تۆ دڕاندووتە؟ تەماشای چاوم کە، لەترسان دەستەکانی بەرزکردنەوە، تۆ ئەم کتێبەت دڕاندووە؟

هزرێك وەك بروسکە بە مێشکی تۆمدا هات، هەلّبەزییە سەرپێیان و هاواریکرد "من کردوومە"

پۆلەکە هەموو تێی ڕامان و سەریان لەو دەبەنگییەی سووڕما، تۆم ساتێك راوەستا، تا هزری پەرتی خۆی کۆدەکاتەوە. کە مامۆستاش بەرەو رووی چوو تا سزای بدا، سەرسامی و سوپاسگوزاری و خۆشەویستی لە سۆمای چاوانی بێکی هەژار بەدیکرد. کە بووە چاکترین پاداشت لەپای ئەو سزایەی دەیکێشێ. هەرچەند ئەو لێدانەی بەریکەوت زۆر بە ئێش و ژان و ژار بوو، بەلاّم بەهێمنی خۆی لەبەر راگرت و نقەی لێوە نەهات، ئەمە وای لە بەرێز دۆمینز

کرد هێندەی دی رقی لێهەڵگرێ، بۆیە دڵی بەو لێدانە دانەکەوت و فەرمانی پێدا کە قوتابیان بەربوون ئەو ماوەی دوو سەعاتان لە قوتابخانە بمێنێتەوە. تۆم دەیزانی یەکێك لە دەرێ دەمێنێتەوە چاوەڕێی کا تا دڵی بداتەوە، بۆیە زۆر گوێی بەو سزایەش نەدا.

کە ئەو شەوی تۆم چووە ناوجێ، خەریکی پلانێك بوو تا تۆڵە لە ئەلفرێد تێمپڵ بکاتەوە، چونکە بێکی بەوپەڕی پەشیمانی و کزۆڵەیی دانی بە ڕاستییەتەکە دانابوو، ناپاکی خۆشی لەبیر نەکردبوو. کە چاویشی چووە خەوێ هێشتا قسەکانی بێکی لە گوێچکە دەزرنگانەوە:

- تۆم، تۆ چۆن دەتوانی هێندە مەرد بی!

# پاژی بیست و یەکەم

دەمی پشوو نێزیکبۆوە، مامۆستا دۆمینزی توندوتیژ، هێندەی دیکە ڕەقەکار بوو. چونکە دەبویست لە ڕۆژی تاقیکرنەوەدا قوتابییەکانی سەرکەوتوو بن، بۆیە داردەستەکەی کەم بێکار دەبوو، بەتایبەتی لەنێو قوتابییە بچووکەکاندا. تەنیا کوڕە گەورەکان و کچانی هەژدە ساڵی و بیست ساڵ لەو لێدانە دەربازدەبوون. لێدانی بەرێز دۆمینز زۆر خراپتر ببوو. هەرچەند سەرە تەواو رووتاوەکەی لەژێر کلاوپرچێك دەشاردەوە، بەلاّم تەمەنی هێشتا لە ناوەڕاستدا بوو، هیچ نیشانەیەکی بێهێزبوون و لاوازی ماسولکەکانیشی پێوە دیار نەبوو. کە ئەو ڕۆژە بەهادارەش نێزیککەوتەوە، هەرچی زوڵم و زۆری تێیدابوو، لێی دەرکەوتن. وای دەزانی هەر قوتابییەك ئەشکەنجە بدا بەخۆی چێژێکی زۆر وەردەگرێ. دەرەنجام قوتابییە بچووکەکان وایان لێ هاتبوو بە ڕۆژ لەنێو ترس و تۆقینێکی زۆر لەژێر ئەشکەنجەدا دەژیان و بە شەویش بیریان دەکردەوە و پلانیان دادەنا چۆن تۆڵە لەو مامۆستا دڵڕەق و بێ ویژدانە بکەنەوە. هیچ دەرفەتێکیشیان باز نەدەدا، کە خراپەیەك بەرامبەر ئەو مامۆستایە بکەن. بەلاّم هێشتا هەر کۆنترۆڵیشی دەکردن، ئەو سزایانەی بەدوای سەرکەوتنی هەر پلانێکیان دا دەهات، ریسەکەی دەکردنەوە خوری. لە کۆتاییدا پێکەوە پێکهاتن و نەخشەیان کێشا تا سەرکەوتنێکی سەرنجڕاکێش بەدەست بێنن. هاتنە لای کوڕی نیگارکێش و پلانەکەیان تێ گەیاند و داوای یارمەتیان لێکرد، ئەویش هۆکاری خۆی هەبوو تا دڵی پێ خۆش بێ، لەبەرئەوەی مامۆستا لە بنەماڵەی باوکی بوو، هۆیەکی لا ڕەخساندبوو تا تەواو رقی لێ بێتەوە. ژنی مامۆستا لەو چەند ڕۆژەی دادێ بە سەردانێك دەردەچێ، کەسێکی لێ نابێ پلانەکە تێك بشێوێنێ. مامۆستا هەمیشە لەو کاتانەی خۆی بۆ بۆنە مەزنەکان ئامادە دەکرد، تەواو شپرزە دەبوو و دەپەشۆکا، جا کوڕی نیگارکێش گوتی: لە کاتی گونجاودا لە ئێوارەی تاقیکرنەوەکان لەو دەمی کە لەسەر کورسییەکەیدا چاوی دەچێتە خەوێ "کاری خۆی" دەکا، ئەوجا وەئاگای دەهێنێ و بۆ خۆی لەکاتی تەواودا بەپەلە دێتە قوتابخانە.

لە کۆتاییدا بۆنە گەورەکە هات، لە هەشتی ئێوارەی ئەو ڕۆژیدا، ڕووناکییەکانی قوتابخانە شەوقیان دەداوە، هەموو لایەك بە گوڵ ڕازێنرابۆوە. مامۆستا بەفیزەوە چووە سەر کورسییە

بەرزەکەی کە لەسەر سەکۆیەکە بوو و تەختە رەشەکەشی لە پشت بوو، بەزەوق و شەوق دیاربوو، سێ ریز کورسی لەهەر لایەکی هەبوون و شەش ریزیشی لەپێش بوو، کە پیاوماقولآن و دایك و باوکی قوتابیانی لێ دانیشتبوون. لەلای چەپیشی، لەپشت ریزی هاوولاّتیان سەکۆیەکی کاتی پان دروست کرابوو تا ئەو قوتابیانە لەسەری دانیشن کە بڕیار بوو لە راهێنانەکانی ئەو ئێوارەیەدا بەشداربن. ریز ریز قوتابیانی بچووك بە جلوبەرگی خاوێنەوە هەرچەندە نارەحەتیش بوون، چەند ریزێکیش بۆ قوتابییە گەورە بێعارەکان. ئەوجا ریزی کیژۆڵە و خانمان کە هەموو مۆزلینیان لەبەربوو، قۆڵیان رووتبوو، خۆیان بە کۆنە خشڵی داپیرانیان رازاندبۆوە و سینگیان بە شریتی پەمبە و شین رازاندبۆوە و گوڵیان لە قژیان دابوو. بەشەکانی دیکەی قوتابخانەش بەو قوتابیانە پڕبوو، کە ئەمڕۆ بەشداریان نەدەکرد.

ئەزموونەکان دەستیان پێکرد، کوڕیژگەیەکی زۆر گچکە هەستاوە و بەشەرمەوە گوتی: رەنگە لاتان سەیر بێ منداڵێکی وەك من بچووك بێتە سەر شانۆ و بۆ خەڵك قسە بکات...هتد؟ خۆی تەنگاو کردبوو تا ئاماژە و جووڵەی وا بنوێنێ کە لەگەڵ قسەکانیدا کۆك بن، کە ئامێرێکیش دەیتوانی بیکا، بەو مەرجەی ئامێرەکە عەیبێکی گچکەی هەبێ، بەلاّم توانی تاسەر رۆڵەکەی خۆی ببینێ و چەپڵەیان بۆ لێدا. جا خۆی بۆ ئامادەبووان نوشتاندەوە و گەڕاوە لەشوێنی خۆی بزربوو. ئەوجا کیژۆڵەیەکی شەرمن هەستاوە و داستانی (میرێ بەرخۆڵەیەکی هەبوو)ی گێڕاوە و بابی خۆی چەپڵەڕێزانی بۆ کرا و بەشادییەوە گەڕاوە شوێنی خۆی.

پاشان تۆم سۆیەر بە فیزێکەوە هاتە سەر مینبەر و وتارێکی خوێندەوە، کە بەم دێرە دەستی پێکرد (ئازادیم بدەنێ یاخۆ مردن) قسەی دەکرد و بەتوندی دەستی رادەوەشاند، بەلاّم زۆری پێ نەچوو لە ناوەڕاستی قسەکانیدا متەقی لێبڕا، وشەکان هەموو لە یادگەیدا بوونە هەڵم، وای دەزانی قاچەکانی ناتوانن بەپێوە رایگرن، خەریکبوو بخنکێ. راستە هەموو ئامادەبووان سۆزیان بۆی بزوا، بەلاّم بێدەنگییەکەیان زیاتر شەرمەزار و شپرزەی کرد. مامۆستا برۆی تێکنا، ئەمەش کارەساتەکەی بۆ تەواوکرد. تۆم دەمێك هەوڵیدا قسەکانی بەبیر بێتەوە، بەلاّم نەیتوانی، جا کشاوە و پاشەکشەی کرد. کەمێك هەوڵیاندا چەپڵەی بۆ لێدەن، بەلاّم هەرزوو دەنگەکە نەما.

بە دواییاندا نواندنی (ئەو کوڕەی لەسەر کەشتییەکی سوتاو و راوەستا) پێشکەش کرا، ئەوجا (ئاشوورییەکان دێنەخوار) و هەندێ وتاری گەرم خوێندراوە، پاشان کێبڕکێی خوێندنەوە

و گۆکردن دەستی پێکرد، تیپی زمانی لاتینی کارێکی زیرەکانەیان کرد. پاشان نۆرەی بڕگەی سەرەکیی ئەو ئێوارە ئاهەنگە هات. کە بریتی بوو لەو داڕشتنانەی کچە قوتابییە گەورەکان نووسیبوویان. هەر یەك بەنۆرەی خۆی دەهاتە سەر لێواری سەکۆکە، گەرووی خۆی خاوێنکردەوە دەینسەکەی دەکردەوە، کە بەشریتێکی سوور گرێدرابوو، دەستی بەخوێندنەوە و زۆر دیقەتی دەدا گۆکردن و خاڵداری. بابەتەکانیش هەمان ئەو بابەتانە بوون، کە پێشتر دایك و داپیر و تەنانەت هەموو ژنە پێشینەکان تا دەگاتەوە سەردەمی شەڕی خاچهەڵگران باسیان کردبوون. وەکو (هاوڕێیەتی)، (یادەوەرییەکان)، (ئاین لە مێژوودا)، (خاکی خونان)، (سوودەکانی کولتوور)، (شێوازە سیاسییەکانی حکوومەت بە بەراورد و جیاوازی)، (خەمەکان) و (دەردی دڵان) و زۆری دی.

مۆرکی زۆرینەی ئەو بابەتانە خەمۆك بوون، هەمووشی پڕاوپڕی واژەی بژاردە و دەربڕینی سەیر و شێوازی سەرنجڕاکێش و وشەی بریقەدار بوو، کە گوێیەکان لێی ڕاهاتبوون.

کچێك هەستاوە داڕشتنەکەی[1] وەخوێنێ، تێکەڵ بەهەست و سۆزی گوێگران بوو، هەموویان کەوتنە چرپە چرپ و دەستخۆشیان لێ دەکرد و دەیانگوت: ئای لەو بابەتە جوانەی.. چەند ڕەوانبێژە.. چەند ڕاستگۆیە. کە کچە بابەتەکەی خوێندەوە زۆر بە گەرمی چەپڵەڕێزان کرا. پاشان کیژۆڵەیەکی ڕەقەڵەی لاواز هاتە سەر شانۆ، خەمباری پێوە دیار بوو، لە دەموچاویڕا وا دیار بوو کە بەدەست نەخۆشی خراپی هەرسکردن و دەرمان خواردن دەناڵێنێ.. ئەویش چامەیەکی[2] خوێندەوە، بە چەپڵەیەکی گەرم پێشوازی لێکرا. هەرچەند لەنێو ئەو ئاپۆڕایەی گوێیان لە چامەکە بوو، تەنیا کەمێکیان لە واتای ئەو وشە

---

(١)، (٢)، (٣) لە تێکستە ئەسڵییەکەدا دەقی شیعرەکە و داڕشتنەکان هاتوون، بەلام لەکۆتایی ئەم پاژەدا نووسەر سەرنجێکی تۆمار کردووە، کە ئەو نووسینانە یەکڕاست لە کتێبێك خوازراون بەناوی (پەخشان و شیعر کە خانمی رۆژئاوا نووسیویێتی)، بەلام کە کیژۆڵەکان خوێندویانەتەوە، کەس هەستی بەوە نەکردووە. دیارە ئەم سەرنجەش بەشێکە لە هونەرکاری و خەیاڵی نووسەر، بەلام لەبەرئەوەی تێکستەکان تەنیا بۆ دەرخستنی ئاست و چۆنیتی بیرکردنەوەی قوتابیانی ئەو سەردەمی ئەوێن، ئەمەش لە سیاقی نووسینەکەدا دەرکەوتووە، دەقەکانیش هیچ بۆ خوێنەری کورد زیاد ناکا، بە پێویستمان نەزانی بەتەواوی پاچڤەیان بکەین و لامان وابوو تەنیا ئاماژە بەسە.

سەیروسەمەرانە دەگەیشتن، کە لە شیعرەکەیدا بەکاری هێنابوون، بەلاّم هەموو کە گوێیان دایە بەکارێکی کاریگەر و چاکیان دانا.

ئەوجارە کیژۆڵەیەکی رەش ئەسمەری چاوبەڵەکی قژقەترانی هاتەپێش، پاش بێدەنگییەکی کاریگەر. رەنگ و رووی شێوازێکی شانۆییان وەرگرت و بەجدییەتەوە دەستی بەخوێندنەوەی داڕشتنەکەی کرد بەناونیشانی خەون[٣] قوتابیان یەك بە دوای یەك هەرچی ئامادەیان کردبوو خوێندیانەوە، ئەوجا مامۆستا بە کەیف و زەوقەوە هەستاوە و کورسییەکەی وەلانا و پشتی لە گوێگران کرد، لەسەر تەختەڕەشەکە دەستی بەکێشانی نەخشەی ئەمەریکا کرد، تا پۆلی جوگرافیای پێ بئەزموێ. بەلاّم دەستە لەرزۆکەکەی کارەکەی خەمگین کرد بوو، پرتە پرتێك لەناو خەڵکی دروست بوو، ئەویش دەیزانی مەسەلە چییە، بۆیە ویستی خۆی کۆك بکاتەوە، هەندێ هێڵی سڕینەوە و دووبارە دروستی کردنەوە، بەلاّم پتر لەجاران تێکی دان، دەنگە دەنگیش زیاتر بوو. سەرنجی خۆی هەموو خستە سەر کارەکەی، ئێستا کە بڕیاریدا بەو پێکەنینە ورەی دانەبەزێ. وای هەستکرد هەموو چاوەکان لەوی دەڕوانن پێیوابوو خەریکە سەردەکەوێ، بەلاّم منگەکە بەردەوام بوو، بەڵکو زیادیشی کردبوو. ژوورێکی لاوەکیی[٤] لەسەرەوە هەبوو، خێرا خێرا دەسووڕا و لەو کونەوە پشیلەیەك دەرپەڕی، کە بە پەتێك بەرەوخوار شۆڕکرابۆوە، کۆنە گوشێکی لەسەرومل و کەڵبەکانی ئالاّ بوو، تا نەتوانێ بمیاوێنێ، کە هێدی هێدی شۆڕدەکراوە، خۆی بەرەو سەر نوشتاندەوە و چڕنووکی لە پەتەکە گیر کرد، بەرەوخوار دەلەراوە و لە هەوای رنەی دەهاوێشت.

تا دەهات منگەمنگ و پێکەنین بەرزتر دەبۆوە. پشیلەکە هەر شەش ئینج لەسەری مامۆستا دوور بوو، دابەزی، دابەزی تا گەیشتە سەری و بە رنۆکەکانی کلاّوەپرچەکەی سەر سەری مامۆستای رامالّی و هەر زوو بەخۆ بەو دەسکەوتەوە بەرەو ژوورە لاوەکییەکە هەڵکێشرایەوە و سەرە رووتاوەکەی مامۆستاش بریقەی داوە، ئەوەبوو کوڕی نیگارکێش بەزمەکەی قەوماند. بەمە کۆبوونەوەکە بەکۆتا هات، کوڕان تۆڵەی خۆیان کردەوە، پشووش دەستی پێ کرد.

---

[٤] لەو خانووانەی ساپیتەکەیان وەك خانووی جزیری لارە، ژوورێکی نەوی لەنێوان ساپیتەکە و ژووری خوارەوە دروست دەبێ، کە پێی دەڵێن GARRET، چونکە کورد نیەتی، ناویشی لێ نەناوە، ناچار پێی دەڵێم ژووری لاوەکی.

# پاژی بیست و دووەم

تۆم بووە ئەندامی کۆمەڵەی برایانی میانڕەوی، لەبەرئەوەی چۆنێتی رێبیر و دروشمەکەیان سەرنجی راکێشابوو، بەڵێنیدا هەتا لەگەڵ ئەواندا بێ واز لە قەلوونکێشان و تووتن جوین و هەموو گوناح و تاوانێك بهێنێ. زۆری پێنەچوو شتێکی دیکەی بۆ دەرکەوت، کاتێ مرۆڤ پەیمان دەدا واز لە شتێك بهێنێ ئەو هەر یەکجاری شەیدای ئەو شتە دەبێ و رووی تێدەکا. تۆم هەر زوو هەستی بەخۆی کرد کە ئارەزووی دەچێتە خواردنەوە و شەڕەجوێن. ئارەزووەکەشی ئەوەندە توندببوو، دەرفەتی بۆ نەهێشتبۆوە، ئەوە نەبێ بەخۆی و شریتە سوورەکەی کە نیشانەی ئەو کۆمەڵە بوو، لەنێو خەڵکی دەرکەوێ. هەموو تەماکانیشی خستبووە سەر فرێزەری پیرەدادوەر، کە کەسایەتییەکی بەرز و دادوەری ئاشتی بوو، بەناو ساڵان کەوتبوو و لە ئاوزینگاندا بوو، بەنیاز بوو کە بمرێ بەپێش تەرمەکەی بکەوێ و خۆی بەو پشتێنە سوورەوە هەڵکێشا. ماوەی سێ رۆژ تۆم زۆر بایەخی بە دۆخی وی دەدا و زۆر تامەزرۆی هەواڵەکانی بوو. هەندێ جار هیوای پەیدادەکرد و شریتە سوورەکەی دەردەهێنا و دەچووە پێش ئاوێنە رادەوەستا و پراوەی پۆشینی دەکرد، بەڵام ئەو دادوەرە هەر نەمرد,. لەکۆتاییشدا راگەیەندرا کە بارە ترسناکەکەی بەسەرچووە و روو لە چابوونەوەیە. بۆیە تۆم زۆر پەست بوو و دڵی تەنگ بوو، یەکسەر وازی لەو کۆمەڵە هێنا، کەچی بۆ شەوێ لە هیکرا دادوەر ڕەوشتی تێکچوو و مرد. بۆیە تۆم بڕیاریدا جارێکی دی متمانە بەپیاوی وا نەکا.

رێوڕەسمی ناشتنەکە شتێکی ناوازە بوو، برایانی خۆگری بەشێوازێکی تازە ریزیان بەستبوو تا ئەو ئەندامەی پێشوویان تووشی ئێرەیی بکەن. تۆم دیسان هەستی بە ئازادی دەکرد. ئەمەش کەمێك دڵی دەداوە، دیسان دەیتوانی بخواتەوە و جنێو بدا، بەڵام لەوە تەواو سەرسام بوو، کە چیدی حەزی لەو دوو شتە نەمابوو، زۆر بەئاسانی دەشیتوانی دەستبەرداریان بێ.

سەری لەوەش سوڕمابوو، کە هەستیکرد پشووش ئەو تامەی نەماوە و تەواو لەبەر دڵی گران بووە.

هەوڵیدا پەڕاوێك بۆ یادەوەری رۆژانە تەرخانکا، بەڵام لەماوەی سێ رۆژان هیچ رووی نەدا، بۆیە وازی لەمەش هێنا.

یەکەم تیپی گۆرانی قولەکان هاتە شاری و هاتنیان بەزمی نایەوە. تۆم و جۆ هارپەریش تیپێکی نواندنیان پێکهێنا، ئەمەش بۆ دوو ڕۆژان دڵخۆشی کردن.

تەنانەت گرووپی چوارینەی خاوەنشکۆدار لەهەندێك ڕووەوە سەرکەوتوو نەبوو، چونکە بارانێکی بەخوڕ باری. ئەو ئامادەباشییەش تێکچوو، کە بۆ پێشوازیی کردنی ڕێزدار (بینتۆن)ی ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا خەریکبوو سازیان دەدا. لەمەشدا تۆم هەر دڵساردی بۆمایەوە، چونکە ئەو پیاوە پیاوێکی ئاسایی بوو، چ باڵاشی بیست و پێنج پێ بەرز نەبوو، وەك تۆم بەتەما بوو، ئەوجا سێرکێك هات.. پاشان کوڕەکانی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بۆ خۆیان سێرکێکیان پێکهێنابوو، لەژێر ئەو خێوەتەی، کە لە کۆنە بەڕی بە پینەوپەڕۆ دروستیان کردبوو، هەر کوڕێکی بچووبا سەیریشیان سێ دەمبوزیان لێ وەردەگرت و بۆ کچانیش دوو دەمبوز بوو، پاشان وازیان لە سێرکەکەش هێنا.

دواتر فاڵچییەك و خەوێنەرێکی موگناتیسیش هاتن.. بەڵام کە دێیەکەیان بەجێهێشت ئەوەندەی دی تەنگ و خەمێن بوو، هەندێك ئاهەنگی زۆر خۆش بۆ کوڕ و کچان سازکرا، بەڵام ئەوانیش زۆر کەمبوون و کە هەر یەکەشیان تەواو دەبوو، دەبووە مایەی دڵتەنگی، بێکی تاچەر گەڕابۆوە ماڵی خۆیان لە کۆنستانتینۆپڵ تا لەماوەی پشوودا لەگەڵ باوك و دایکی بمێنێتەوە، بەمجۆرە ژیان هیچ ڕووێکی گەشی تێدا نەمابوو خۆشی بخاتە دڵان.

ڕازی هەمیشەیی ئەو تاوانی کوشتنەش بۆ تۆم ببووە مایەی خەمینییەکی کەڤنار و ژانێکی هەمیشەیی.

ئەوجا لەسەر هەموو خەمانیش سۆریکە بڵاوبۆوە.

ناچار تۆم بۆ ماوەی دوو هەفتە بووە زیندانی ماڵێ و لەهەموو ڕووداوێکی دنیا دابڕا، تەواو دەردی لێ توند ببوو. حەزی نەدەچووە هیچ، بایەخی بەهیچ شتێك نەدەدا، کە کەوتەوە سەرپێیان و بە بێتاقەتی چۆوە ناو شاری، هەستیکرد گۆڕانێکی خەمگین هەموو لایەکی داگرتووە. بوژانەوەیەك هاتبووە ئارا و هەموو خەڵك ڕوویان لە ئاین کردبوو، ئەمەش تەنیا گەورەکان نا کوڕ و کچانیشی گرتبۆوە. تۆم بەملا و ئەولادا گەڕا حەزی دەکرد چاوی بەکەسێك بکەوێ بە گوناهکاران بچێ. کەچی ڕووی لەهەر کوێ دەکرد بێ هیوا دەبوو. جۆ هارپەری دۆزییەوە خەریکی دەورکرنەوەی بەشێکی ئینجیل بوو. بەخەمباری دوورەپەرێزی گرتبوو. بێن ڕۆجەرزی دیت بەخۆ بەسەبەتەیەکی پڕ دیارییەوە بەسەر هەژاراندا دەگەڕێت. بەدوای جیم هۆلیدا گەڕا، کە دۆزییەوە جیم سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشا کە ئەو سۆریکەی بەم دواییە تووشی

تۆم ببوو، بەهرە و ڕێژەنێکی خودایی بوو تا ئاگەداری بکاتەوە. بەمجۆرە هەر کوڕێکی دەدیت هێندەی دی دڵی تەنگ دەکرد. کاتێك تەواو بێ هیواش بوو. هانای وەبەر هاوڕێیەکی دیکەی برد، کە هەکلبێری فین بوو. ئەویش بە گێڕانەوەی هەندێ وتەی ئینجیل پێشوازی لێکرد. بۆیە هەر دڵی لەخەمان تۆقی ملی ڕێی ماڵێی گرت و کەوتەوە ناوجێ، ئەوەشی بۆ دەرکەوت کە لەهەموو شارۆچکەکەدا بەتەنیا ئەم تاهەتا وێڵ و گومڕابووە.

لەوشەویدا ڕەشەبا و بۆرانێکی توند هەڵیکرد و گرمەی گەواڵە گوێچکەی کەڕ دەکردن و بریسکەی بروسکیش چاوانی تاری دادەهێنان. تۆم نوێنەکەی لەسەری خۆی لوولدابوو، بەترس و تۆقینەوە چاوەڕوانی مەرگ بوو، گومانی لەوەدا نەبوو کە هەموو گوناهەکانی بەدوایەوەن. باوەڕی وابوو کە هێزە باڵاکان چیدی بەرگەی ئەو گوناهانە ناگرن، چونکە گەیشتوونەتە ئەوپەڕی، بۆیەش ئەو ڕەشەبا بەهێزە هەڵیکردووە. بۆ وی وا دەردەکەوت بەخەسارداني ئەو هەموو هێزە وەکو ئەوە وایە بەگوللە تۆپێك مێشوولەیەك بکوژی. کوشتنی مێرووێکی وەکو ئەمیش هێندە ناهێنێ بروسکی وای تێ بگیرێ.

بەرە بەرە ڕەشەبایەکە داکەوت و تواناکانی دامرکان بێ ئەوەی ئامانجەکەی وەدی بێنێ. یەکەم شت بەخەیاڵی تۆمدا هات ئەوەبوو سوپاس و ستایشی خوا بکات و ژیوان بێتەوە، لەلایەکی دیکەش بیری لەوە دەکردەوە، جارێ پەلەی تۆبەکردنی نەبێ، کێ دەڵێ ڕەشەبایەکی دیکە هەڵدەکاتەوە.

ڕۆژی دواتر پزیشك سەردانیان کردەوە، دەریانخست کە حاڵەتەکەی پاشەکشەی کردووە و دەبێ سێ هەفتەی دی لەناو جێ بکەوێ. پێی وابوو سێ هەفتە تەمەنێکە، کاتێ چاشبۆوە دڵی خۆش نەبوو، چونکە تەنیایی گیانی ئازار دەدا و هەستی دەکرد هێندە تەنیا بوو. بەخاوی بە شەقامەکەدا شۆڕدەبۆوە، کە چاوی بەجیم هۆلیس کەوت. دیتی وا لە دادگەیەکی منداڵاندا ڕۆڵی دادوەر دەگێڕێ، بۆ دادگاییکردنی پشیلەیەك کە یەکێکی کوشتووە، قوربانییەکەش، کە باڵندەیەك بوو لەوێ بوو. تۆم لە لاڕێکاندا جۆ هارپەر و هاکلبێری فینی بینی، کە خەریکبوون شفتییەکی دزراویان دەخوارد، چەند گوناح بوون، ئەوانیش وەك تۆم پاشەکشەیان کردبوو.

## پاژی بیست و سێیەم

لەکۆتاییدا ئەو کەشوهەوا خەواڵووە شڵەقا و جووڵەیەکی توندی تێکەوت، چونکە ڕۆژی تاوانی کوشتنەکە هاتە بەردەم دادگەو بووە بابەتی سەرزاری هەموو خەڵکی لادێ. تۆم نەیدەتوانی خۆی لەدەست سەرکۆنەکردنی ویژدانی دەرباز بکا، هەر ئاماژەیەك بەو تاوانە دڵی ئەوی دادەخورپاند. ویژدان و ترسانی ئەوەندەی نەمابوو باوەڕی پێ بێنن، کە بەقەستی ئەو قسانە لەلای باس دەکرێن، بەڵام نەیدەزانی خەڵك چۆن دەزانن ئەو شتێکی لەبارەی کوشتنەکەوە لەدڵیدایە. لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا لەنێو ئەو هەموو قسەوقسەڵۆکە هەستی بە ئارامی نەدەکرد و بەدرێژایی کات ترس و لەرز ئۆقرەی لێ بڕیبوو. بۆیە چووە لای هاك و بردییە شوێنێکی لاچەپ تا لەگەڵی بدوێ، لای وابوو ئەگەر هەندێك زمانی بکاتەوە مەینەتییەکانی لەگەڵ هاوخەمی دابەشکا، کەمێك دڵی ئارام بێ. لەوەش زیاتر حەزی دەکرد بزانێ داخوا هاك هێشتا رازەکەی پاراستووە.

- ئەرێ هاك پێم بڵێ قەتت لای کەس ئەو باسە درکاندووە؟
- باسی چی؟
- تۆ دەزانی چی؟
- ئا.. بێگومان نا
- هەر یەك وشەش؟
- هەرگیز، هەر یەك وشەش، بەڵام پێم بڵێ.. بۆ دەپرسی؟
- وەڵڵا لەترسان.
- بۆ تۆم سۆیەر خۆ ئەگەر ئەو نهێنییە بڵاوبێتەوە، تۆ دوو ڕۆژیش ناژی، تۆ دەزانی

تۆم کەمێك هێوربۆوە، پاش دەمێك گوتی:

- هاك، ناتوانن بەخورتی قسەت لێ دەرێنن؟
- قسەم لێ دەرێنن؟ بۆ، ئەگەر حەزبکەم ئەو پیاو خراپە زەفەرم پێ ببا، ئەوجا دەتوانن قسەم لێ دەرێنن. دەنا چ ڕێگەی دیکە نییە.

- باشە، کەواتە پێموایە تا دەنگ نەکەین کێشەمان نابێ، بەڵام با دیسان سوێند بخۆین. هەرچۆنێك بێ ئەوە پتر مایەی دڵنیاییە.

- باشە رازیم

هەردووك لەدڵیانرا دووبارە سوێندیان خواردەوە.

- هاك ئەو قسانە چین دەکرێن، زۆرم گوێ لێبووە

- قسە، ئەوە هەمووی مەف پۆتەرە، مەف پۆتەر، هەموو دەمێ مەف پۆتەر. لەتاوان ئارەقەی پێکردووم و جووڵەی لێ بڕیوم و وای لێکردووم حەزبکەم خۆم لەپەنایەك حەشاردەم.

- منیش چەندم گوێ لەو قسانە دەبێ، ئەو هەستانەم لا دروست دەبن. لاموایە بەرەو مردن دەچێ. باشە جارجارە تۆش خەمی لێ ناخۆی؟

- دەبێ بەردەوام، بەردەوام خەمی لێ بخۆم. خۆ پیاوێکی گەورە نییە، بەڵام قەت خراپەی کەسی نەبووە. هەر خەریکی ماسیگرتن بوو تا بڕە پارەیەك پەیداکا و خۆی پێ مەستکا. زۆریش لەو ناوە دەکەوت، بەڵام خۆ ئێمەش زۆرینەمان وا دەکەین، پیاوێکی باش بوو، جارێك نیو ماسی دامێ، هەرچەند ماسییەکەی بەشی دوو کەسیشی نەدەکرد. زۆر جاریش کە بەخت پشتی تێ دەکردم ئەو پشتی دەگرتم.

- باشە هاك، زۆرجار پووشکاغەزیشی بۆم دروستدەکرد و قولابی ماسی بۆ من هەڵدەدا، چەندم حەز لێیە بتوانین لەوێ دەری بێنین.

- نا تۆم ناتوانین، پاشان ئەمە سوودیشی بۆ وی نابێ، چونکە زۆری پێناچێ دەیگرنەوە.

- راستە.. دەیگرنەوە، بەڵام زۆرم پێناخۆشە ئاوا بە خراپە باسی بکەن، کە ئەویش چ تاوانێکی نەکردبێ.

- منیش هەروەتر، گوێم لێبوو دەیانگوت، لەهەموو تاوانکارانی ئەم وڵاتە خراپ و خوێناوی ترە و لاشیان سەیر بوو کە تا ئێستا هەڵنەواسراوە.

- بەڵێ هەمیشە وا دەڵێن. بیستم دەشیانگوت، ئەگەر بەریش بدرێ هەر دەیفەوتێنن.

- لاموایە واشدەکەن.

هەردووکیان زۆریان قسەکرد، بەڵام تەنیا کەمێك پێی حەسانەوە، لەدەمی بولێڵیشدا دیتیان وا لە نێزیك زیندانە دوورە دەستەکەن. وەك بڵێی هیوایەکی نادیاریان هەبوو کە شتێك رووبدا و ئەو خەمانەیان لەکۆڵکاتەوە. بەڵام ئەو شتە هەر رووی نەدا. پێدەچوو چ پەرییەك نەبێ بایەخ بەو گیراوە بەدبەختە بدات.

ئەو دوو کوڕە پێشتر چییان بۆ پۆتەر دەکرد، بۆیان کردووە، لە پەنجەرەی زیندانەکەوە، بڕە تووتنێك و چەند دەنکە شقاتەیەکیان دەدایە. چونکە زیندانەکە لەچینی سەرزەوی دابوو، کەسیش نۆبەتی لیٚ نەدەگرت.

پێشتر کە لەپای دیارییەکانیان زۆری سوپاس دەکردن، ویژدانی ئازار دەدان. ئێستا هەر دڵیان پێی لەت لەت دەبوو، خۆیان وەك دوو کەسی تا ئەوپەڕی ترسنۆکی ناپاك ناکەس دەهاتە بەرچاو، بەتایبەتی کە پۆتەر گوتی:

ئێوە زۆر لەگەڵ من باشبوون و لەهەموو کەسێکی ئەم شارە باشترن، منیش هەرگیز ئەمە لەبیر ناکەم. زۆرجاریش بەخۆم دەڵێم، دەڵێم من راهاتبووم پووشکاغەز و شتی هەموو کوڕەکان چێکەم و پیشانیان بدەم باشترین جێگەی ماسی گرتنیٚ لەکوێیە و بەپێی توانای خۆم دۆستایەتیان بکەم، بەلاٚم ئێستا هەموو مەڤی پیریان لەبیر چووە، کە کەوتۆتە نێو گرفتان و کارەسات دەوریان لێداوە. بەلاٚم نە تۆم و نە هاك لەبیریان نەکردووە و لەبیریشی ناکەن. دەڵێم، منیش لەبیریان ناکەم. باشە کوڕینە دڵتەنگ مەبن، من تا سەرخۆشبوون خواردبوومەوە و ئەوەدەمی شێت بووم. لێکدانەوەی من وایە کە ئێستاش دەبیٚ لەدارم بدەن، لاموایە ئەمەش دادوەرییە، ئەمە راستە، رەنگە ئەو دادوەرییەش چاکترین چارەسەری هەڵوێستێکی وابیٚ، بەڵیٚ، هەرچۆنێك بیٚ. جارێکی دی باسی ئەو مەسەلەیە ناکەین نامەویٚ خەمتان بدەمیٚ، بەلاٚم دەمەویٚ پێتان بڵێم نەکەن شەراب بخۆنەوە، تەنیا بەمە لەوە دووردەکەونەوە کە بکەونە زیندانی ئاوا. ئاوا روو لە رۆژئاوا راوەستن. کە مرۆڤ لەدەمی کارەساتان بڕوانێتە رووی دۆستان، دەحەسێتەوە، لەو کاتانەی لە ئێوە بترازیٚ کەسی دیکە نایەتە ئێرە. رووی ئێوە زۆر دۆستانەیە، یەکتان بچنە سەر پشتی ئەوی دی تا بتوانم دەست لە دەموچاوی بدەم. بەڵیٚ با تۆقە بکەین، دەستی ئێوە بچووکە و دەکریٚ بێتە ئەم دیوی شیشبەندەکە، بەلاٚم دەستی من ئەستوور و زلە، دەستی ئێوە بچووك و لاوازە، بەلاٚم یارمەتی مەف پۆتەریان داوە و بتوانن هێشتا یارمەتی دەدەن.

تۆم بەخەمباری گەڕاوە ماڵیٚ، ئەو شەوە خەونەکانی پڕ ترس بوون. بۆ سبە و دووسبەی دەوروبەری هۆڵی دادوەری بەرنەدەدا. هاندەرێك هەبوو پاڵی دەنا بچێتە نێو هۆڵی دادگە، بەلاٚم هەر خۆی راگرت و نەچووە ژوور، هاکیش هەمان دەردی هەبوو، هەردووك خۆیان لێك دەپاراست و جارجار هەر یەکە بەلایەکدا دەچوون، بەلاٚم ئەفسوونێك هەبوو بەرەو ئەوێی دەهێنانەوە. هەرکاتێك خەڵك لە هۆڵی دادگە دەهاتنە دەریٚ، تۆم گوێی هەڵدەخست، بەلاٚم

زۆرینەی جار هەواڵی گورچکبڕی دەبیست. دیاربوو بەرەبەرە پەتەکە لەملی پۆتەری هەژار نێزیك دەبۆوە. لە کۆتایی ڕۆژی دووەم قسەوباسی گوند لەبارەی کاریگەریی یەکلاکەرەوە شایەدییەکەی ئینجەن جۆ بوو. کەسیش گومانی لەوە نەمابوو کە سوێندخۆرەکان چ حوکمێك دەردەکەن.

تۆم تا درەنگی شەوێ لە دەرێ بوو، وەکو دابی چەندجارەی درەنگ لە پەنجەرە ڕا دزەی کردەوە ناوجێی خۆی، بەڵام باری دەروونی یەکجار شڵەژابوو. ساتانێکی زۆر بەسەرچوون تا چاوی کەوتە خەوێ.

بەیانییەکەی هەموو خەڵکی گوندی لە دادگە ئامادەبوون. چونکە ئەو ڕۆژە حوکمەکە دەردەچوو. ئامادەبووانی هەردوو ڕەگەز بە ژمارە لێك نێزیکبوون.. هۆڵەکە پێشتر هەرگیز ئەوەندە تژی نەبوو بوو. پاش چاوەڕوانییەکی زۆر سوێندخۆران لەشوێنی خۆیان ریزبوون.

ئەوجا پۆتەریان هێنا کە شەکەتی و ترس و تۆقینی لێ دەباری. سندمی لە پێیاندا بوو، لە شوێنێکی وایان دانا، کە لەهەموو چاوە مۆلەقەکانەوە دیاربێ. ئینجەن جۆش لە ئامادەبووان جودانەبوو، بەڵام ئەو هەروەك دابی خۆی بێ جووڵە بوو. پاش دەمێك چاوەڕوانی دیکە دادوەر گەیشت و شەریف دەسپێکی دادگەییەکەی ڕاگەیاند. یەکسەر لەنێو پارێزەران ورتەورتە ئاساییەکە دەستی پێکرد و دەستیان بە کۆکردنەوەی کاغەزەکانیان کرد. ئەو وردەکاری و چاوەڕوانییانە ئەوەندەی دیکە کەشەکەیان ورووژاند.

شایەدێکیان بانگکرد گوایە مەف پۆتەری دیوە لە بەرەبەرە بەیانێکی زووی ڕۆژی تاوانەکە لەسەر ڕووباری خۆی شووشتووە و کە دیویە یەکسەر دوورکەوتۆتەوە. پاش ئەوەی کەمێك دواندیان و وتووێژیان لەگەڵ کرد، داواکاری گشتی گوتی:

- پارێزەر دەتوانێ لێی بپرسێ

زیندانییەکە ساتێك چاوەکانی بەرزکردەوە، بەڵام یەکسەر دایگرتنەوە کە گوێی لێبوو پارێزەرەکەی گوتی:

- من چ پرسیارم نین لێی بکەم.

شایەدی دووەمیش ڕایگەیاند کە چەقۆیەکی لەپاڵ تەرمی کوژراوەکەدا دۆزیوەتەوە. نوێنەرەکە دیسان گوتییە پارێزەر:

- بۆت هەیە پرسیاری لێ بکەی

پارێزەرەکەی پۆتەر وەڵامی دایەوە:

- هیچ پرسیارێکم نییە ئاراستەی بکەم

شایەدی سێیەم سوێندی خوارد، کە چەند جار ئەو چەقۆیەی لای پۆتەر دیوە.

- پرسیاری لێبکە.

پارێزەرەکە رایگەیاند کە پرسیاری نییە، تووڕەبوون بە چاوی ئامادەبووان دەرکەوت، ئەرێ دەبێ پارێزەر هەوڵدا مەعمیلەکەی خۆی دەداوێ خا و هەوڵێك نەدا داکۆکی لێ بکا؟

چەندین شایەدی دیکە هاتن و گوتیان پۆتەر تاوانکارە، چونکە بردبوویانە شوێنی تاوانەکە پەشۆکابوو. کە پارێزەریش رایدەگەیاند هیچ پرسیارێکیان لێ ناکا، سەکۆی شایەددانیان جێ هێشت.

بەمجۆرە هەرچی پێوەندی بە گۆڕستانەکە و رۆژی رووداوی تاوانەکە هەبوو هەمووی باسکرا، بەڵام کەس لەو شایەدانەی هاتن لەلایەن پارێزەری پۆتەرەوە قسەیان پێ نەبڕدرا و پرسیاریان لێ نەکرا. ناڕازیبوون و دڵەڕاوکێی ئامادەبووان لە چرپەچرپەکانیان دەرکەوت، کەوا چەند لە هەڵوێستی ئەو پارێزەرە ناڕازین، تەنانەت دادوەر و سوێندخۆرانیش بە چاوێکی لۆمەکارانەوە تەماشایان دەکرد. ئەوەبوو داواکاری گشتی گوتی:

- بە حەقی سوێندی ئەو شایەدانەی راستگۆییان جێی گومان نییە، ئەو تاوانە گەورەیەمان لە ملی ئەو زیندانییە بەدبەختە چەسپاند و لێرەوە واز لەو کێشەیە دەهێنین.

پۆتەری بەستەزمان هەناسەیەکی هەڵکێشا و رووی خۆی خستە ناو دەستانی و جەستەی خۆی بەملا و ئەولادا دەهەژاند. لەکاتێکدا کە بێدەنگی هەموو هۆڵی دادگەکەی داگرت. پیاوەکان کاریگەربوون و ژنەکانیش سۆزیان بزوا و فرمێسکیان هاتەخوار ئەوجا پارێزەر هەستاوە و گوتی:

- گەورەم لەسەرەتای ئەم دادگەیە هەوڵماندا بسەلمێنین، کە مەعمیلەکەمان ئەو تاوانە ناهەموارەی ئەنجامداوە، لەکاتێکدا کە لەژێر کاریگەریی هوڕێنە دابووە و بەخواردنەوە مەست بووە. بەڵام ئێستا ئێمە دەسبەرداری ئەو داکۆکییەین و رای خۆمان گۆڕیوە، داواشتان لێ ناکەین بەزەییتان بەو تاوانبارە دابێتەوە، ئەوجا رووی لە فەرمانبەرەکە کرد و گوتی بانگی تۆم سۆیەر بکە!

هەر کێ لەوێ ئامادەبوو، سەرسامبوو، پۆتەریش لەهەمووان زیاتر. هەرچی هەیە چاوانی لەتۆم بڕیبوو کە لەشوێنی خۆی هەستایەوە و چووە سەر سەکۆکە. زۆر هەڵچوو بوو، ترس هەموو گیانی داگرتبوو، پاش ئەوەی سوێندی خوارد، پارێزەر لێی پرسی:

- تۆماس سۆیەر تۆ لە دەوروبەری نیوەشەوی حەڤدەی تەمووز لەکوێ بووی؟

تۆم تەماشایەکی رووە ئاسنینەکەی ئینجەن جۆی کرد، یەکسەر نوتقی گیرا. ئامادەبووان پشی خۆیان راگرت تا گوێی بدەنێ، بەڵام متەق لە زاری تۆم دەرنەدەچوو. پاش چەند ساتێك هەرچۆن بوو کەمێك شنکی دایەوە بەرخۆی و بەدەنگێکی نزم، کە تەنیا چەند کەسێك بیستیان گوتی:

- لە گۆڕستان

- تکایە کەمێك دەنگت هەڵبڕە، مەترسێ، لەکوێ بووی

- لە گۆڕستان

لێوەکانی ئینجەن جۆ زەردەخەنەیەکی تووڕەیان کەوتەسەر

- ئایا لە گۆڕی هۆرس ویلیامز نێزیکبووی

- بەڵێ گەورەم

- دەنگت بەرزکەوە، چەند لێی نێزیکبووی؟

- ئێستا چەند لە تۆ دوورم ئەوەندە

- خۆت حەشاردابوو یان نا؟

- خۆم حەشاردابوو.

- لەکوێ؟

- لە پشت ئەو داربەڕووەی لێوار گۆڕەکە

ئینجەن جۆ راچەنی

- کەست لەگەڵدا بوو؟

- بەڵێ گەورەم لەگەڵ..

- راوەستە، راوەستە، پێویست ناکا ناوی هاوەڵەکەت بڵێی، لەکاتی گونجاودا بانگی دەکەین، کە چوویە گۆڕستان چت لەلا بوو؟

تۆم شپرزەیی و دوودڵی لێ دەرکەوت

- قسە بکە کورم، دوودڵ مەبە، هەمیشە راستی جێگەی ریزە، چیت لەگەڵ خۆت بردبوو؟

- تەنیا.. پشیلەیەکی تۆپیو

هێندەی نەمابوو ئامادەبووان لە پرمەی پێکەنین بدەن، بەڵام دادگە داوای بێدەنگی لێکردن.

- پاشان تەرمی ئەو پشیلەیەش پیشان دەدەین.. ئێستا کوڕی خۆم، هەموو ڕووداوەکەمان پێ بڵێ چۆنت حەز لێیە وامان بۆ بگێڕەوە و هیچ لەبیرمەکە و ترسیشت نەبێ.

لەسەرەتا بە دوودڵی تۆم دەستی بەگێڕانەوە کرد. پاشان کەوتە سەر قسان و ئاسانتر قسەی بۆ دەهاتن. پاش کەمێك لەدەنگی وی بترازێ هیچ دەنگی دیکە نەمان، هەموو چاوەکان ڕوویان تێکرد و ئامادەبووان وشە وشە گوێیان دەدایە و دەمیان داپچڕابوو، هەناسەیان نەدەدا و بایەخیان بە تێپەڕبوونی کات نەدەدا. چونکە ئەو سەربردە سەیرە مێشك و دڵی داگرتبوون و وروژاندیش ئەو دەمە گەیشتە ئەوپەڕی، کە کوڕیژگەکە گوتی:

- کاتێك دکتۆر پارچە ئاسنەکەی سەر گۆڕەکەی بەرزکردەوە و لە مەف پۆتەری دا و قیڕەبڕی کرد. ئینجەن جۆ بەدەست و چەقۆوە بازیدا و..

زرنگە لە جامی پەنجەرەی هۆڵەکەوە هات و ئینجەن وەکو تیر لە پەنجەرەکەوە بۆی دەرچوو، بەهێز و ملەکردن ڕێی خۆی کردەوە و بزر بوو.

# پاژی بیست و چوارەم

تۆم دیسان بووە پاڵەوان و ئەستێرەیەکی پرشنگدار و نازداری گەوران و مایەی ئێرەیی گچکان، تەنانەت ناوی لە رۆژنامان دەرکەوت و رۆژنامەکەی گوند پێیدا هەڵگوت. خەڵکانێك هەبوون پێیان وابوو ئەگەر نەمرێ، رۆژێك دەبێتە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان.

وەکو باویشە دنیا دەروازەی بە ڕووی مەف پۆتەردا کردەوە و پێشتر چۆنی ئازاردابوو، بەهەمان شێوە نازی پێی دەدا، بەڵام کە ئەو رەفتارە سوودی کۆمەڵگەی هەبێت، پێی ناوێ بەخراپە باسی بکەین.

تۆم کەوتبووە رۆژی خۆشی و سەروەری خۆی، بەڵام شەوانی وەرزی ترس و تۆقین بوون، دێوەزمەی ئینجەن جۆ خەونەکانی لێ ئاڵۆز دەکرد. وای دەهاتە بەرچاو کە چاوانی پڕ غەدر وکینە بن. بۆیە دوای شەوداهاتن، کەس نەبوو بتوانێ ئەو کوڕە رازیکا تا لە ماڵێ دەرکەوێ. هاکی نەگبەتیش تووشی هەمان دۆخی ترس و تۆقین بوو. شەوی پێش بڕیاردانی حوکم لەو دۆزەدا، هاك هەر زراوی لەوەی چوو بوو کە شتێك لەربارەی رۆڵی وی لەو تراژیدیایە بزانرێ. هەرچەندە بەهۆی هەڵاتنی ئینجەن، لە چوونی بۆ دادگە و شایەدیدان بوورابوو. ئەو کوڕە بەدبەختە بەڵێنیشی لە پارێزەر وەرگرتبوو کە کارەکە هەمووی بە نهێنی بێ. بەڵام دەبێ سوودی ئەو بەڵێنە چ بێ؟ ویژدانی تۆم ئەوەندەی ئازاردا وای لێکرد شەوێ بچێتە ماڵی پارێزەرەکە و تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ بگێڕێتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە لەگەڵ هاك سوێندیشیان خوارد بوو، بۆیە هاك متمانەی بە هیچ کەسێك نەما.

مەف پۆتەر رۆژانە سوپاسگوزاری خۆی بۆ تۆم دەردەبڕی، ئەمە وای لەو کوڕە کردبوو هەست بە ئاسوودەیی بکا. بەڵام هەرکە شەو دادەهاتەوە پەشیمان دەبۆوە و خۆزگەی دەخواست هەردەمی لێك نەترازاندبا..!

تۆم ترسی ئەوەی هەبوو کە ئینجەن دەستگیرنەکرێ، یاخۆ ئەوسا دەستگیر بکرێ کە هەموو شتێك تەواوبووە، وای هەست دەکرد تا ئەو پیاوە نەمرێ و تەرمەکەی نەبینێ، ناتوانێ

هەناسەیەکی ئازادانە هەڵکێشێ. تۆم لەپای ئەو ئازایەتییەی بۆ پاککردنەوەی شار لە تاوانکاران نواندی پاداشتێکی پێدرا، بەڵام کەس نەیتوانی رێوشوێنی ئینجەن بدۆزێتەوە.

لە سانت لویسەوە پۆلیسێکی نهێنیان هێنا لەوانەی کە کاری ناوازە ئەنجام دەدەن، ئەو لێتۆژە لێرەو لەوێ گەڕا، پاشان سەری خۆی لەقاند و بە ڕاستی گوتی: هیچ بەڵگەیەکی دەست نەکەوتووە. ئەو کاتەی ئەو پۆلیسە نهێنییە کارەکەی تەواو کرد و گەڕاوە ماڵی خۆی، دیسان ترس و دڵەراوکێ ملی تۆمیان گرتەوە. رۆژەکان زۆر بە گرانی تێپەڕدەبوون، هەر رۆژێکیش بڕە ترسێکی قورستری بەدوای خۆیدا بەجێدەهێشت.

## پاژی بیست و پێنجەم

هەموو کوڕێکی تەندروست و بەهێز، لەژیانیدا کاتێکی بەسەردادێ حەزدەکا بچێ شوێنێك هەڵکۆڵی تا گەنجێکی حەشاردراوی تێدا بدۆزێتەوە. ڕۆژێك لەناکاو تۆمیش ئەو هەستەی لا دروست بوو. گەڕا تاکو جۆ هارپەر بدۆزێتەوە، بەڵام نەیتوانی ڕازی بکا لەگەڵی بچێ. بۆیە چووە دیدەنی بێن ڕۆجەرز، بەڵام ئەویش چوو بووە ڕاوەماسی. پاشان لەگەڵ هاك فینی دەست سوور تێك هەڵەنگوتن. هاك ڕازی بوو لەگەڵی بچێ. تۆم بردییە لایەك و بە متمانەوە بابەتەکەی پێگوت، هاك هزرەکەی بەدڵ بوو، چونکە هەمیشە بۆ ئەو جۆرە کارانە ئامادەبوو. بەشداربوون لەهەر پرۆژەیەك مایەی خۆشی بوو، پارەشی تێنەدەچوو، ئەویش کاتی لە هەموو شتێك زیاتر بوو. هاك گوتی: باشە کوێ هەڵدەکۆڵین؟

-هەر کوێیەك

- بۆ، دیارە لەهەموو جێیەك گەنجینە شاردراوەتەوە

- بێگومان نا هاك، تەنیا لە چەند شوێنێکی دیاریکراو حەشاردراون، هەندێجار لە دوورگان دان. جاریش هەیە لە سندوقی خۆرك لێدراو لەژێر قەدی درەختێکی کۆنە ساڵی مردوو، لەو شوێنەی کە لەکاتی نیوەشەوێ سێبەری دەکەوێتە سەر، بەڵام بەزۆری لەژێر دیواری کۆنە خانووی پڕ لەمە چێتر.

- کێ دەیشارێتەوە؟

- کێ؟ دزەکان. ئەی لاتوایە کێ؟ مامۆستایانی فێرگەی یەکشەم؟!

- نازانم، خۆ ئەگەر هی من بێ قەت نەمدەشاردەوە و هەر خەرجم دەکرد و کاتی خۆشم پێ ڕادەبوارد .

- منیش هەروا، بەڵام دزەکان وا ناکەن، ئەوان هەمیشە گەنجینەکانی خۆیان دەشارنەوە و لەوێ بەجێی دێڵن.

- پاشان چیدی نایەنە دوای

- نا.. لایانوایە دێنەوە، بەڵام بە گشتیی شوونەکانیان لەبیردەکەن. هەشیانە دەمرن، هەرچۆنێ بێ گەنجینەکە بۆ ماوەیەکی زۆر لەجێی خۆی دەمێنێتەوە تا ژەنگ هەڵدەهێنێ. رۆژێکیش دادێ یەکێك کۆنە کاغەزێکی زەرد هەڵگەڕاو دەدۆزێتەوە و بۆی دەردەخا چۆن ئەو نیشانانە بدۆزێتەوە. کاغەزێك کە بەلای کەم هەفتەیەکی بوێ تا شیفرەکانی شی بکرێنەوە، چونکە زۆرینەی ئاماژە و هێرۆگلێفین.

- هیرۆ چی...؟

- هێرۆگلێفی.. وێنە و شتی وا، دەزانی کە هیچ واتایەکیان هەبێ

- تۆم، تۆ هیچت لەو کاغەزانە دەسکەوتووە

- نا

- باشە، کەواتە چۆن دەتوانی نیشانەکان بدۆزیتەوە؟!

- پێویستم بە هیچ نیشانەیەك نییە، چونکە ئەوان هەمیشە گەنجینەکانیان لەبن خانووێکی دێوەزمەنشین یاخود لە دوورگەیەك یان لەژێر درەختێکی مردوو کە تەنیا لقێکی لێ مابێتەوە. هەرچۆنێك بێ، تا رادەیەك لە دوورگەی جاکسۆن شارەزا بووین، دەتوانین کاتێکی دیکە بچینەوە ئەوێ کۆنە خانووێکی خێونشین لە ستیل هاوس هەیە، هەروەها زۆر قەدە داری مردووش هەن.

- گەنجینە لەژێر هەموو ئەو شتانەدا هەن؟

- ئەوە چ دەڵێی! نا!

- باشە جا چۆن دەزانی بەرەو کێهەیان دەچی؟!

- جا بەرەو هەموویان دەچم

- خۆ ئەوە هەموو هاوینەکە دەخایەنێ

- جا چییە؟ وا دانێ کۆنە دەفرێکی مسینمان دۆزییەوە، کە سەد دۆلاری ژەنگاوی تێدا بوو، یان سندوقێکی داخوراوی پڕ ئەڵماس، ئەوکاتە رات چۆن دەبێ.

چاوی هاك بەڕەونەق کەوتن.

- ئەو سامانێکە، بۆ من سامانێکی زۆر گەورەیە،هەر سەد دۆلارەکەم بدەیە بەسمە، پێویستم بە ئەڵماس نییە

- زۆر باشە، چونکە من دەسبەرداری ئەڵماسەکان نابم، چونکە پارچەی تێدایە بیست دۆلار دەهێنێ. هەر چۆنێك بێ، پارچەی تێدا نییە شەش پێنس یاخۆ دۆلارێك نەکا

- بەراست..؟!

- بەڵێ، هەموو کەسێك دەتوانێ پێت بڵێ، هاك تۆ پێشتر ئەڵماست نەدیوە؟

- بەبیرم نایێ

- پادشاکان ئەڵماسیان گەلێك زۆرە

- بەڵام تۆم من پاشایان ناناسم؟

- دەزانم نایانناسی، بەڵام ئەگەر بۆت رەخسا بچییە ئەوروپا، زۆریان لێ دەبینی لەو دەوروبەرە خۆیان بادەدەن.

- بەڕاستی خۆیان بادەدەن؟!

- نا نا هەی گێلە

- باشە ئەی بۆ گوتت وا دەکەن؟

- هەر ویستم بڵێم لەوێ دەیانبینی. بەڵام خۆیان وا بانادەن کە تۆ تێی دەگەی.. مەبەستمە بڵێم بەفیز و لەخۆباییبوونەوە لەوێ دەچنە ئەوێ.

- ریچارد؟ ئەی ناوەڕۆکەکەی دیکەی چییە؟

- چ ناوی دیکەی نین، پاشا لە ناوێك پتریان نییە

- نا....؟!

- بەڵێ.. نیانە

باشە تۆم مادام حەزیان لێیە با وابێ، بەڵام من حەز ناکەم ببمە پاشا، نەوەك وەکو قولێك تەنیا یەك ناوم هەبێ. لەوەگەڕێ... پێم بڵێ تۆ یەکەمجار کوێ هەڵدەکۆڵی؟

- باشە، نازانم، پێت چۆنە لەلای ئەو پیرە دارە مردووە بگەڕێین، کە لەسەر گردەکەی ئەو دیوی ستیل هاوسە.

- پێم باشە

ئەوجا کۆنە قازمەیەك و خاکەناسێکیان دەست دابێ و بۆ دووری سێ میل بەڕێکەوتن، کە گەیشتن گەرمایان بوو و هێنکەیان لێ بڕابوو، لەبن سێبەری رەشە دارێکی نێزیك راکشان تا بحەسێنەوە و قەلوونێك بکێشن.

تۆم گوتی: حەزم لەوەیە

- هەروا منیش

- هاك پێم بڵێ ئەگەر لێرە گەنجینەیەکمان دیتەوە، چ لە بەشی خۆت دەکەی؟

- هەموو رۆژێ پاروو پەنیرێك و شووشە سۆدایەكی پێدەكرم و هەر سێركێك هاتە ئێرە دەچمە سەیری، دڵنیاشم كاتێكی خۆش بەسەر دەبەم

- باشە هیچی لێ هەڵناگری؟

- هەڵیگرم؟ بۆچی؟

- تا شتێكت بمێنێ بەرەبەرە پێی بژی

- جا ئەوە سوودی چییە، رۆژێك دادێ بابم دێتەوە شاری و چنگی لێگیر دەكا. دڵنیات دەكەمەوە هەر خێرا پوولی تێدا ناهێڵێ.

تۆم ئەی تۆ چ لە پشكی خۆت دەكەی؟

- دمبكێكی تازە و شمشێرێكی تیژ و قەرەوێتێكی سوور و گۆلكەگامێشێك دەكرم و ژنێكی پێ دێنم

- ژن..؟!

- بەڵێ

- تۆم بۆ ئەوە: ئەوە چییە دەڵێی تێكچووی

- چاوەڕێ بە.. دەبینی

- باشە، ئەمە دەبەنگترین شتێكە بیكەی، تەماشای باب و دایكی من بكە. چۆن بەردەوام شەڕیان بوو، چاكم لەبیرە.

- ئەوە هیچ نییە، ئەو كچەی من دەیخوازم، شەڕێ ناكا

- تۆم، پێموایە هەموویان پێكدەچن، تووكی پیاو هەڵدەكێشن، بۆیە وا چاكە چاك بیری لێ بكەیەوە، ئەو كیژۆكەیە ناوی چییە؟

- كیژۆكە نییە.. كچە

- هەمووی یەكە، هەیە دەڵێ كیژ و هەیە دەڵێ كچ، هەردووك راستن، هەر چۆنێك بێ، ناوی چییە؟

- كاتێك دێ پێت دەڵێم ئێستا نا

- باشە، ئەوەندە بەسە، بەڵام كە تۆ ژن بێنی، من لە هەموو كاتێ تەنیاتر دەبم.

- نا نا وا نابێ، تۆش دێی لەگەڵ من بژی، ئێستا واز لەوە بێنە، با دەست بە هەڵكۆڵینێ بكەین

دەستیان بەکار کرد و نیو سەعات بەردەوامبوون، تك تك ئارەقەیان لێ دەتکا، ئەنجامیش نەبوو، نیوسەعاتی دی هەڵیانکۆڵی، هەر هیچ نەبوو، هاك گوتی:

- ئەرێ ئەوە هەمیشە وا قووڵیان شاردۆتەوە.

- هەمیشە نا، هەندێ جار، لاموایە شوێنێکی راستمان هەڵنەبژاردووە.

شوێنێکی دیکەیان هەڵبژارد و دووبارە دەستیان پێکرد، هەر چەند لەبەر ماندوویێتی، دەستیان ساردبوو،بەڵام لە هەڵکۆڵینی بەردەوام بوون، ماوەیەك بە بێدەنگی خەریکبوون، لەکۆتاییدا هاك خۆی بەسەر تەورەکەی دادا و ئارەقەی لاجانگی بە لچێکی قۆڵی کراسەکەی سڕییەوە و گوتی:

- کە لەوەش تەواوبووین، کوێی دیکە هەڵدەکۆڵی؟

- رەنگە وا چاکتر دەبێ ژێر درەختەکەی سەرگردی کاردیف هیلْ هەڵکۆڵین، کە دەکەوێتە پشت ماڵی بێوەژنێ.

- چاکی بۆچووی، بەڵام ئەدی بێوەژن بۆ خۆی نابا، مادام لەسەر زەوی وییە؟

- بۆخۆی بیبا؟ رەنگە جارێك هەوڵدا، بەڵام هەرکێ ئەو گەنجینانە بدۆزێتەوە بۆ خۆیەتی، بە چاوپۆشین لەوەی کێ خاوەنی ئەرزییەکەیە!

ئەمە دڵی رازی کرد، کارەکە بەرەبەرە بەرێوەدەچوو، هاك گوتی:

- ئەرێ پێتوانییە دیسان شوێنێکی هەڵە هەڵدەکۆڵین؟

- هاك سەیرە، من تێناگەم. هەندێ جار جادووگەریش دەست تێوەردەدەن لاموایە ئەوە هۆیەکەیە.

- قسەی قۆڕ، جادووگەر لەکاتی رۆژدا هیچ توانایەکی نییە!

- راست دەکەی، خۆ من بیرم لەوە نەکردبۆوە، بەڵام زانیم مەسەلە چییە، ئای کە گێل و نەزانین! دەبێ بزانی سێبەری لقەدارەکە لە نیوەشەو دەکەوێتە کوێ، ئەوجا ئەوێ هەڵکۆڵی.

- واتە ئەو هەموو ماندووبوونەمان بەفیڕۆچوو، مادام واشە، دەبێ شەوێ دیسان بێینەوە، جا رێیەکە چەند دوورە، دەتوانی بێیە دەرێ؟

- شەرتبێ بێم، دەبێ ئەمشەو کارەکە تەواوکەین، چونکە ئەگەر یەکێك ئەو قۆرتانە ببینێ، یەکسەر تێدەگا و بەدوایدا دەچێ.

- رەنگە، ئەمشەو دێمە لای ماڵتان و دەمیاوێنم.

- باشە، با کەرەستەکانمان لەنێو دەوەنان بشارینەوە.

کوڕەکان نێزیك لەکاتی دیاریکراوی نیوەشەوی گەڕانەوە ئەو شوێنە و لە سێبەرێ دانیشتن تا شەو بەنیوە بوو، شوێنێکی چۆڵ و دوورە دەست بوو، ئەو سەعاتەش بەپێی دابونەریتی کۆنینە بە پیرۆز دانرابوو، وایان دەزانی دەوەنەکان لەنێو گەڵای داران دەچرپێنن و خێوەکان خۆیان لە تاریکاییان پەناداوە، لەو ساتەش دەنگی وەڕینی سەگێکی بەرەڵا بەرزبۆوە، دەنگی پەپوویێکیش وەڵامی دایەوە. ئەوان ترسیان لە دڵدا نیشت، کەمێك قسەیان کرد تا خۆ بخافڵێنن، ئەوجا وایان دانا کە سەعات گەیشتۆتە دوازدە، ئەو شوێنەیان دیاریکرد کە سەری سێبەرەکەی لەسەرە و دەستیان بە هەڵکۆڵین کرد، زۆری نەبرد هیوایان بووژاوە و بایەخیان زیاتر بوو لەکارکردن بەردەوامبوون و قۆرتەکە بەرەبەرە قووڵتر دەبوو، هەرچەند جاری پارچەکەیان بە شتێك دەکەوت دڵیان دادەخورپا، بەڵام دیسان دڵساردەبوون، کە دەیاندیت تەنیا کوچکە بەردێکە، لەکۆتاییدا تۆم گوتی:

- بێ سوودە هاك، دیسان هەڵەین

- باشە، بەڵام پێم وایە هەڵە نین، چونکە شوێنەکەمان تەواو دیاریکرد.

- دەزانم، بەڵام شتێکی دیکە هەیە.

- چییە..؟

- هەر لەخۆڕا نیوەشەومان دیاریکرد. ڕەنگە زۆر درەنگتر یاخۆ زۆر زووتر بووبێ.

هاك خاکەناسەکەی تێهەڵدا و گوتی:

- ڕاستە، کێشەکە بەوەدایە، دەبێ واز لەم قۆرتەش بێنین، بەڵام ئێمە ناتوانین بە وردی کات دیاری بکەین، لەبیریشمە کە ئیشی شەوێ شتەکی دەوێ. جادووگەر و خێویش چواردەوریان تەنیوە، من هەست دەکەم شتێکم لەدوایە ڕاوم دەنێ و ناوێرم ئاوڕدەمەوە، چونکە ڕەنگە دێوەزمەی دیکەش هەبن لەپێشم ڕاوەستابن چاوەڕێی دەرفەتێك بن. هەر لەوەتی لێرەین من هەڵدەلەرزم.

- باشە، هاك منیش وەکو تۆم، چونکە زۆرینەی جار کە گەنجینەیەك دەشارنەوە هەر لە بن دارەکە پیاوێکی مردووش لەگەڵی وەبن گڵ دەدەن تا چاوی لێبێ.

- وەی خوایە!

- بەڵام.. وا دەکەن، زۆرجار وام گوێ لێبووە.

- تۆم من حەز ناکەم دەست لەو شوێنانە وەردەم، کە مردوویان لێیە، چونکە ئەوە ڕەنگە کێشەی گەورەمان بۆ دروستکات.

- منیش نامەوێ مردووان بورووژێنم ئەگەر مردووەکەی ئێرە کەللە سەری بەرزکردەوە و شتێکی گوت.

- بەسە تۆم، ئەوە زۆر ترسناکە.

- باشە هاك راستییەکەی وای، منیش هیچ ئاسوودە نیم.

- دەی تۆم با

ئێرە جێ بێڵین و جێیەکی دی هەڵکەنین.

- باشە، لام وایە وا باشترە.

- جا کوێ هەڵدەکۆڵین؟!

تۆم کەمێك ڕاما، جا گوتی:

- لەماڵە خێونشینەکە، ئەوێ باشە.

- تۆم ئەمن حەز لەو کۆنە ماڵانە ناکەم. ترسیان زۆر لە تەرمی مردووانیش زیاترە. راستە رەنگە مردوو بەقسە بێن، بەڵام خۆ گەر ئاگات لێ نەبێ لە تاریکیان لێت دەرناکەون و لەهیکڕا لەسەر شانت سەرت لێهەڵکێشن و ددانت لێ گرکەنەوە وەکو دێوەزمە و خێوان، من بەرگەی ئەو بارە ناگرم، پێم وا نییە کەسیش بەرگە بگرێ.

- وایە بەڵام هەر چۆنێك بێ خێوەکان تەنیا بەشەو دەردەکەون، کەواتە رێمان لێ ناگرن بە رۆژ ئەوێ هەڵکۆڵین.

- راستدەکەی بەڵام بێشك تۆش دەزانی نە بەشەو و نە بە رۆژ کەس ناچێتە ئەوێ.

- ئەمە رەنگە لەبەر ئەوە بێ خەڵك حەزناکەن بچنە شوێنێك پیاوێکی تێدا کوژرابێ، لەگەڵ ئەوەش تا ئێستا لە شەوان بترازێ هیچی دیکەی لێ نەبینراوە کە هەندێ تیشکی شین بەبەر پەنجەرەکاندا رەتدەبن، وەك منیش زانیبم، خێوەکان بە شێوەیەکی رێکوپێك دەرناکەون.

- باشە، کە یەکێك لەو تیشکە شینانە دەبینی، دڵنیابە دێوەزمەیەکی لەپشتە، چونکە تەنیا خێوەکان ئەو جۆرە تیشکانە بەکار دێنن.

- بەڵێ.. بەڵام هەرچۆنێك بێ لەکاتی رۆژدا دەرناکەون، جا چ پێویست دەکا لێیان بترسین؟

- زۆرباشە، مادام دەتەوێ ئەو خانووە چۆڵەش هەڵدەکۆڵین، بەڵام پێموایە ئەمە سەرکێشییە.

لەودەمەدا بە گردەکەدا هاتنەخوارێ، ئەو خانووە چۆڵەیان دی لە ناوەڕاستی دۆڵەکەدا تیشکی خۆری بەردەکەوت، زۆر ترسناك دەهاتە بەرچاو، زۆر لەمێژ بوو پەرژینەکەی

ڕووخابوو. دڕك و داڵ بە پەیژەکانیدا هەڵگەڕابوون، دووکەڵکێشەکە داڕووخابوو. پەنجەرەکان شووشە و داریان پێوەنەمابوون گۆشەیەکی بنمیچەکە کەلێنی تێکەوتبوو. منداڵەکان کەمێك تێی ڕامان، چاوەڕێی دیتنی تیشکی شین بوون لەبەر یەکێك لە پەنجەرەکانەوە تێپەڕێ. ئەوجا بە چرپە دەستیان بەقسان کرد، وەك ئەوەی لەگەڵ کات و دەوروبەرەکە ڕێککەوێ. جا بەلای راستدا چوونەخوار تا لەو کۆنە خانووە دووركەونەوە، بەرەو ماڵ رێی دارستانی پاڵ کاردیف هیلّیان گرتەبەر.

# پاژی بیست و شەشەمین

بۆ سبەی دەوروبەری نیوەڕۆیێ، هەردوو کوڕ گەیشتنە ئەو دارەی کەرەستەکانی خۆیان لەژێر شاردبۆوە. تۆم بۆ چوونەناو خانووە کۆنینەکە ئارامی لێ هەڵگیرابوو. هاکیش لەوی چاتر نەبوو، بەڵام لەناکاو گوتی:

- گوێ بدێ تۆم، دەزانی ئەمڕۆ چەند شەمەیە؟

تۆم بیری لە رۆژەکانی هەفتە کردەوە، لەهیکڕا چاوی بڵند کرد و بەترسەوە تێی ڕووانی:

- وەی خوایە، هاك خۆ من هەر بیرم لێ نەکردبۆوە.

- منیش هەروا. بەڵام لەناکاو بەبیرم هاتەوە کە ئەمڕۆ هەینییە.

- هاك مرۆڤ ناتوانێ هەموو دەمێ ئاگەداربێ رەنگە تووشی زۆر گرفتان هاتباین ئەگەر بەم هەینییە کارمان لێ کردبا.

- چەند رۆژێك رەنگە رۆژانی بەخت بن، بەڵام هەینی نا.

- هەموو دەبەنگێك ئەمە دەزانێ، لام وا نییە هاك تۆ یەکەم کەس بی ئەو راستەییەت دەرخستبێ.

- باشە خۆ نەمگوتووە من وام، وا نییە، هەموو هۆیەکەش هەینی نییە، دوێنێ شەو خەونێکی زۆر خراپیشم دیوە، خەونم بە جرجانەوە دیوە.

- نا..! ئەمە نیشانەی گرفتانە، جرجەکان بەشەڕ دەهاتن؟

- نا

- ئەمە باشە هاك، ئەگەر شەڕ نەکەن نیشانەی ئەوەیە کە تەنیا هەندێ گیروگرفت هەن، دەزانی ئەوەی لەسەرمانە دەبێ تەواو ئاگەداربین، با ئەمڕۆ واز لەمە بێنین و یاری بکەین. هاك تۆ رۆبن هوود دەناسی؟

- نا.. رۆبن هوود کێیە؟

- رۆبن یەکێك لە پیاوە هەرە مەزنەکانی ئینگلاند بوو، لە هەمووانیش باشتر بوو.. دز بوو.

- خۆزگە من بووام، دزی لەکێ دەکرد؟

- تەنیا لە کێخوا و قەشە و دەوڵەمەند و پاشا و هاوشێوەی ئەوان، بەڵام هەرگیز هەژارانی بێزار نەدەکرد. زۆری خۆشدەویستن، بۆیە دەستکەوتەکانی بە یەکسانی لەگەڵ دابەش دەکردن.

- بێگومان پیاوێکی باش بووە.

- بەڵێ هاك، وا بووە. لە هەموو پیاوان مەردانەتر بووە پێم وا نییە ئێستا کەسی وەك ئەو هەبێ. دەتوانم بڵێم، ئەگەر دەستێکیشی لەپشتەوەڕا بەسترابێ، هێشتا دەیتوانی هەر پیاوێکی ئینگلاند ببەزێنێ. دەیتوانی بە تیروکەوانە لووسەکەشی لەدووری میل و نیوێك نیشانەی هێندەی پەنجاییەك بشکێنێ.

- کەوانی لووس چییە؟

- نازانم، جۆرە کەوانێکە، جا ئەگەر تیرەکەشی بەلێوی پەنجاییەکە کەوتبا و ناوەندی نە پێکابا، کەوانەکەی فڕێ دەدا و تێر دەگریا، بۆ، نازانم، بەڵام با یاری رۆبن هوود بکەین، من فێرت دەکەم.

- باشە دەی.

جا هەموو دانی ئێوارەکە یاری رۆبن هوودیان کرد، ناوەناوەش تەماشای خانووەکەیان دەکرد و تێبینییەکیان دەدا لەبارەی ئەو شتانەی کە رەنگە سبەی تووشیان بێ. کە رۆژ هاتە ئاوا بوونێ، بەرەو ماڵ بوونەوە و زۆری نەبرد لەنێو کەڤاڵی دارستانی کاردیف هیلدا بزربوون.

رۆژی شەموو لەدەمی نیوەڕۆدا گەیشتنەوە لای دارە وشکەکە. پاش ئەوەی لە سێبەرێکدا قەلوونیان کێشا و گفتوگۆیان کرد. کەمێکی دی کۆنە قۆرتەکەیان هەڵکۆڵی، لەبەرئەوە نا کە تەمایەکیان پێمابێ، بەڵکو چونکە تۆم گوتی: زۆر جار هەبووە خەڵکیش چی وایان نەماوە بگەنە گەنجینەکە، وازیان هێناوە، پاشان یەکێکی دی هاتووە و لە شوێنی ئەوانیان هەڵکەندووە و بەچەند دەمەپاچێك گەنجینەکەیان دەستکەوتووە. لەگەڵ ئەوەشدا دیسان هیچیان نەدۆزییەوە، بۆیە کەرەستەکانیان بەکۆڵ دادا، هەستیان دەکرد کەموکوڕیان لە کارەکانیاندا نەبووە، بەڵام بەخت بۆی نەهێناون.

که گەیشتنە خانووە خێونشینەکە تێبینیان کرد، کە ئەوێ زۆر ترسناکە و بێجگە لەو چۆڵی و بێدەنگییەکەی شتی دیکەشی لێیە، کە دەبێتە مایەی دڵتەنگی. ساتێك ترسیان لێ نیشت و لە چوونەژووریێ سەنگرانەوە، پاشان بە پانەدزە بەرەو دەرگەکە چوون و تەماشایەکی ژوورێیان کرد و هەموو جەستەیان هەڵدەلەرزی. گژوگیا لە خاکەکەی شین ببوو، کۆنە ئاگردانێکی تێدابوو، پەنجەرەکان بێ پەروازە و جام بوون و تەونۆکە هەموو لایەکی تەنیبوون.. پاش دەمێك بەترس و لەرز بەرەو ژوور چوون بەچرپە لەگەڵ یەك دەدوان و دڵەکوتەیەکی توندیان گرتبوو، گوێیان بۆ هەر دەنگێك قولاغ بوو، هەموو ماسوولکەکانیشیان چوست و ئامادەی هەر پاشەکشەیەك بوو.

دەمێکی دی پێچوو، کەمێك ترسەکەیان رەوییەوە، ئەوجا چاوێکیان بە دەوروبەری خۆیاندا گێڕا، زۆر بە ئازایەتی خۆیان سەرسام و کەیفسازبوون. پاشان ویستیان بچنە سەیری نهۆمی سەرێ، دەتگوت بەمە رێی دەربازبوون لەخۆیان دادەخەن، بەڵام رکەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، پاشان کەلوپەلەکانیان هەڵدا گۆشەیەك و بە پەیژە داتەپیوەکە هەڵگەڕان، سەرێش هەر خاپوور و وێران بوو. لەگۆشەیەکیش کۆنە دۆڵابێکیان دۆزییەوە کە هیوای وەبەرهێنانەوە، بەڵام کە بۆیاندەرکەوت تەنیا سەندوقێکی بەتاڵە، ئەو ئاواتەشیان بەباچوو. ئێستا ئازایەتی خۆیان خڕ کردبۆوە. کە دەیانویست بچنە خواری و دەست بەکار بکەن. تۆم گوتی:

- وسسسس

هاك رەنگی لەترسان هەڵبزرکا بوو، گوتی: ئەوە چییە؟

- ششش.. لەوێ.. گوێت لێ نییە؟

- با.. وەی خوایە.. با غاردەین

- نەبزووی.. لەجێی خۆت نەجوولێی، ئەوانە بەرەو دەرگە دێن.

کوڕەکان لەسەر زەوی راکشان و لە کەلێنی نیوان تەختەکانەوە سەیریان دەکرد و تەواو تۆقیبوون.

- وا راوەستان.. نا.. وا دێن.. ئەوەتان، هاك یەك وشەی دیکەش مەچرپێنە. ئای خوایە خۆزگە خۆم تووشی ئەمە نەکردبایە.

دوو پیاو بە ژوورێ کەوتن، کوڕەکان هەر یەك لەبەرخۆیان گوتیان: یەکێکیان ئەو ئیسپانییە کەڕولاڵەیە، کە بەم دواییە یەك دوو جارمان دیوە، بەڵام ئەوی دیمان هەر نەدیوە.

پیاوەکەی دی، یەکێکی جل شڕی قژنی سەر و پرچ تێك ئالاوی ڕەزاقورسی ترسناك بوو، ئیسپانییەکەش بە پارچەپەڕۆیەك دەمامکی خۆی دابوو. سمێڵە زل و چرەکەی سپی ببوو، پرچە درێژەکەی تا سەر لێواری کڵاوە پانەکەی شۆڕببۆوە و چاویلکەیەکی سەوزی لە چاواندا بوو. کە وەژوورکەوتن، پیاوەکەی دی بە دەنگێکی نزم دەدوا، پاشان لەسەر زەوی دانیشتن روویان لە دەرگە و پشتیان لەدیوار کردبوو. قسەکەرەکە لە ئاخافتنی بەردەوام بوو، بەرەبەرە ئاگای لەخۆ نەما و دەنگی دەبیسترا کە گوتی:

- نا.. زۆرم بیر لێ کردۆتەوە، حەزی لێ ناکەم، چونکە زۆر ترسناکە.

منداڵەکان سەرسامبوون، ئیسپانییە کەڕلاڵەکە گوتی:

- ترسناك.. قسەی پووچ.

دوو کوڕەکە هەر زراویان چوو کە زانیان ئەوە دەنگی ئینجەن جۆیە. پاش دەمێك بێدەنگی، جۆ گوتی:

- هیچ شتێك هەیە لە کارەکەی دی ترسناکتر.. کە هیچی لێ نەکەوتەوە.

مەسەلەکە جودایە، چونکە شوێنەکە لەوپەڕی رووبارەکەیە و تەواو دوورەدەستە و هیچ ماڵێکی لێ نێزیك نییە، هەرچۆنێك بێ کەس نازانێ هەوڵمانداوە هەرچەند سەریش نەکەوتین.

- باشە، چ لەوە ترسناکترە کە ئێمە بەرۆژ دێینە ئێرە، خۆ هەرکەس بمانبینێ شك و گومانمان لێ دەکا.

- دەزانم، بەڵام شوێنێکی نێزیکتر نەبوو پەنای بۆ ببەین، پاش ئەوەی کارەکەمان سەری نەگرت. من دەمەوێ ئێرە جێ بێڵم، بەتەمابووم دوێنێش بڕۆم، بەڵام ئەو دوو کوڕە نەفرەتییە لەسەر گردەکە گەمەیان دەکرد و دەیانتوانی ببینن.

- ئەو دوو هەتیوە نەگبەتە

دیسان کوڕەکان لەترسی ئەو قسانە تۆقین، بەختیان چەند یاربوو کە هاتەوە یادیان هەینییە و رۆژێك خۆیان دواخست. لەدڵەوە خۆزگەیان دەخواست ساڵێك چاوەڕێ بان.

دوو پیاوەکە هەندێ خۆراکیان دەرهێنا و خواردیان، پاش بێدەنگی و بیرکردنەوەیەکی درێژ، ئینجەن جۆ گوتی:

- تەماشا.. تۆ بەرەو لای رووبارەکە بۆ شوێنی خۆت بگەڕێوە و چاوەڕێبە تا شتێك لەمنەوە دەبیستی، بەڵام من جارێکی دیکەش دەچمەوە ناو ئەو شارۆچکەیە و چاوێکی پێدا

دەگێڕم. کە بڕێکی دیکە هەواڵم کۆکردەوە و هەموو شتێك لەباربوو ئەوجا کارە ترسناکەکەمان ئەنجام دەدەین، پاشان پێکەوە هەردووکمان بۆ تێکساس دەچین.

دووبارە بێدەنگبوونەوە و خەوەکوتکە دەیبردنەوە، زۆری نەبرد ئینجەن جۆ گوتی:

وا بۆ خەوێ دەمرم.. نۆرەی تۆیە چاودێری بکەی.

بەسەر گژوگیاکەدا راکشا و هێندەی پێنەچوو پرخە پرخی لێ بەرزبۆوە. هاوەڵەکەی یەك دوو جاران رایهەژاند، خەبەری نەبۆوە.. پاش دەمێك چاودێرەکەشی وەنەوزی داو سەری بەسەر سینگیدا شۆڕبۆوە و ئەویش کەوتە پرخەپرخ کردن.

کوڕەکان هەناسەیەکی ئارامیان هەڵکێشا. تۆم چرپاندی:

- ئێستا دەرفەتی ئێمەیە.. وەرە!

هاك گوتی:

- ناتوانم.. ئەگەر وەئاگا بێن هەر لەترسان دەمرم.

تۆم هانیدا، بەڵام هاك لە شوێنی خۆی نەبزووت. لەدواییدا تۆم هێدی هەستاوە و بەنەرمی رۆیی تا بە تەنیا لە پەیژەکە بچێتە خوار، کەچی هەر لە هەنگاوی یەکەم جیڕەجیڕێکی لێوەهات، لەترسان خۆی بەرداوە و چیدی هەوڵی نەدا هەستێتەوە. ئەو دوو کوڕە ئەوەندە لە زەوی وەرکەوتن هەر ساتێکیان لێ ببووە ساڵێك، وایان دەزانی کات هەر ناڕوا، بەڵام کە هەستیان کرد رۆژ بەرەو ئاوابوونێ دەچێ پشییەکەیان هاتەوەبەر.

لەناکاو پرخەی یەکێکیان راوەستا، ئینجەن جۆ هەستاوە دانیشت، لە دەوروبەری خۆی راما، کە دۆستەکەی دیت سەری کەوتۆتە سەر ئەژنۆی، لە خەمان پێکەنی و پێیەکی گەیاندێ و گوتی:

- هۆی پاسەوان، هەستە، هەر باشە هیچ رووی نەداوە!

- وەی خوایە، ئەوە نووستبووم؟

- ئا بۆرژابووی، کاتی ئەوە نێزیك بووە بڕۆین، بەڵام چ لەو سامانەمان بکەین؟

- نازانم، وەك جاران لێرەی بەجێ بێڵین، لاموایە بەر لەوەی بەرەو تێکساس بەڕێکەوین، بێسوودە لەگەڵ خۆمانی ببەین، شەش سەد و پەنجا دۆلاری زیو بە ئاسانی هەڵناگیرێ.

- زۆرباشە، چ رێمان لێ ناگرێ جارێکی دیکەش بێینەوە ئێرە.

- نا بەڵام وا چاکترە وەك راهاتووین بەشەو بێینەوە.

- راستە، بەڵام تەماشاکە، رەنگە زۆری پێ بچێ تا بۆم رێدەکەوێ کارەکە ئەنجامدەم. لەو ماوەیەش رەنگە زۆر شت رووبدەن و ئێرەش زۆر شوێنێکی باش نییە. چاکتر وایە زۆر قووڵ ژێر

خاکی خەین. هاوەڵەکەی گوتی: زۆرباشە. جا بەژوورەکەدا هات و چوو، چۆکی داوە و بەردێکی بەرزکردەوە، کیسەیەکی لەژێر دەرهێنا کە زرنگەی لێوە دەهات بیست سی دۆلاری بۆ خۆی و ئەوەندەشی بۆ ئینجەن جۆ دەرهێنا و دایە دەستی، کە ئەمیش لە گۆشەیەك لەسەر چۆك دانیشتبوو، بە چەقۆکەی زەوی هەڵدەکەند.

کوڕەکان هەموو ترسەکەیان رەوییەوە و لەبیریان چوو جێیان چەند ناڕێکە. زۆر بەبایەخەوە دەیانڕوانییە هەموو جووڵانەوەیەك لە ژوورەکەی خوارێدا.. ئەوە بەختە. بەشێوازێکی وا بەختیان هاتە هانا، کە هەر بیریشیان بۆ نەدەچوو. شەش سەد دۆلار بایی ئەوە شەش کەسان دەوڵەمەندکا. چیدی پێویست ناکا بگەڕێن، یاخۆ بیر لەوە بکەنەوە کە کوێ هەڵکەنن. بۆیە نقورچە و سەرەسمکیان لێکدەدا کە مانای وابوو "بەوە دڵخۆش نیت، کە لێرە ماینەوە!".

چەقۆکەی جۆ بەر شتێك کەوت، گوتی:

- هەلا

هاوەڵەکەی گوتی: ئەوە چییە؟

- تەختە دارێکی رزیوە.. نا.. لاموایە سندوقە، ئەوەتا دەستێکی بگاتێ جا دەزانین بۆ لێرەیە. بێ خەمبە باشم هەڵکۆڵیوە.

دەستێکی درێژ کرد و رایکێشا..

- کوڕە ئەوە پارەیە!

هەردوو پیاو سەیری ئەو دوو چنگە پارەیان دەکرد، کە دەریانهێنا بوو. پارەکان زێڕ بوون، دوو کوڕەکەی سەرێش لەوان ناشادتر و بێکەیفتر نەبوون.

هاوەڵەکەی جۆ گوتی:

- بەخێرایی سندوقەکە دەردێنین، کۆنە قازمە و خاکەناسێکم لەناو گژوگیاکە دیت. لەگۆشەی ژووری لای ئاگردانەکە هەر تازە دیمن. غاریدا قازمە و خاکەناسی کوڕەکانی هێنا. جۆ خاکەناسەکەی هەڵگرت و تەماشای کرد، سەری بادا و پرتەپرتێکی لێوەهات و دەستی بە هەڵکۆڵینێ کرد، هەرزوو سندوقەکایان دەرهێنا. زۆر گەورە نەبوو، پشتێنی ئاسنینی بۆ کرابوو، پێدەچوو زۆر قایمبێ پێش ئەوەی ساڵانێکی درێژ تێکیدەن. دوو پیاوەکە بە ئاسوودەییەوە لە گەنجینەکە رادەمان، ئینجەن جۆ گوتی:

- دەستە برا، ئەم سندوقە هەزاران دۆلاری تێدایە

- هەردەم دەیانگوت کە دەستە چەتەی مورێل هاوینێك راهاتبوون دەهاتنە ئەم دەوروبەرە.

ئینجەن جۆ گوتی:

- دەزانم.. پێدەچێ هەر ئەوانیش حەشاریان دابێ.

- ئێستا هیچ پێویستت بەوە نییە کارەکەی دیکە ئەنجام بدەی.

جۆ نێوچەوانی تێکنا و گوتی:

- تۆ نامناسی، هەموو شتێکیش لەبارەی ئەو کارە نازانی، من بۆ دزی نایکەم، ئەمە تۆڵەیە.

چاوی ئاگری لێ بڵند دەبوو، گوتی:

- لەو کارە یارمەتی تۆشم پێویستە، کە تەواومان کرد، ئینجا بەرەو تێکساس. بگەڕێوە ماڵێ لای نانسی ژنت و نێو منداڵەکانت و چاوەڕێ بە تا شتێك لەمنەوە دەبیستی.

- باشە، ئەگەر تۆ وات پێ باشە، ئەدی چ لەمە بکەین، دووبارە بیشارینەوە

- بەڵێ.. (ئەوانی سەرەوە لەخۆشیان خەریکبوو بفڕن) نا! بەدەنگێکی بەرز نا (ئەوانی سەرەوەی هێندەی نەما بوو دڵیان ڕاوەستێ). ئەوەندەی نەمابوو لەبیرکەم. ئەو خاکەناسە خاکێکی تەڕی پێوەبوو (کوڕەکان هەر بەیەکجاری تۆقین) قازمە و خاکەناسێك لێرە چ دەکەن؟ ئەی بۆ قوڕیان پێوەیە؟ کێ هێناویەتییە ئێرە.. ئەی کێوە چووینە؟ تۆ دەنگی کەست بیستووە؟ کەست دیوە؟ چی! دیسان بیشارینەوە تا بێنەوە و بزانن خاکەکە تێکچووە؟ نا.. نا دەیبەینە لانەکەی خۆم.

- وایە، دەبووایە پێشتر بیرم لێ بکردبایەوە، مەبەستت شوێنی ژمارە یەکە.

- نا.. ژمارە دوو.. لەژێر خاچەکە، شوێنەکەی دی خراپە، زۆر ئاساییە.

- چت پێ باشە وابکە، وا شەو داهات، ئەمە چاکترین کاتە بۆ ڕۆیشتن.

ئینجەن جۆ هەستاوە پێ و لە پەنجەرەیەکەوە دەچووە لای یەکێکی دیکە و تەماشای دەرەوەی دەکرد، گوتی:

- کێ ئەو کەرەستانەی هێناوەتە ئێرە.. پێم وایە لە نهۆمی سەرەوە خۆیان حەشار دابێ؟

کوڕەکان پشییان ڕاوەستا، ئینجەن جۆ دەستی خستە سەر چەقۆکەی، دەمێ داما، پاشان ڕووی لە پەیژەکە کرد. کوڕەکان ویستیان بچنە ناندینەکە، بەڵام هێزیان لەبەر بڕابوو. پەیژەکە لەبەر پێی جۆ دەستی بە جیڕەجیڕ کرد. لەبەر خراپی بارەکە هێزیان هاتەوەبەر، خەریکبوو هەڵکوتنە نێو ناندینەکە، گوێیان لە ڕمبەیەك بوو، قادرمەکە ڕووخا و ئینجەن جۆش کەوتە خوارەوە. خۆی خڕکردەوە و جوێن و نەفرەتی دەدا هاوەڵەکەی ، گوتی:

جا ئەمە ئێستا سوودی چییە؟ ئەگەر یەکێك لەسەرەوە بێ، با هەر لەوێ بێ کێ گوێی دەداتێ؟ ئەگەر بشیەوێ ئێستا بازداتە خوارێ و لەکێشان بئاڵێ بۆ نایە؟ دوای پازدە خولەك

تاریکی دادێ، ئەوجا ئەوکاتە لێیان گەڕێ، ئەگەر حەزیان کرد با بێنە دوامان، من ئاواتە خوازم، بەڵام من لاموایە ئەو کەسەی ئەو کەرەستانەی هێناوەتە ئێرە، وایزانیوە ئێمە دێوەزمە یاخۆ شەیتان یا جادووگەرین، تا توانیویە هەڵاتووە.

جۆ هەندێك پرتەوبۆڵەی کرد، پاشان رازی بوو سوود لەوەندە رووناکییە وەرگرن کە لە رۆژێ ماوە و بەرێکەون. پاش کەمێك چوونە دەرێ و بەخۆ بەسندووقە بەهادارەکەوە بەرەو رووبار رۆیشتن.

تۆم و هاك هەستانەوە، هەستیان بە لاوازییەکی زۆر دەکرد، بەڵام حەسانەوەیان پتر بوو. لە کەلێنەکانی دیواری ژوورەکەوە تەماشای پیاوەکانیان دەکرد، لەخۆیان دەپرسی دوایانکەون؟ نا.. هەرگیز! هەر دەیانویست بگەنە خوارێ بێ ئەوەی ملیان بشکێ یاخۆ قاچیان شتێکی لێبێ. جا بەسەر گردەکەدا بۆ ئاوەدانی گەڕانەوە، بەڵام زۆریان قسە نەکرد، بەوە خەریکبوون لەخۆیان و بەختی نەگبەتیان تووڕەبن. کە وایکرد کەرەستەی هەڵکەندن لەگەڵ خۆیان ببەن، چونکە ئەگەر ئەو کەرەستانە لەوێ نەبان هەرگیز گومان نەدەکەوتە مێشکی جۆ. بەڵکو ئەو زیوەی لە لاشی بوو لەگەڵ زێڕەکەی دەشاردەوە، تا تۆڵەی خۆی دەسەندەوە ئەوجا دەیزانی گەنجینەکەی ون بووە. ئای لەو بەختە خراپەی وایکرد کەرەستەکانیان ببەن.

بڕیاریاندا بە دوای ئیسپانییەکەدا بگەڕێن و کە هاتە شاری بۆ تۆڵەکردنەوە چاودێری بکەن و بەرەو حەشارگەی ژمارە دوو شوێنی بکەون جا لەهەر کوێ بێ. لەوێ هزرێك بە خەیاڵی تۆمدا هات و گوتی:

- تۆڵە، هاك خۆ رەنگە مەبەستی ئێمە بێ؟!

هاك کە هێندەی نەمابوو ببورێتەوە گوتی:

- نا.. وا مەڵێ.

جا لەهەموو رووێکەوە قسەیان لێکرد. کە گەیشتنەوە بەر دەرگەی شاری بڕیاریاندا، کە رەنگە مەبەستی لە کەسێکی دیکە بێت یاخۆ هەر بەتەنیا مەبەستی تۆم بێ، لەبەرئەوەی بە تەنێ تۆم شایەدی لەسەر دابوو.

لای تۆم زۆر زۆر ناخۆش بوو کە بەتەنیا لە مەترسی دابێ، لای وابوو وا چاکترە کەسێکی لەگەڵدا بێ.

# پاژی بیست و حەوتەمین

سەرکێشییەکانی ئەو ڕۆژەی تۆم خەونەکانی شەویشی لێ تێکدا. چوار جاران دەستی گەیشتە ئەو سامان و گەنجینە و چوار جاریش لەنێو پەنجەکانی دەبوونە هیچ، کە لەترسان لەخەوێ رادەپەڕی و دەیزانی چەندە بەدبەختە کە سبەینێ زوو هێشتا لەنێو جێ راکشا بوو، بیری لە ڕووداوەکانی سەرکێشییە مەزنەکەی دەکردەوە. سەرنجیدا کە زۆر بەقووڵدا چووینە. وەك بڵێی لە جیهانێکی دیکە یان لەسەر دەمێکی دێرینی دی ڕوویاندابێ پاشان وای بۆهات، کە سەرکێشی گەورە هەر لەخۆڕا خەونە بۆ پاڵپشتی ئەم بۆچوونەش بیانووێکی گەورەی هەبوو، ئەویش ئەو بڕە پارەیە بوو کە بینیبووی، گەلێ زیاتربوون لەوەی کە حەقیقەت بن. پێشتر هەرگیز پەنجا دۆلاری پێکەوە نەدیبوو. ئەمیش وەکو هەموو منداڵانی هاوتەمەنی خۆی ئاماژەی (سەدان) و (هەزاران) دۆلاری لا جۆرە خەیاڵێك بوو. بۆیە نەیدەتوانی باوەڕبکا کە دنیا ئەو بڕە پارانەی تێدایە. هەرگیز بە خەیاڵیشی دانەدەهات کەسێك (سەد) دۆلاری هەبێ. خۆ ئەگەر خەیاڵەکانی لەبارەی گەنجینەیەکی حەشاردراو لێك بدرایەوە، تەنیا چنگە خوردەیەك بوو، دۆلاری هەر بەخەیاڵدا نەدەهات.

بەڵام هەر چەند بیری لێ دەکردەوە، ڕووداوەکانی ئەو سەرکێشییەی ڕوونتر و قووڵتر بۆ دەردەکەوتن. پاشان زۆری پێنەچوو هزری پەرت و بڵاوبوون و نەیتوانی بگاتە رایەکی گردەبڕ، کە ئەوەی ڕوویدا خەون نەبوو، بۆیە تاکو خۆی یەکلا بکاتەوە، خێرا بەرچایی خوارد و چوو تا هاك بدۆزێتەوە. هاك لەسەر ڕۆخی بەلەمێکی پەل دانیشتبوو، لاقی شۆڕی ناو ئاوێ کردبۆوە و زۆر خەمگین دیاربوو، تۆم بڕیاریدا لێگەڕێ هاك سەری قسان دامەزرێنێ، جا ئەگەر باسی هیچی نەکرد ئەوە دەردەکەوێ، کە هەموو سەرکێشییەکە تەنیا خەون بووە.

- سڵاو هاك!

- سڵاو لەخۆت

- تۆم خۆ ئەگەر ئەو کەرەستە نەفرەتیانەمان لەلای دارە وشکەکە جێهێشتبا، ئێستا خاوەنی گەنجینەکە بووین، ئەدی ئەوە خەم نییە؟!

- کەواتە ئەوە خەون نەبووە؟ هاك من بەلایەك زۆرم حەزدەکرد خەون با.

- کامە خەون؟!
- ئەو شتەی دوێنێ، وای بۆچووم خەون بێ
- خەون! ئەگەر پەیژەکە نەڕوخابا ئێستا زۆرت خەون دەدیتن. من بەدرێژایی شەوێ خەونم زۆر دیتن، وام دەزانی ئەو شەیتانە ئیسپانییە چاو بەپینەیە راوم دەنێ، بەنەفرەت بێ.
- نا، بەنەفرەت نەبێ، با بیدۆزینەوە، بەدوای گەنجینەکەدا بگەڕێین
- تۆم ئێمە هەرگیز نایدۆزینەوە، مرۆڤ تەنیا یەك دەرفەتی بۆ هەڵدەکەوێ ببێتە خاوەن سامانێکی ئاوا، ئەو دەرفەتەش فەوتا. هەرچۆنێك بێ وابزانم ئەگەر من ئەوجارە بیبینمەوە لە ترسان دەمرم.
- باشە، منیش بەڵام هەرچۆنێك بێ حەزدەکەم بیبینم و بۆ حەشارگەی ژمارەی دوو شوێنی هەڵگرم.
- ژمارە دوو، بەڵێ بیرم لێ دەکردوە، بەڵام هیچی لێ تێنەگەیشتم، تۆ بەچی تێدەگەی؟
- نازانم، لەوە قووڵترە، هاك پێم بڵێ رەنگە ئەوە ژمارەی خانووێك بێ!
- نا تۆم وانییە، لەم شارۆچکەیە خانوو کوا ژمارەیان هەیە.
- راستدەکەی، وایە، با کەمێك بیربکەمەوە، کەواتە ژمارەی ژوورێکە لە خانییێکدا.. دەزانی!
- وا بزانم ئەمە فێڵە..! چونکە تەنیا دوو خانی تێدایە، دەتوانین زوو لێی بپێچینەوە
- هاك تۆ لێرەبە تا دێمەوە.

تۆم یەکسەر رۆیی، چونکە ئەوەی پێ خۆش نەبوو لە شوێنی گشتیی هاکی لەگەڵ بێ، نیوسەعاتێکی پێچوو، بۆی دەرکەوت کە لەمێژە پارێزەرێك لە ژووری ژمارە دووی خانی یەکەم نیشتەجێیە و تا ئێستاش تیایدا دەژی. بەڵام لە خانەکەی دیکە هەندێك گومان لەربارەی ژووری ژمارە دوو هەبوو، پاسەوانەکە پێی گوت کەوا ئەو ژوورە هەردەم داخراوە، لە شەوان بترازێ نەیدیوە کەسێ لێ وەژوورکەوێ یاخۆ لێی بێتەدەر. ناشزانێ هۆی چییە، هەر توانی ئەوەندە بڵێ کە لای وایە ئەم ژوورە خێونشینە، چونکە شەوی رابردوو رووناکی لەو ژوورەدا دیوە.

- هاك من ئەمەم بۆ دەرکەوت، لام وایە ئەوێ ئەو ژمارە دووەیە کە ئێمە بۆی دەگەڕێین.
منیش پێموایە تۆم، ئێستا چ بکەین.
- با بیرێکی لێ بکەمەوە

تۆم زۆری بیرکردەوە، ئەوجا گوتی:

- با پێت بڵێم، دەرگەی پشتەوەی ژووری ژمارە دوو بەسەر ئەو داڵانە تەسکەدا دەڕوانێ، کە دەکەوێتە نێوان خانەکە و کۆنە کۆگەی کەرپووچان. ئێستا تۆ دەبێ هەر کلیلێکت دەستکەوێ بیهێنی. منیش هەموو کلیلەکانی پوورم دەهێنم، جا لەیەکەم تاریکە شەودا، هەوڵ دەدەین دەرگەی ئەو بکەینەوە. بەڵام بیرت نەچێ چاوت باش بۆ ئینجەن جۆ بکەیتەوە. چونکە ئەو گوتی کە جارێکی دیکەش دێتەوە ناو شار تا دیسان چاوی دەرفەتی بۆ تۆڵەکردنەوە بگێڕێ. جا ئەگەر دیتت تەنیا بەدوای کەوە، ئەگەر نەچووە ئەو ژمارە دووە، کەواتە ئەوێ هەونییە.

- ئای خوایە، من نامەوێ بەخۆم بەدووی کەوم.

- بۆ، بێگومان ئەمە لەشەودا دەبێ، ڕەنگە هەر تۆ نەبینێ، ئەگەر بشتبینێ، ڕەنگە هەر گومانت لێنەکا.

- ڕاستە، ئەگەر تەواو تاریك بێ، بەدوای دەکەوم، نازانم.. هەوڵ دەدەم.

- هاك دڵنیات دەکەم کە من لە شوێنکەوتنی دوودڵی ناکەم، ئەگەر تاریکە شەو بێ.

- بۆ، ڕەنگە پێی وابێ نەتوانێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە و یەکسەر بچێتە لای پارەکە.

- وایە تۆم، وایە، من بەدووی دەکەوم.

- ئێستا وا قسە دەکەی، هاك نەکەی هەرگیز لاواز بیت، من لاواز نابم.

# پاژی بیست و هەشتەمین

تۆم و هاك لەو شەوە خۆیان بۆ سەرکێشییەکەیان ساز و ئامادە کرد. تا دوای سەعات نۆ لە دەوروبەری خانەکەدا سوڕانەوە، یەکێکیان چاودێری دالآنەکەی دەکرد و ئەوی دیکەش چاوی لەسەر دەرگەی خانەکە بوو، کەس بە دالآنەکەدا نەهات و نەچوو، کەسیش کە شێوەی بە ئیسپانییەکە بچێ، لە دەرگەی خانەکە نەچووە ژوور و دەرنەکەوت. وا پێدەچوو شەوەکەشی ساف بێ، بۆیە تۆم گەڕایەوە مالێ، دوای ئەوەی لەگەلْ هاك رێککەوت، کە ئەگەر شەو تەواو تاریك داهات دەبێ بێتە لای مالیان و تۆمیش بەگەلی کەوێ تا بچن کلیلەکان بجەڕبینن، بەلآم ئەو شەوی هەر ئاسمان روون بوو، بۆیە هاکیش دەوروبەری نیوەشەوێ وازی لە چاودێری هێنا و چوو لەناو کۆنە بەرمیلێکی شەکری بەتالدا نووست.

رۆژی سێشەمیش بەخت یاوەریان نەبوو، چوارشەمیش هەروەتر. بەلآم شەوی پێنجشەم پێدەچوو باشتر بێ. تۆم لە کاتێکی گونجاو لە مالێ هاتەدەرێ و قۆدیلکە چراکەی پووریشی لەگەلْ خۆیدا هێنا لەگەلْ خاولییەکی گەورە تا لەکاتی پێویست چراکەی پێ داپۆشێ. ئەوجا چراکەی لە کۆنە بەرمیلەکەی هاکدا شاردەوە و چاودێری دەستی پێکرد سەعاتێك پێش نیوەی شەوێ. دەرگەکانی خان پێوەدران و رووناکییەکان کوژانەوە. ئەو ئیسپانییە هەر نەدیترا و کەسیش نەچووە ناو دالآنەکە و لێشی دەرنەچوو، دنیا کپ و خامۆش بوو، تاریکی هەموو لایەکی داگرتبوو، تەنیا دەنگی گەوالە لەدووررا دەهات و ئەو بێدەنگییەی دەشێواند.

تۆم چراکەی هێنا و هەر لەناو بەرمیلەکەرا دایگیرساند و خاولییەکەی باش تێ لوولدا، ئەوجا ئەو دوو سەرکێشە دزەیان کردە لای خانەکە. هاك لە دەروازەکەی دەڕوانی و تۆم بە ئەسپایی بەرەو ناو دالآنەکە دەچوو، هاك زۆر چاوەڕێ بوو، چاوەڕوانی لێ ببووە کێوێك، حەزی دەکرد تیشکێك لە رووناکی چراکە ببینێ. راستە دەیترسێنێ، بەلآم هیچ نەبێ ئەوەی پێ دەلێ کە تۆم هێشتا زیندووە. وای بۆ دەچوو کە چەند سەعاتێکی درێژە تۆم ون بووە، دیارە لەهۆش خۆی چووە، یاخۆ رەنگە هەر مردبێ، رەنگە لەترسان دلی راوەستا بێ، لەگەلْ ئەو هەلڕێژ و داڕێژانە هاك هەستی کرد بەرەبەرە لە دالآنەکە نێزیك دەکەوێتەوە. هەرچی ئەگەری خراپە بەخەیالیدا دەهات، لای وابوو کارەساتێك روودەدا ئەمیش

دەفەوتێنێ. وایدەزانی لەکونی دەرزییەوە هەناسە دەدا. دڵی وای لێ دەدا هێندەی نەمابوو بێتەدەر ، لەناکاو تیشکی چراکەی لێ دەرکەوت، تۆم بە تەنیشتی ڕەتبوو، پێی گوت غاردە، خۆت قوتارکە.

نەیدەویست تۆم دووبارەی کاتەوە، هاك وا دەرپەڕی کە سی چل میلی لە سەعاتێك دەبڕی و گوێی لێ نەدەبوو. تا گەیشتنە تەویلەی کۆنە قەسابخانەیەکی چۆڵ لەلایە نزمەکەی گوندی کەسیان ڕانەوەستان. هەر گەیشتنە ئەوێش ڕەشەبا هەڵیکرد و بارانێکی بەخوڕ دایکوتا، کە تۆم پشی هاتەوەبەر گوتی:

- هاك، دوو کلیلم لابوو هەوڵمدا دەرگەکەیان پێ بکەمەوە، زۆر ئاگەدار بووم، بەڵام نەمتوانی، نازانم نە لەبەر ئەوەبوو کە شێوا بووم، نە بەدەرگەکەیان نەدەکرد. بێ ئەوەی هەست بکەم چ دەکەم دەسکی دەرگەکەم گرت و بامدا، یەکسەر دەرگاکە بۆوە.. چونکە هەر دانەخرابوو، چوومە ژوورێ و خاولییەکەم هەڵداوە، وەی بابە چم دیت.

- چی.. تۆم چت دیت؟

- هاك، ئەوەندەی نەمابوو پێ لەدەستی ئینجەن جۆ بنێم.

- نا..!

- بەڵێ.. لەسەر لەوێ ڕاکشا بوو، لەسەر زەوی نووستبوو، کۆنە پەڕۆیەکی بەچاوی دادا بوو، قۆڵەکانی بەملاو بەولادا کەوتبوون.

- وەی خوایە، ئەدی چت کرد؟ وەئاگا هات؟

- نا.. نەجولاٚ.. وابزانم سەرخۆش بوو هەرزوو خاولییەکەم ڕافڕاند و هەڵاتم.

- ئەگەر من بام هەر خاولییەکەم لەبیر دەچوو.

- بەڵام من لەبیرم بوو، ئەگەر بزرم کردبا پوورم خراپی بەسەر دێنام.

- تۆم، دە بڵێ سندوقەکەت دیت.

- هاك من ئەوەندە نەمامەوە چاو بگێڕم، سندوقەکەشم نەدیت، هەروەك خاچەکەشم نەدیت. لە بوتڵێك و کوپێکی تەنەکە زیاتر چم نەدیت. کە لە تەنیشت ئینجەن جۆ کەوتبوون، هەروەها دوو بەرمیل و چەند بوتڵێکی دیکەشم دیتن، ئێستا تێدەگەی مەسەلەی ئەو ژوورە خێونشینە چییە؟

- چۆن؟!

- ئەوە خێونشین نییە، شەراب نشینە، هاك ڕەنگە هەموو خانەکان ژووری وایان هەبێ.

- باشە، منیش دەڵێم ڕەنگە وابێ، کێ ئەوەی بەبیردا دەهات..؟ بەڵام تۆم پێم بڵێن ئێستا کاتێکی زۆر گونجاوە سندوقەکەت دەستکەوێ، ئەگەر ئینجەن جۆ سەرخۆش بێ؟

- بەراست، دە هەوڵدە!

هاك راجفری

- نا.. پێم وانییە

- منیش هاك، تەنیا یەك بوتڵ لەلای ئینجەن جۆ کەوتبوو، ئەمەش بەس نییە ئەگەر سێ بوتڵ با، دەمزانی تەواو سەرخۆشە و کارەکەم دەکرد.

دەمێك رامان و بیریان کردەوە، جا تۆم گوتی:

- گوێ بگرە هاك، تا دەزانین ئینجەن جۆ لەوێ نییە، دەبێ واز لەو هەوڵانەمان بێنین. وا زۆر ترسناکە، ئەگەر هەموو شەوێ چاودێری بکەین. جارێك هەر دەیبینین لەوێ دەرکەوێ، چ زوو بێ چ درەنگ ئەوجا دەتوانین وەك بروسك خێرا سندوقەکە بڕفێنین.

- باشە، من رازیم، من بەدرێژایی هەموو شەوێ چاودێری دەکەم. ئەگەر تۆ تەواوی ئیشەکانی دی بکەی.

- باشە دەیکەم، تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە بێیە شەقامی هووپەر و بمیاوێنی، ئەگەر هەڵیش نەستام دەتوانی بەردێك لە پەنجەرەکە بدەی تا وەئاگام بێم.

- باشە، پێکهاتین.

- هاك وا رەشەبا راوەستا، ئێستا دەچمەوە ماڵێ، هەردوو سەعاتی ماوە رۆژهەڵبێ. تۆش تا رۆژ هەڵدێ بڕۆوە چاودێری خانەکە، دەچی؟!

- پێمگوتی دەیکەم، تۆم دەیکەم، هەر چاودێری ئەو خانە دەکەم. ئەگەر ئەوە ساڵێکیش بخایەنێ، بەرۆژ دەنووم و بەشەو چاودێری دەکەم.

- ئەمە چاکە، ئەدی لەکوێ دەخەوی.

- لە کۆگەکەی ماڵی بێن رۆجەرز، لێ دەگەڕێ، زۆرجاران شەو لەوێ ماومەتەوە، باوکە قولەکەشی، خاڵە جەیك، ئەویش رازییە، چونکە هەر کاتێکی پێویست بێ من ئاوی بۆ دێنم، بۆیە لێ دەگەڕێ لە کۆگەکە بنووم و هەرکاتێك داواشی لێ بکەم شتێکی هەبێ دەمداتێ بیخۆم. تۆم ئەو قولە پیاوێکی باشە و منی خۆش دەوێ، چونکە من قەت خۆم پێ لەو زیاتر نییە، چەند جار نانم لەگەڵ خواردووە، بەڵام پێویست ناکا ئەوە بەکەس بڵێی، چونکە کە مرۆڤ برسی بوو، تووشی هەڵەی گەورە دەبێ، هەرچەندە لەباری ئاسایی بێزی نایە ئەو هەڵانە بکات.

- باشە، ئەگەر لەکاتی رۆژێ کارم پێت نەبوون لێ دەگەڕێم بنووی و نایەم بێزارت کەم، بەڵام هەرکاتێکی شەوێ تۆ شتێکت دیت، یەکسەر وەرە لای ماڵێ و بمیاوێنە.

## پاژی بیست و نۆیەم

یەکەم شت کە تۆم سەرلەبەیانی رۆژی هەینی بیستی هەواڵێکی خۆش بوو، ئەوەبوو تاچەری دادوەر بە خێزانەوە شەوی رابردوو گەڕابوونەوە شارۆچکەکە یەکسەر چیرۆکی جۆ و گەنجینەکە لای تۆم هاتنە پلەی دووەم و بێکی هاتە پلەی یەکەم، چاوی پێکەوت و تا شەکەتبوون یاخوود چاوشلکانێ و هی دیکەیان لەگەڵ زۆر لە دۆستانی قوتابخانەدا کرد. ئەو رۆژە زۆر بەخۆشی تەواو بوو، بێکی دایکی رازیکردبوو کە رۆژی دواتر بۆ ئەو گەشتە تەرخان بکا کە لەمێژبوو بەڵێنی پێدابوو. کچەکە زۆر دڵی خۆشبوو، تۆمیش لەو زیاتر. بانگهێشتەکان بەر لە رۆژئاوابوونێ رەوانکران. کچ و کوڕانی گوند هەموو کەوتنە خۆشی و خۆیان بۆ ئامادەکرد. ئاسوودەیی تۆم وایلێکرد تا درەنگی شەو بەئاگا بێ. بە ئاوات بوو میاوەی هاکی گوێ لێبێ و گەنجینەکەی دەستکەوێ تا سبەی بە بێکی و برادەرانی بڵێ. بەڵام دڵسارد بوو، چونکە ئەو شەوە هیچ ئاماژەیەکی نەبیست.

سبەینە داهات و سەعات دە یاخوود یازدە بوو، کۆمەڵێ کچ و کوڕ لەماڵی تاچەری دادوەر کۆبوونەوە. هەموو شتێك بۆ دەسپێکی گەشتەکە ئامادەکرابوو وا باو نەبوو بە تەمەنەکان لەو جۆرە گەشتانە بەشداربن و تێکیاندەن. کەس خەمی منداڵەکانی نەبوو، مادام لەژێر چاودێری چەند کیژێکی هەژدە ساڵی و چەند گەنجێکی دەوروبەری بیست و سێ ساڵیدا بوون. بۆ ئەم بۆنەیە کۆنە کەشتییە هەڵمینەکە بە کرێ گیرابوو. زۆری پێنەچوو ریزێ بە شەقامە سەرەکییەکەی شاردا شریتەی بەست و هەر یەکەیان سەبەتەیەك خۆراکی پێبوو. سید ئەو رۆژی نەخۆش بوو، گەشتەکەی لەدەست چوو، ماریش لەماڵێ مابۆوە تا بیخافڵێنێ. دوایین شت خاتوو تاچەر بە بێکی گوت ئەوەبوو:

- پێدەچی تا درەنگی شەو نەیەنەوە، جا چاکترە شەوەکەی لەماڵی کچانێك بیت، کە لەنێزیك لەنگەرەگەی کەشتییەکە دەچن، باشە کچی خۆم.

- کەواتە دایکی لە ماڵی سوزی هارپەر دەمێنمەوە

- زۆر چاکە، لەبیرت بێ هەڵسوکەوتت جوان بێ و کێشە دروست نەکەی.

کە بەرێگەدا دەڕۆیشتن، تۆم بە بێکی گوت:

- سەیر، با پێت بڵێم چ دەکەین، واز لەماڵی جۆ هارپەر بێنە، بەگردەکە هەڵدەگەڕێین و دەچینە ماڵی دۆگلاسی بێوەژن، ئایس کرێمی دەبێ، رۆژانە زۆری لێ دروست دەکا. زۆریش بە چوونی ئێمە دڵخۆش دەبێ.

- وای.. بەڕاستی خۆش دەبێ

بێکی ساتێك بیری کردەوە، جا گوتی:

- بەڵام دایکم چ دەڵێ؟

کچە هزرەکەی لە مێشکی خۆیدا هێناوبرد، جا بە دوودڵی گوتی:

- لام وایە کارێکی هەڵەیە.. بەڵام..

- بەڵام چی؟ دایکت هەر نازانێ، لەچی دەترسی؟ دایکت بەس ئەوەندەی دەوێ لە خراپە بەدووربی. دڵنیام ئەگەر ئەویشی لەبیربا داوای لێ دەکردی بچییە ئەوێ.

بەخشندەیی دۆگلاسی بێوەژن سەرنجڕاکێش بوو، ئەو هەموو بیانووەش کاریان لە دەروونی کچەکە کرد. هەردووك بڕیاریاندا هەموو شتێك لەبارەی بەرنامەی شەویان لە هەمووان بشارنەوە، زۆری نەبرد تۆم هاتەوە یادی کە رەنگە ئەو شەوە هاك بێ و ئاماژەکەی پێ بدا. ئەمەش وای لێکرد زۆر دڵی تەنگ بێ، بەڵام نەیتوانی ئەو چێژە لە مێشکی دەرکا کە دڵنیا بوو لەماڵی دۆگلاسی بێوەژن دەستی دەکەوێ. جا بۆچی وازی لێ بێنی، هۆی بۆ خۆی دەدۆزییەوە، خۆ شەوی رابردوو چ ئاماژە نەهات، چ وا دەکا ئەمشەو بێ. دڵنیاش بوو شەوەکەی زۆر خۆش دەبێ، بۆیە چاوپۆشی لەو گەنجینەیە کرد، کە هێشتا لە دەستکەوتنی دڵنیا نییە، زۆری نەبرد وەك منداڵێك هەر تەواو بەدرێژایی رۆژ باسی گەنجینەکەی لەبیرکرد.

کەشتییەکە سێ میل لەخوار شارۆچکەکە لەدەروازەی دارستانێکی چڕ راوەستا. هەموو لێی دابەزین و زۆری نەبرد ئەو دارستانە دوور و نێزیك بە هاتوهاوار و پێکەنینی بچووکان دەنگی دایەوە. هەر یەك بەلایەکدا کەوتە یاری و گەمان، پاش ماوەیەکی زۆر هەموو ماندوو و برسی گەڕانەوە خێوەتگەکەیان. وەك گورگ لە خواردنێ ئالان و چیان لێ نەهێشت. پاش خواردن هەموو بۆ حەسانەوە و قسەکردن چوونە بەر سێبەری دار بەڕووەکان. لەناکاو یەکێك هاواریکرد:

کێ ئامادەیە بێتە ئەشکەوتێ؟

هەموو ئامادەبوون. بەستە و مۆم ئامادەکران، هەموو یەکڕاست بەغاردان بەسەر گردەکە هەڵگەڕان، دەرکی ئەشکەوتەکە لەبەشی سەرەوەی لایەکی گردەکەبوو، شێوەکەی وەك ژمارە هەشت وابوو. دەرگەیەکی داربەڕووی پتەوی هەبوو، کە لەسەر پشت بوون لەناوەوە ژوورێکی بچووکی زۆر ساردی تێدابوو دەتگوت کارگەی بەفرە، دیوارەکانی ناوپۆشی سروشتیان لە بەرێکی رەق هەبوو کە بە دڵۆپە ئاوی سارد نەخشابوون. راوەستان لەنێو ئەو ئەشکەوتە تاریکە و تەماشاکردنی دۆڵە سەوزەکە کە تیشکی رۆژی لێ دەدا، زۆر رۆمانسی و هەست بزوێن بوو، بەڵام کاریگەرییەکەی زۆری نەخایاند و دیسان هەرا دەستی پێکردەوە. هەرکە یەکەم مۆم داگیرسا، هەموو غاریاندا لای خاوەنەکەی تا مۆمەکانی خۆیان هەڵکەن، ئەویش دەیویست بکاتە ئازایی و نەهێڵێ، کەچی زۆری نەبرد بەسەریدا زاڵبوون و مۆمەکەی لەدەست کەوتەخوار و کوژاوە، ئەوجا هەموو تێکڕا هاواریان کرد و پێ کەنین، بەڵام هەموو شتێك بەکۆتا دێ. بەرەبەرە هەموو بۆ دابەزین بەو گوزەرە سەرەکییەکە ڕیزیان بەست. مۆمەکانی دەستیان بە ئەستەم بنمیچ و دیوارەکانی ئەشکەوتەکەی رووناك دەکردەوە، کە نێزیکەی شەست پێ بەرز بوو. ئەو گوزەرە سەرەکییە لە هەشت تا دە پێ بەرزتر نەبوو. هەرچەند هەنگاوێك لوتکەیەکی دیکە هەبوو، کە لکی چەماوەی بەهەردوو دەستاندا دروست دەکرد. چونکە ئەشکەوتی مەك دۆگال بریتی بوو لە وێڵگەیەك چەندین کوچە و داڵان و ڕێڕەوی لاتەریك و خوار و خێچی تێدابوو. کەس نەیدەزانی لەکوێ دەست پێدەکەن و چۆن کۆتاییان پێ دێ. دەیانگوت رەنگە مرۆڤ چەند شەو و رۆژێك بەو ڕێچکە تۆڕئاسایانەدا بگەڕێ و نەگاتە کۆتایی یەکێکیان. یاخۆ هەر بە قووڵایی زەویدا بچێ و بگاتە بن زەوی و وێڵگەگەلی دیکە بدۆزێتەوە. کەس ئەو ئەشکەوتەی نەناسیوە و تەواو شارەزای نەبووە، ئەمە هەردەم مەحاڵ بووە. بەڵام زۆرینەی گەنجەکان لە بەشێکی شارەزابوون. وا باو نەبوو کەسیش ئەو بەشە ناسراوە ببەزێنێ، تۆم سۆیەریش بەقەدەر هەر یەکێکی دیکە شارەزای ئەو ئەشکەوتەبوو.

گەلەڕەوتەکە بە گوزەرە سەرەکییەکەدا بەردەوام بوو و نێزیکەی سێچارەکە میلیان بڕی، ئەوجا چین چین و جووت جووت لێك جودابوونەوە و لەنێو ڕاڕەوە لاچەپەکاندا خۆیان گومکرد. تا لەهیکڕا لەکۆتایی ڕاڕەوەکان لێك دەرکەون. لەماوەی نیوسەعاتی داهاتوودا کۆمەڵەکان توانیان خۆ لەیەکتری ببوێرن، بەڵام بێ ئەوەی کەس بپەڕێتەوە بەشە نەناسراوەکان.

ئەوجا بەرەبەرە چین چین بەدوای یەکدا دەگەڕانەوە دەروازەی ئەشکەوتێ، ماندوو مردوو، لە تەوقی سەر تا بنی پێیان لەو پیسییە وەردرابوو، کە لەگەڵ دڵۆپە ئاوان دادەباری و هەموو

جەستەیان قورس بوو. بەڵام هەموو بەڕاستی دڵخۆشبوون، چونکە کاتێکی خۆشیان بەسەربردبوو. ئەوجا هەموو سەریان لەوەی سوڕما، کە هەستیان بە تێپەڕینی کات نەکردبوو، هێندەی نەمابوو شەو دابێ. نیوسەعات دەبوو زەنگی کەشتییە هەڵمینەکە لێی دەدا و بانگی دەکردنەوە. لەبەرئەوەی سەرکێشییەکانی ئەو ڕۆژە ئەوەندە خۆشبوون، کە کەشتییەکە لەناو ڕووباردا بەڕێکەوت، لەکەشتیوانەکە بترازێ کەس بای یەك فلس بایەخی بەوکاتە نەدەدا، کە لەدەستیان چووبوو.

کە تیشکەکانی کەشتییەکە گەیشتەوە بەندەر، هاك خەریکی چاودێری بوو. دەنگێکی لێوە نەبیست، چونکە منداڵان تا ئەوپەڕی ماندوو و بێدەنگبوون. سەرسامبوو لەوەی کەشتییەکە لە بەندەردا نەوەستا. پاشان بەتەواوی لە مێشکی خۆی دەریهێنا و گەڕاوە لای کارەکەی خۆی. شەوەکەی هەورین و تاریك دا دەهات، سەعات گەیشتە دە و ژاوەژاوی پەیتوونان کۆتایی هات و ڕووناکییە کزەکانی بەر پەنجەرەی ماڵانی گوند یەك یەك دەکوژانەوە و خەڵك لە شەقامان نەمان و تەپەی پێیان نەدەبیسترا. گوند چاوی بۆ خەوێ لێکدەنا و تەنیا چاودێرە بچووکەکەی لەنێو خامۆشی و خێوان جێدەهێشت. سەعات گەیشتە یازدە و چراکانی خانەکەش کوژانەوە. هەموولایەك تاریك داهات، هاك دەمێك چاوەڕێ بوو وای دەزانی ماوەیەکی درێژە. متمانەی دایە کزی و لەخۆی پرسی، ئەرێ ئەو چاوەڕوانییە چ سوودێکی هەیە؟! بەڕاست هیچ سوودێکی هەیە؟ بۆ واز لەو کارە نەهێنم؟

دەنگە دەنگێکی بەرگوێ کەوت، یەکسەر جەستەی جووڵەی تێکەوتەوە، لەوساتەدا دەرگەکەی دواوە هێدی داخرا، ئەویش خۆی هەڵدا گۆشەیەکی کۆگەی کەرپووچان. پاشان دوو پیاو بەلایدا تێپەڕین، یەکێکیان پێدەچوو شتێکی لەبن باڵی بێ، بێگومان ئەوە سندوقەکەیە هەڵیگرتووە، کەواتە بەتەمان گەنجینەکە بگوازنەوە، ئایا ئێستا بانگی تۆم بکا؟ ئیشەکە زۆر بێمەعنا دەبێ، ڕەنگە پیاوەکان بەخۆ بەسندوقەکەوە بچنە شوێنێك کە هەرگیز جارێکی دی نەدۆزرێنەوە. نا دەبێ خۆی بە تاریکی پەنادا و بێ ئەوەی ئاشکرا بێ، کێوە چوون، بەدوایانکەوێ، هاك ئاوا لەگەڵ خۆی ئاخاوت، پاشان وەك پشیلە بە سووکی لەشوێنی خۆی دەرکەوت بە پێخواسی بەدوایانکەوت ئەوەندەش خۆی لێ بەدوور دەگرتن، نە هەستی پێبکەن و نە لەبەرچاوی ون بن.

ئەوان سێ قۆناخیان بە شەقامی بەر ڕووباردا بڕی، ئەوجا بەرەو لای چەپ بایانداوە جادەیەکی لاوەکی و ڕاست و ڕاست چوون، تا گەیشتنە ئەو ڕێڕەوەی بەرەو کاردیف هیڵ

دەچێ. بەوێدا چوون تا گەیشتنە ماڵی پیرە وێلزییەکە دەکەوێتە ناوەڕاستی گردەکە بێ هەڵوەستەکردن لە هەڵکشان بەردەوامبوون. هاك پێیوابوو باشە، لەلای کۆنە کانەبەردەکە حەشاری دەدەنن، بەڵام لای کانەبەردەکەش رانەوەستان و تا ترۆپلێ بەردەوامبوون. لەوێ رێچکە پڕ گیاوگۆڵەکەیان گرتەبەر زۆری نەبرد لە تاریکیدا گومبوون. هاك نێزیك کەوتەوە تا ماوەی نێوانیان خۆی کەمکاتەوە. دڵنیابوو کە بەهیچ جۆرێك نایبینن. دەمێك لە رۆیشتن بەردەوام بوون، پاشان هێدی کردەوە، دواتر بەتەواوی راوەستا، گوێی راگرت، لە ترپەی دڵی خۆی زیاتر هیچی گوێ لێ نەبوو. دەنگی گمەگمی کوندەپەپوویەك لەودیو گردەکەڕا هات و خامۆشییەکەی شڵەژاند، دەنگی هەنگاوان نەدەهات، ئای خوایە، هەموو شتێك ون بوو. بەتەمابوو بەتوندی بەرەو پێش بچێ کە گوێی لە کۆخەی پیاوێك بوو، تەنیا چوار پێ لێی دوور بوو. هاك دڵی گەیشتە قوڕگی، بەڵام دیسان قوتی داوە، لەجێی خۆی راوەستابوو و دەلەرزی، دەتگوت سەتڵێك بەفراوی پێداکراوە، لە ترسان وا هێزی لەبەر بڕا یەکسەر بەربێتەوە سەرزەوی. هاك دەیزانی لەکوێیە، دەیزانی تەنیا پێنج هەنگاو لەو رێڕەوە دوورە کە دەگاتە باخچەی کۆشکەکەی دۆگلاسی بێوەژن. لەدڵی خۆی گوتی، ئەگەر حەز دەکەن با لێرەی بشارنەوە، دیتنەوەی زۆر زەحمەت نابێ.

دەنگێك زۆر بەنزمی هات کە دەنگی ئینجەن جۆ بوو:

- ئای بەنەفرەت بێ.. دیارە دیسان میوانی هەیە، دەنا بەو شەوە درەنگە چرای هەڵنەدەکرد.

- من هیچ چرایەك نابینم.

ئەمە دەنگێکی نامۆ بوو، دەنگی ئەو کابرا نامۆیەی لە خانووە چۆڵەکەدا دیبووی. هاك هەستی کرد هەموو لاشەی تا دەگاتە دڵی سڕ دەبێ. کەواتە ئەمە (تۆڵە)کەیە. بیریکردەوە هەڵبێ، بەڵام ئەوەی بیرهاتەوە کە زۆرجاران دۆگلاسی بیوەژن بەزەیی پێدا هاتۆتەوە. رەنگە ئەو پیاوانەش ئەو خانمە بکوژن. حەزی دەکرد بتوانێ ئاگەداری بکاتەوە، بەڵام دەیزانی ناوێرێ، نەوەك بیگرن و زەفەری پێ ببەن. لەو ساتەدا بیری لەو شتانە و زیاتریش کردەوە، کە گوێی لێبوو ئینجەن جۆ گوتی:

- بۆیە رووناکییەکان نابینی، چونکە گیا و دەوەن بەرچاویان گرتووی، کەمێك وەرە ئەملا.. ئاوا.. ئا بزانە.. دەبینی؟

- بەڵێ وا دیارە خەڵکی لەلایە، وا چاکترە لێی گەڕێی.

- وازی لێ بێنم کە بەنیازم یەکجاری ئەم وڵاتە جێ بێڵم. لێی گەڕێم کە رەنگە دەرفەتێکی دیکەم بۆ هەڵنەکەوێ، دووبارە پێت دەڵێم وەك پێشتریش پێم گوتی، چاوم لە سامانی ئەو ژنە نییە، تۆ دەتوانی بۆخۆتی ببەی. بەڵام مێردەکەی چەندین جار خراپەی لەگەڵ کردووم. رۆژێك لە رۆژان دادوەر بوو، هەر ئەو دەربەری کردم، بەس ئەوندەش نا، ئەمە تەنیا یەك لە ملیۆنی ئەو ئازار و ئەشکەنجەیە تووشی کردووم. حوکمی دام کە وەك قولێك لەبەردەرگەی زینداندا قامچی دراوم تێدەگەی؟ بەزمی خۆی پێکردم ئەوجا مرد. بەڵام من لە ژنەکەی دەردێنم.

- نا مەیکوژە.. وانەکەی.

- کوشتن؟ کێ باسی کوشتنی کردووە؟ ئەگەر بەخۆی لێرەبا دەمکوشت، بەڵام نەك ژنەکەی. کە دەتەوێ تۆڵە لە ژنێك بکەیەوە، مەیکوژە.. چاوی دەرێنە، کەپووی هەڵزڕێنە، وەك مانگا گوێی شەقکە.

- ئای خوا ئەوە چییە..

- رای خۆت بۆخۆت هەڵگرە، وا بۆ تۆ سەلامەتترە. من لە چارپاکەی دەبەستمەوە ئەگەر تا مردن خوێنی لەبەر رۆیی، ئەوە هەڵەی منە؟ ئەگەر وایلێهات بۆ ناگریم. هاوڕێم تۆ لەو شتانە یارمەتیم دەدەی، لەبەرخاتری من، تۆ بۆ ئەمە لێرەی رەنگە بەتەنیا نەتوانم، ئەگەر پاشەکشەش بکەی دەتکوژم، تێدەگەی؟ ئەگەر ناچار بووم تۆ بکوژم. ئەویش دەکوژم، ئەوکاتەش لام وایە کەس نازانێ کێ ئەو کارەی کردووە.

- باشە ئەگەر هەردەیکەین، با بیکەین، تا زووتر بێ چاکترە من وەك بی ناو ئاوێ دەلەرزم.

- ئێستا بیکەین؟ کە خەڵکی لەگەڵە؟ تەماشا.. خەریکە لێت بە گومان دەکەوم.

- نا.. با چاوەڕێ بین تا چراکان دەکوژێنەوە، پەلەمان نییە.

هاك هەستی کرد بێدەنگی بەدوای ئەو قسانە دادێ، بێدەنگیش گەلێك لە باسوخواسی کوشتنێ ترسناکترە. بۆیە هەناسەی خۆی گرت و پاشەوپاش گەڕاوە. هەنگاوی چاك و چەسپاوی دەهاوێشت. جارێك پێی کەوتە سەر چڵە دارێك، قرپەی لێوەهات شکا، ئەوەندە نەمابوو گیانی دەرچێ. گوێی راگرت، هەر بێدەنگی بوو. وردە وردە کشاوە تا تەواو لەوان دوورکەوتەوە، ئەوجا رووی وەرگێڕا و هەتا تێیدابوو غاریدا، کە گەیشتە کانە بەردینەکە ترسی

نەما. وەکو با بەقەد گردەکەدا دەهاتەخوارێ تا گەیشتە ماڵی ویلزییەکان. دەرگەکەی کوتا، پاش دەمێك سەری پیرەمێردەکە و دوو کوڕی فیلانی و زەبەلاحی لە پەنجەرەوە دەرکەوتن.

- ئەو هەرایە چییە، کێیە.. کێت دەوێ؟

- خێرا لێگەڕێن بێمە ژوور، تا هەموو شتێکتان پێ بڵێم.

- بۆ، تۆ کێی؟

- هەکلبێری فین.. خێراکەن، دەرگەم لێوەکەن.

- هەکلبێری فین، وا بزانم ناوێك نییە زۆر دەرگەی لێ بکرێتەوە، بەڵام کوڕینە لێی گەڕێن با بێتە ژوور، با بزانین کێشەکەی چییە.

که هاك هاتە ژووری یەکسەر گوتی:

- تکایە، هەرگیز بەکەس مەڵێن من پێم گوتوون، تکایە.. دەنا دەمکوژن. بەڵام ئەو بێوەژنە هەندێ جار بۆ من دۆستێکی باش بووە، بۆیە دەمەوێ بڵێم، پێتان دەڵێم، ئەگەر بەڵێنم پێبدەن بەکەس نەڵێن من بووم.

پیرەمێردەکە هاواریکرد:

- ئای.. ئەوە شتێکی هەیە پێمان بڵێ، ئەگەرنا واناکا! بیڵی کوڕم هەرگیز کەسێك لێرە ئاشکرات ناکا.

پاش سێ خولەکان پیرەمێرد و کوڕەکانی خۆیان چەکدارکرد و بەسەر گردی هەڵگەڕان و لەسەر پەنجەی پێ کەوتنە نێو گژوگیاکە و چەکەکانیان بەدەستەوە بوو، هاك پتر لەگەڵیان نەچوو. خۆی لەپەنای دەوەنان حەشاردا و گوێی هەڵخست. خامۆشییەکی ناخۆش لەناکاو رمبەی تفەنگێك و هاوارێك بەرزبۆوە.

هاك چیدی چاوەڕێ نەبوون، بگرەو بازیدا و تا توانای هەبوو و قاچەکانی هەڵیان دەگرت غاریدا.

# پاژی سییەم

کە تیشکەکانی کازیوەی بەیانی یەکشەمێ بڵاوبوونەوە، هاك بەئاگادارییەوە بە گردەکە هەڵگەڕا و زۆر بەنەرمی لەدەرگەی ماڵی پیرەمێردە وێلزییەکەیدا، هەموویان خەوتبوون، بەڵام چ خەوێك، لەبەر رووداوەکانی دوێنێ شەوێ هەر وەئاگا حسێب بوون، لە پەنجەرەوە دەنگێك هات:

- ئەوە کێیە؟

دەنگە ترساوەکەی هاك بە نزمی گوتی:

- تکایە رێمبدە بێمەژووریٚ من هاك فینم.

- ئەوە ناوێکە بەشەو و بەرۆژ ئەم دەرگەیە دەکاتەوە، فەرموو، کوڕی خۆم ئەمانە وشەگەلێکی نامۆبوون بەگوێی کوڕیژگەیەکی وێڵدا. بەڵام لە هەموو وشەیەك خۆشتربوو کە بیستبێتی. چەندی کرد بەبیری نەهاتەوە رۆژێك قسەی وای لەگەڵ کرابێ. دەرگەکە خێرا کرایەوە چووە ژووریٚ. فەرموویان لە هاك کرد تا دانیشێ و پیرەمێرد و کوڕەکانیشی خێرا خۆیان بگۆڕن.

- ئێستا کوڕی من، هیوادارم باش بی و برسیشت بێت، چونکە لەگەڵ رۆژهەڵاتی فراوین ئامادە دەبێ، خواردنێکی گەرمیش دەبێ. ئارخەیان و دڵارام بە، من و کوڕەکانم بە ئاوات بووین شەوی رابردوو گەڕابایەوە و لێرە خەوتبای.

هاك گوتی:

- یەکجار ترسام، بۆیە هەڵاتم، کە دەنگی تەقەکەم بیست، هەڵاتم. تا سێ میلم نەبڕی رانەوەستام، ئێستاش بۆیە هاتووم، تا شتێك لەو بارەییەوە بزانم، بۆیەش بەر لە رۆژهەڵاتێ هاتم، نەبادا ئەو دوو شەیتانە ببینم، تەنانەت ئەگەر مردووش بن.

- باش، لاوی هەژار، دیمەنت وا پێدەچێ شەوێکی ناخۆشت قەتاندبێ، بەڵام خاترجەم بە کە بەرچاییت کرد، نوێنێك ئامادەیە لەسەری راکشێی، نا.. ئەوانە نەمردوون کوڕم، ئێمەش بۆ

ئەوە زۆر پەرۆشین. پاش وەسفەکەی تۆ زانیمان لەکوێ دەیانگرین، جا بەسەر نووکی پێیان بۆیان چووین، تا پازدە پێ مابوو بیانگەینێ، لەو دەمە نارێکە هەستمکرد دەمەوێ بپژمم، ئەوە بەدبەختترین کاتم بوو، ویستم خۆم بگرم، نەمتوانی و پژمیم، منیش لەپێشەوە دەڕۆیشتم و دەمانچەم بەدەستەوە بوو، کە پژمیم ئەو دوو پیاوە خراپە هەڵاتن، هاوارم کردە کوڕەکانم دەسرێژیان لێبکەن، بەڵام ئەوان توانیان بەناو دار و دەوەنان هەڵبێن، ئێمە تا دارستانەکە بەدوایان کەوتین، لەوێ تەقەیان لێکردین، بەڵام کەسمانیان نەپێکا. کە دەنگی پێی ئەوانمان لە دارستانەکەدا لێ بزربوو، چیدی بەدوایان نەکەوتین و چووین هەواڵمان دا پۆلیسان، هێزێکیان چوون پاسەوانی لە کەناری رووبار بکەن. کە رووناکیش دابێ شەریف و پیاوەکانی دارستانەکە دەگەڕێن و پاش دەمێکی دیکە کوڕەکانی منیش بەگەڵیان دەکەون. خۆزگە هەندێك وەسفی ئەو دوو تاوانبارەمان بزانیبا، بۆ گرتنیان زۆر یارمەتی دەداین، بەڵام لام وایە تۆ لەتاریکی کەسیانت چاك نەدیوە.

- ئا بەڵێ، من لە شارێرا ئەوانم دی و بەدوایان کەوتم.

- جوانە، دەی کوڕەکەم وەسفەکانیان بڵێ.

- یەکێکیان ئەو پیرەمێردە ئیسپانییە کەڕولاڵەیە کە یەك دوو جار بەشاریدا گەڕاوە، ئەوی دیکەش پیاوێکی رەزاقورسی جلوبەرگ شڕۆڵە.

- بەسە کورم، دەیانناسم، رۆژێك لەناو دارستان نێزیك ماڵی بێوەژنێ دیومانن، بەڵام بەپەلە رۆیشتن، ئێستاکەش دەی کوڕەکانم بڕۆنە لای شەریف و پێی بڵێن، فراوینەکەشتان با بۆ سبەی سبەینێ بێ.

کوڕەکانی وێڵزی پیر یەکسەر بەرێکەوتن، کە دەیانویست بڕۆن هاك هەڵبەزی و هاواریکرد:

- تکاتان لێدەکەم بەکەس مەڵێن کە من زمانم لێداون، تکایە،

- با بە کەیفی تۆ بێ هاك، هەرچەند تۆ حەقە لەپای ئەو کارە باشەت پاداشتی وەربگری.

- ئای.. نا.. نا، تکایە مەیڵێن

کە گەنجەکان رۆیشتن، وێڵزی پیر گوتی:

- بێ خەمبە، ئەوان قسەناکەن و منیش هیچ ناڵێم، بەڵام بۆ دەتەوێ ناوت وا بزربێ؟!

هاك هیچی روون نەکردەوە، لەوە زیاتر کە شتگەلێکی زۆر لەبارەی یەك لەو پیاوانە دەزانێ، ناشیەوێ ئەو پیاوە بزانێ، کە ئەم هیچ شتێك لە دژی ئەو دەزانێ مەگەر هەموو دنیاشی پێ بدەن، بێشك ئەگەر ئەمە بزاندرێ دەکوژرێ.

پیرەمێرد دووبارە بەڵێنی پێدا و گوتی:

کوڕم، چۆن بوو وارێککەوت تۆ شوێن پێی ئەوانە هەڵگریٚ؟ ئایا گومانت لە شێوەیان هەبوو؟

هاك تا وەڵامێکی شیاوی رێکخستن، بێدەنگبوو، جا گوتی:

- باشە، تۆ دەزانی کەس کەیفی بەمن نایە، هیچ نەبیٚ هەموو هەر وا دەڵێن. ئەمەش زۆر خەمبارم دەکا، هەندیٚ جار تەواو نانووم چونکە زۆ بیر لەوە دەکەمەوە کە پێویستە چ بکەم بۆ ئەوەی خەڵك رێزم بگرن. دوێنیٚ شەویش وابووم، نەمتوانی بنووم، بۆیە لە دەوروبەری نیوەشەویٚ هاتمە سەر شەقام تا بیر لە خۆم بکەمەوە، کە گەیشتمە کۆنە کۆگەکەی لای خانی تێمپێڕانس، پاڵم بە دیوارەکەدا و بیرم لە چارەنووسی خۆم دەکردەوە. لەو ساتەدا ئەو دوو پیاوە هاتن، یەکێکیان شتێکی لەبن هەنگڵ بوو، وا گومانم برد کە شتێکی دزراوی هەڵگرتووە، پیاوەکەی دیکەش دەیویست جگەرەیەك داگیرسێنیٚ. یەکڕاست لەپێش من راوەستان، کە شقاتەیان لێدا توانیم روویان ببینم، جا زانیم زلترەکەیان ئەو ئیسپانییە کەڕوڵاڵەیە و لاچاوێکی خۆی گرێداوە و پیاوەکەی دیش ئەو شەیتانە رەزاقورسە شڕووڕە بوو.

- توانیت لەبەر رووناکی شەمچەیەك جلەشڕەکەی ببینی.

ئەمە کەمێك هاکی شپرزە کرد، ئەوجا گوتی:

- نازانم.. بەڵام پێدەچیٚ توانیبم.

- ئەوجا ئەوان بەڕێکەوتن و تۆش..

- بەدوایان کەوتم، بەڵیٚ وابوو، ویستم بزانم چ بووە، بینیشم بەهەشتاوی ئاوڕی ئەملاو ئەولای خۆیان دەداوە، بۆیە زیاتر گومانم لێکردن. پاشان دیتم لە تاریکی راوەستان و گوێم لێبوو شرووڕەکە تکای دەکرد و ئیسپانییەکە سوێندی دەخوارد هەر دەبیٚ چاوەکانی دەربێنیٚ، وەکو بەتۆ و بەهەردوو..

- چی! کەڕوڵاڵەکە ئەو هەموو قسەیەی کرد!

هاك زانی دیسان هەڵەی کرد، بەهەموو توانای خۆی هەوڵیدا وا بکا پیرەمێرد نەزانیٚ ئەو ئیسپانییە کێیە، بەڵام پێدەچوو بەهۆی زمانی لەکێشان تیٚ بکەویٚ و زۆری هەوڵدا هەڵەکان راستکاتەوە، بەڵام پیرەمێرد زۆر بەوردی تێی دەڕوانی و ئەویش ساتمە لە دوای ساتمەی دەکرد. جا پیرە وێلزی پێی گوت:

- کوڕەکەم لەمن مەترسە من یەك تاکە مووی سەریشت بە هەموو دنیا ناگۆڕمەوە. نا.. من دەتپارێزم، پارێزگاریت لێ دەکەم. ئەو ئیسپانییە کەڕوڵاڵ نییە، تۆ بێ ویستی خۆت درکاندت، تۆ شتێك لەبارەی ئەو پیاوە دەزانی و دەتەوێ بیشارییەوە، بەڵام متمانەت بە من بێ کوڕی خۆم. چیت لەدڵدایە پێم بڵێ، دڵنیابە ناپاکیت لێ ناکەم .

هاك دەمێك لەچاوە راستگۆکانی پیرەمێرد راما، ئەوجا خۆی دانەواندەوە و چرپاندییە گوێی:

- ئەوە ئیسپانی نییە، ئەوە ئینجەن جۆیە.

پیرەمێرد ئەوەندە نەمابوو لەکورسییەکەی خۆی دەرپەڕێ، یەکسەر گوتی:

- ئێستا هەموو شتێك روون بۆوە. کە تۆ باسی گوێ شەقکردن و لووت هەڵزراندنت دەکرد لام وابوو بۆخۆت هەڵیاندەبەستی، چونکە پیاوانی سپی پێست وا تۆڵەی خۆیان ناکەنەوە. بەڵام ئینجەن! لەهەموو شتێك جیاوازە.

لەکاتی فراوین کردندا، لە قسەکردن بەردەوامبوون، لەناو قساندا پیرەمێرد گوتی: بەخۆی و کوڕەکانی نەنووستوون تا چرایەکیان لەماڵێوە هێناوە و لەوێ بەدوای دڵۆپە خوێندا گەڕاون، بەڵام هیچمان نەدۆزیوەتەوە و بەستەیەك لە..

- لە چی؟

ئەو وشەیە وەك فیشەکە شێتە لەزاری هاك دەرپەڕی و چاوەکانی داپچڕان و هەناسەی هەڵما.. چاوەڕێ وەڵام بوو. پیرەمێردیش بە سەرسامییەوە تەماشای رووی وی دەکرد. سێ چرکە.. پێنج.. دە چرکەی پێچوو، ئەوجا وەڵامی دایەوە:

- بەستەیەك لە کەرەستەی دزان، بەڵام تۆ بۆ وا تێکچووی؟

هاك پاڵیداوە و هەناسەیەکی قووڵی بەنەرمی هەڵکێشا، لە دڵییەوە سوپاسگوزار بوو، وێڵزییەکە بەبایەخەوە چاوی تێبڕی و پێی گوت:

- بەڵێ.. ئەو کەرەستانەی دز بەکاریان دێنن.. دەڵێ ئەوە دەروونی حەساندییەوە.. بەڵام بۆ ئەوەندە سەرسام بووی.. بەتەمای چ ببینییەوە؟

هاك زانی ئەوجارە هەر تێدەکەوێ، پیرەمێرد بەدووچاوی هەڵۆ ئاسا تێی دەڕوانی، ئامادە بوو هەر شتێك ببەخشێ بەمەرجێك بگاتە وەڵامێ پیرەمێرد قەناعەتی پێ بێ و گومانی لێنەکا. بەڵام نەیتوانی ئەو جۆرە وەڵامە بدۆزێتەوە و چاوە تەماوییەکانیش هەر تێیان

دەڕوانی.. لەوساتە وەلامێکی زۆر ناماقوڵی بۆ هات، بەڵام هەڵێنەسەنگاند و بە ماندووبوونەوە گوتی:

- ڕەنگە بەستەی کتێبی فێرگەی یەکشەم بێ.

هاکی بەستەزمان نەیتوانی بگرژێتەوە، بەڵام پیرەمێرد لە پڕمەی پێکەنینیدا بەشێوەیەك لەتەوقی سەری تا بنی پێی دەلەرییەوە، دوای پێکەنینەکەی گوتی: ئەو جۆرە پێکەنینە پارەی ناو باخەڵی پیاوە، چونکە کرێی دکتۆران کەم دەکاتەوە، ئەوجا گوتی:

- ئای کە لاوێکی هەژاری، ڕەنگت سپی هەڵگەڕاوە، پێناچێ وەزعت باش بێ، سەیر نییە شپرزە و لاسەنگ دیاری. بەڵام بەسەریدا زاڵ دەبی، هیوام وایە حەسانەوە و نووستن هێزت وەبەر بهێنێتەوە.

هاك زۆر لەخۆی تووڕە بوو، چونکە ئەوەندە کاڵفام و نەفام بوو گومانی خستە دڵی ئەو پیاوە، هەرزوو دەبووایە ئەو بیرە وەلانێ کە ئەو بەستەیەی دوو پیاو خراپەکە لە خانەکەوە هێنایان گەنجینەکەی تێدابوو، بەتایبەتی کە گوێی لێبوو هەڕەشەی بێوەژنەکەیان دەکرد. ڕاستە ئەو هزرەی بەخەیاڵدا هات، بەڵام لێی دڵنیا نەبوو، کە باسی دۆزینەوەی بەستەکەش هاتەگۆڕێ خۆی پێ نەگیرا. بەڵام لەپاڵ ئەمانەشدا هێشتا شادبوو بەوەی کە دوای تەواوبوونی کێشەکەی زانی ئەو بەستەیە گەنجینە و سامانەکە نەبووە. ویژدانی حەساوە.

لەڕاستیدا هەموو شتێك بە ئاراستەیەکی باشدا دەڕۆیی، ئێستا دەبێ گەنجینەکە لە ژمارە دوو دا مابێ، پیاوەکان دەگیرێن و دەخرێنە زیندان. جا بۆ شەوێ بەخۆی و تۆم دەچن، دوور لەهەموو کێشە و ترسێك زێڕەکە وەدەست دێنن.

هەر لە بەرچایی تەواوبوون، لەدەرگە درا هاك هەڵبەزی و بەدوای پەنایەکدا گەڕا خۆی تێدا بشارێتەوە، مکوڕ بوو، کە هیچ پێوەندییەکی دووریشی بەو دۆزەوە نەبێ. پیرە وێڵزی فەرمووی لە چەند خانم و بەڕێزێك کرد، کە دۆگلاسی بێوەژنیشیان لەگەڵ بوو، تێبینی ئەوەشی کرد، کە هاووڵاتیان بە کۆمەڵ بەگردۆڵکەکەدا هەڵدەگەڕێن تاکو شانۆی ڕووداوەکە ببینن، بەمەڕا دیار بوو هەواڵەکە بڵاوبۆوە. پیرەمێرد ناچاربوو بەسەرهاتی شەوێ بۆ میوانەکانی بگێڕێتەوە، سوپاسی بێوەژن لەپای ڕزگارکردنی لەرادەبەدەر بوو.

- خاتوون پێویست ناکات لەم بارەیەوە شتێك بڵێی، تۆ لەپای ڕزگاربوونت زۆر لە من و کوڕەکانم پتر قەرداری کەسێکی دیکەی، بەڵام ئەو کەسە ڕێمان نادا ناوی بڵێین.. چونکە ئەگەر ئەو نەبایە نەماندەتوانی ڕێ لەو تاوانە بگرین.

بێگومان ئەو قسانە ئارەزووی میوانەکانی بزواند تا ئەو کەسە بناسن. بەڵام پیرەمێرد هەرگیز ناوەکەی نەگوت و ئاماژەی بە کەسایەتییەکەی نەکرد، نەوەك ئەو نهێنییە بەهەموو شاریدا بڵاوبێتەوە، کە هەموو شتەکانی وی باسکران بێوەژن گوتی:

- من چوومە ناو جێگەم و کەمێك خوێندمەوە، هەرچەند دەنگەدەنگێکی زۆر لە دەرێوە دەهات، بەڵام خەوم لێکەوت، بۆ نەهاتن هەڵمستێنن؟

- وامزانی پێویست نییە، چونکە رێی تێ نەدەچوو، ئەو دوو پیاوە خراپە چیدی بگەڕێنەوە، چونکە هیچ کەرەستەیەکیان لا نەمابوو دیواری پێ ببڕن.

- وەئاگاهێنان و تۆقاندنی تۆ چ سوودێکی دەبوو؟ هەر سێ کۆیلە قولەکەی منیش تا بەیانی بەدەوری ماڵی تۆوە نۆبەتیان گرتبوو، هەر دەمێکە هاتوونەوە.

میوانی دیکەش هاتن و سەربردەکەش لەماوەی دوو سەعاتان بۆ دووەم جار گێڕدرایەوە.

بەدرێژایی پشووی قوتابخانە، فێرگەی یەکشەمان دادەخرا، لەگەڵ ئەمەش کە ئەو باسە بڵاو بۆوە. هەموو خەڵك زوو گەیشتنە کڵێسا، هەواڵ هاتن کە هیچ شوونێکی ئەو دوو تاوانبارە تا ئێستا هەڵنەگیراوە. کە سرووتەکە تەواوبوون ژنی تاچەری دادوەر لەنێو جەماوەردا، کە بەرەو دەرگە دەهات، هاتە پاڵ خاتوو هارپەر و گوتی:

- ئەرێ بێکی کچم بەدرێژایی رۆژ لەلای ئێوە دەنوێ؟ دەبێ زۆر ماندووبێ.

بێکی کچت؟!

- بەچاوێکی پڕ ترسەوە: بەڵێ ئەدی شەوی رابردوو لای ئێوە نەبوو؟

- بۆ، نا..

خاتوو تاچەر زەرد هەڵگەڕا و بەسەر کورسییەکدا کەوت. لەو ساتەشدا پوورە پۆلی لەگەڵ دەستە خوشکێکی قسەی دەکرد، کە بەلایاندا تێپەڕی، گوتی:

- بەیانی باش خاتوو تاچەر، بەیانی باش خاتوو هارپەر، دیسان ئەو هەتیوە بزربووە، لام وایە ئەم شەوە لەماڵی یەکێکیان بووە، بەڵام نەیوێراوە بێتە کڵێسا، چارەی دەکەم.

خاتوو تاچەر سەری بە ئەرێ هەڵتەکاند و یەکجاری سپی هەڵگەڕا. خاتوو هارپەریش پەشۆکا و گوتی:

- لای ئێمەش نەبووە.

شپرزەیی و دڵەڕاوکێ رەنگ و ڕووی پوورە پۆلیشی داگرت.

- جۆ هارپەر تۆ ئەم بەیانییە تۆمی منت دیوە؟

- نا خانم

- دواجار کەی دیوتە؟

جۆ هەولّی دا بیّتەوە یادی، بەلاّم دلّنیا نەبوو، خەلّکەکە چیدی نەچوونە دەریّ، چرپە لەنیّوانیان دەستی پیّکرد و دوودلّی رووی هەمووانی داگرت، منداڵان و مامۆستا گەنجەکان زۆریان پرسیار لیّکرا، هەموویان گوتیان کە لەکاتی گەڕانەوەدا کەسیان تێبینی ئەوەیان نەکردووە تۆم و بیّکی سواری کەشتییەکە بووبن یان نا، چونکە زۆر تاریك داهاتبوو، بۆیە کەس هەولّی نەدەدا بزانیّ کەس لە هاوەڵان لە کەشتییەکە دابڕاوە یان نا، لەدواییشدا گەنجیّك رایگەیاند، کە ترسی ئەوەی هەیە هیّشتا ئەو دووە لەنیّو ئەشکەوتەکەدا مابن، خاتوو تاچەر یەکسەر لە هۆشی خۆی چوو، پورە پۆلیش دەستی بەگریان و پەکوف پەکوفی کرد.

ئەم هەواڵە زار بەزار و ماڵ بەماڵ و کۆمەڵ بەکۆمەڵ و شەقام بەشەقام گواستراوە. لەماوەی پیّنج خولەکدا زەنگەکان زۆر بەتوندی لیّدران. هەموو دانیشتوان بە ئاگا هاتن، سەرهاتەکەی ئەو شەوەی کاردیف هیلّ هەر لەبیر کرا. ئەسپ و بەلەم و کەشتییەکە ئامادەکران، هیّشتا نیو سەعات بەسەر بڵاوبوونەوەی هەواڵەکەدا رەتنەببوو، دوو سەد پیاو لە ریّگەکان خڕببوونەوە و بەرەو رووباریّ دەچوون تا بچنە ئەشکەوتەکە.

بەدریّژایی دوای نیوەڕۆ گوندەکە وەك چۆلّەوانی وابوو، ژنیّکی زۆریش سەردانی مالّی پوورە پۆلی و خاتوو تاچەریان کرد تا دلّیان بدەنەوە، زۆر لەگەلّیان گریان، چونکە ئەمە لەقسان باشتر بوو. بەدریّژایی ئەو شەوە هەراسانە شار چاوەڕیّی هەوالّیّك بوو، لەدواییش کە رۆژهەلاّت یەك گەیشتبوو کە دەیگوت: "مۆمی زیاتر بنیّرن.. خواردن رەوانە بکەن".. هەنگیّ خاتوو تاچەر و پوورە پۆلی زۆریان نەمابوو شیّت بن. تاچەری دادوەر پەیامی پڕ لە هاندان و هیوای لە ئەشکەوتەکەوە دەناردەوە، بەلاّم خۆشییەکی راستەقینەیان تیّدا نەبوو.

پیرەمیّری ویّلّزی لەگەلّ رۆژهەلاّتیّ گەڕایەوە مالّیّ و دەموچاو و پۆشاکی بەچەوری مۆم و قوڕ داپۆشرابوو، هیّند ماندوو بوو، چی نەمابوو لەخۆچیّ. دیتی وا هاك لەناو جیّگەکەی کەوتووە و تایەکی وا گەرمی لیّیە، هوڕیّنە دەکا، چونکە لەو کاتیش هەموو دکتۆرەکانی گوند لەنیّو ئەشکەوتەکەدا بوون. ناچار دۆگلاسی بیّوەژن هات تا چاوی لیّبیّ و دەیگوت، هەرچی پیّ بکریّ بۆی دەکات و چاوی لیّدەبیّ، جا ئەگەر کوڕیّکی باش بیّ یاخۆ خراپ، جیاوازی نییە، چونکە ئافەریدەیەکی خودایە، مرۆڤیش نابیّ هیچ لە ئافەریدەکانی خوا پشت گویّ بخا، پیرە ویّلّزی گوتی، هاکیش سیفەتی باشی هەن. بیّوەژن گوتی:

- دەبێ دڵنیابی چاکەی هەن، خودا هیچ ئافەریدەیەك بێ چاکە وەدی ناهێنێ.

پاش نیوەڕۆیەکی زوو چین چین پیاوەکان بە شەکەتی دەگەڕانەوە گوند، تا لە ماڵەکانیاندا بحەسێنەوە، لەکاتێکدا ئەو پیاوانەی زۆر بەهێزیش بوون لەگەڕانی نێو ئەشکەوتەکەدا بەردەوامبوون. تەنیا ئەوەندە زانیارییەشی دەستکەوت، کە نەك هەر شوێنە ناسراوەکانی ئەشکەوتێ، بەڵکو شوێنە نەناسراوەکانیش گەڕاون و هەموو گۆشەیەکی بە وردی دەپشکنرێ. بەڵام کەس دڵنیا نییە ئاخۆ ئەو تۆڕە تێك ئاڵاوەی ڕاڕەو و گوزەرەکان هەمووی دەپشکنرێ، چونکە زۆر ئەستەمە بژمێردرێن یاخۆ سەروخواریان لێك جیا بکرێتەوە. چونکە زۆرجار کۆمەڵێك لەوسەر رووناکییەك یان تەقەی دەمانچەیەکیان دەبیست، که دەچوون هەر هاوەڵانی خۆیان لەوێش دەدیت. بەڵام لە زۆر شوێنی ئەشکەوتێ هەردوو ناوی بێکی و تۆمیان بینیوە بە دووکەڵی مۆم لە دیواری نووسراوە، هەروەك لەپاڵ ناوەکان لە ڕاڕەوێکدا پارچە قردێلەیەکی چەوریان دۆزیوەتەوە. خاتوو تاچەر هەرزوو قردێلەکەی ناسییەوە و بەسەریدا تێر گریا و گوتی، ئەمە دوا یادگاری کچەکەی دەبێ و دەبێتە خۆشەویستترین یادگاریش، چونکە دوایین شتە بە زیندووی و بەر لە مردن بەرجەستەی کیژۆڵەکەی کەوتبێ، هەندێك لە ئەشکەوتێوە دەیانگوت چەند جار رووناکیان دیوە، بریسکاوەتەوە و هاتوهاواری زۆر هاتووە، پیاوان غاریانداوەتە ئەوێ و بەدوای دەنگدانەوەکەدا چووینە، بەڵام دڵسارد بوون، چونکە منداڵەکان لەوێ نەبووینە و تەنیا چرای دەست ئەوانە بووە کە گەڕاون.

ساتەکانی ئەو سێ شەو و رۆژە درێژە زۆر بەگرانی تێدەپەڕین، گوندەکە تەواو بێ هیوا ببوو، کەس دڵی نەدەچووە هیچ شتێك. کە ئەوەش ئاشکرا بوو خانی تێمپێرانس شەرابی قەدەغەی هەڵگرتووە، هەرچەند هەواڵێکی وروژێنەریش بوو، کە گوێی پێنەدا. لە یەکێك لەو ساتانەی هاك تیایدا بە ئاگابوو، باسی خانەکەی کردەوە و لەکۆتاییدا پرسی ئەگەر لەکاتی نەخۆشییەکەی ئەودا شتێك لە خانی تێمپێرانس دۆزرابێتەوە.

بێوەژن گوتی: بەڵێ

هاك لەسەر جێ قیت بۆوە، بەچاوی زەقەوە گوتی:

- چی، چییان دۆزییەوە.

- شەراب. خانەکەشیان داخست، پاڵدەوە کورم، زراوت بردم.

- تەنیا یەك شتم پێ بڵێ.. بەس یەك شت تکایە! ئایا تۆم سۆیەر ئاشکرای کرد؟

بێوەژنەکە لە پڕمەی گریانیدا گوتی: "وسبە ڕۆڵە، پێشتر پێمگوتی نابێ قسە بکەی تۆ زۆر زۆر نەخۆشی!

- کەواتە تەنیا شەراب دۆزراوەتەوە، خۆ ئەگەر زێریش بدۆزراباوە گوندەکە هەمووی سەرسام دەبوو. واتە تاهەتایە سامانەکە لەدەستچوو، تاهەتایە. بەڵام ئەوە بۆچی دەگری؟ زۆر سەیرە دەگری.

ئەو شتانە بە خەیاڵ و مێشکی هاکدا دەهاتن، بەڵام دەرینەبڕین زۆریشی نەبرد وەنەوزی داو خەوی لێکەوت. بێوەژن بەخۆی گوت:

- وا ئەو کوڕە بەدبەختە نووست، تۆم سۆیەر دۆزییەوە! مایەی خەمە کە کەس نییە تۆم سۆیەر بدۆزێتەوە! وەیش هیوای زۆر نەماون، پیاوی بەهێزیش نەماون زیاتر بگەڕێن.

# پاژی سی و یەکەمین

ئێستا با بگەڕێینەوە لای تۆم و بێکی کە لە گەشتەکەدا بەشداربوون پێکەوە لەگەڵ ئەوانی دی بە ڕاڕەوەکانی ئەشکەوتێدا ڕۆیشتن. سەردانی شوێنە ناسراوەکانیان دەکرد. سەریان لەو ئەشکەوتە سوڕما بوو، لەو نووسینانە رادەمان کە بە دار و دیوارەکانەوە بوون و نەناسراو نووسیبوویان وەك (ژووری دانیشتن)، (کاتێدراڵ) و (کۆشکی عەلائەدین) و ئەو شتانە. هەموو دەستیان بەگەمان کرد، تۆم و بێکیش لەگەڵ ئەوان تا شەکەت بوون یارییان کرد. پاشان بە گوزەرێکی خوار و خێچدا رۆچوون، مۆمەکانیان لەسەر سەریان راگرتبوو تا بتوانن هەموو ناو و مێژوو و پیشە و دروشمەکان بخوێننەوە کە خەڵکانێکی پێشتر بە دووکەڵی مۆمەکانیان لەسەر دیوارە بەردینەکان تۆماریان کردبوون.. هەر دەڕۆیشتن و قسەیان دەکرد. بێ ئەوەی هەست بکەن کە گەیشتوونەتە شوێنێك، چیدی نووسینی تێدا نییە. لەوێ هەردووك ناوی خۆیان لەسەر دیوارەکان نووسی لەژێر تاقیچکەیەکی هەڵواسراو، جا لە رۆیشتن بەردەوامبوون، تا گەیشتنە شوێنێك سەرچاوەی جۆگەلە ئاوێکی لێ هەڵدەقولا و بەسەر لێوارێکی بەردیندا شۆڕدەبۆوە و بەتێپەڕبوونی کات قەڵبەزێکی بچووکی لەناو بەردان دروستکردبوو. تۆم یەکسەر ئارەزووی دۆزینەوەی لەدڵدا بزواو بێکیش بەگوێی کرد و بە گەڵی کەوت، پاش ئەوەی نیشانەیەکیان کێشا تا لەکاتی گەڕانەوە رێی خۆیانی پێ بدۆزنەوە، بەرێکەوتن و بۆ ئەملا و ئەولا سووڕانەوە و بەرەو قووڵایی نهێنی ئەشکەوتەکە دەچوونە خوار، جا نیشانەیەکی دیکەشیان دروستکرد و بە لقەکانی دیکەی ئەشکەوتێدا گەڕان تا شتێکی تازە بدۆزنەوە، کە لەدوا رۆژدا شانازی پێوەبکەن. لە شوێنێك ئەشکەوتێکی فرەوانیان دیتەوە. کە کۆمەڵێکی زۆر بەردی مەڕمەڕی بریقەداری لەسەرەوەڕا پێدا شۆڕببۆوە. هەر یەکەیان هێندەی قاچی پیاوێك دەبوو. زۆر بە وردی تێیانڕامان و بەسەرسامی بەدەوریاندا سووڕانەوە. پاشان جێیان هێشت و چوونە یەکێك لەو هەموو گوزەرەی لێیەوە دەردەچوون. زۆری نەبرد ئەو گوزەرە گەیاندینە سەر کانیاوێك لەناو جەرگەی ئەشکەوتێدا، کە بنمیچەکەی لەسەر کۆمەڵێك کۆڵگەی زۆر جوان راوەستا بوو، کە لەئەنجامی کۆبوونەوەی بەردی مەڕمەر پێکهاتبوون و

هەندێك بەرد ئاو كاری تێكردبوون و دڵۆپ دڵۆپ ئاویان لێدەهاتەخوار. بەكۆمەڵ شەمشەمەكوێرە كە ژمارەیان دەگەیشتە هەزاران لەژێر ئەو ساپیتەیە خڕببوونەوە. رووناكی مۆمەكان ئەو گیانلەبەرانەی بێزاركردبوو، سەدانیان بەباڵەفڕكە لێ هاتەخوارێ، دەیانقیژاند و بەرەو مۆمەكان هەڵپەیان دەكرد. تۆم شارەزای شەمشەمەكوێرە و ترسناكی هەڵسوكەوتیان بوو، بۆیە قۆڵی بێكی گرت و بۆ نێزیكترین گوزەر رایكێشا، لەوساتە شەمشەمە كوێرەیەك هەڵیكوتا لای مۆمەكەی بێكی و كوژاندییەوە. بەڵام منداڵەكان توانیان بچنە نێو گوزەرەكە و تا دەتوانن غاردەن، تا شەمشەمەكوێرەكان وازیان لێ هێنان. تۆم دەریاچەیەكی لەژێر زەوی دیتەوە، كۆتایی نەبوو، بۆیە ویستی بزانی سنوورەكانی تا كوێن، بەڵام وای بەباش زانی كەمێك بحەسێنەوە، یەكەمجاریش لەوەتەی هاتوون هەست بكەن لەنێو خامۆشی و بێدەنگیدا نقوم بوون و گیانی كڕ و كپی، گیانی داگرتبوون. بێكی گوتی:

- وەی خوایە، پێشتر ئاگام لێنەبوو، زۆر لەمێژە دەنگی كەسمان گوێ لێ نەبووە.

- بێكی بیر بكەوە، ئێمە زۆر لەخوار ئەوانین، ناشزانم چەند بەرەو باكوور یاخۆ باشوور یان رۆژهەڵات یاخوود رۆژئاوا یاخۆ هەرلایەك چووین. لێرە ناتوانین دەنگیان ببیستین.

بێكی پەشۆكا و گوتی:

- نازانم ماوەی چەندە ئێمە لێرە لەژێرەوەین؟ چاكترە بگەڕێینەوە.

- بەڵێ لام وایە چاكترە

- ئەرێ تۆم تۆ رێگەكە دەناسییەوە؟ لای من هەمووی تێكەڵ و پێكەڵە.

- پێموایە دەتوانم بیبینمەوە.. بەڵام ئەی شەشەمە كوێرەكان، ئەگەر مۆمەكانیان كوژاندینەوە، خۆ دەفەوتێین، چاكترە رێیەكی دی بگرینەبەر و بەوێ دانەچینەوە.

- باشە، بەڵام خوا بكا بزر نەبین. چونكە زۆر ناخۆش دەبێ.

كچە لەبەر ئەو بۆچوونانەی راجفری.

لە ڕاڕەوێكەوە دەستیان بە رۆیشتن كرد و بە بێدەنگی ماوەیەكی زۆریان بڕی. هەر دەرچەیەكیان بهاتبایە پێش، لێی وردەبوونەوە بزانن چی تێدا نییە بیناسنەوە، بەڵام هەموو لەلایان نامۆ بوون. هەر جارێك تۆم رێگەیەكی تازەی بگرتبا، كچەكە لە دەموچاوی ورد دەبۆوە. بەڵكو نیشانەیەكی باشی لێ بەدیكا، بەڵام ئەو هەر بەرووێكی گەشەوە دەیگوت:

- باشە، ئەمەشیان هەو نییە. بەڵام رێگە راستەكە دەبینینەوە.

بەڵام لەگەڵ هەر شکستێك بەرەبەرە هیوای کەمتر دەبوونەوە. لەخۆڕا گوزەرێکی گرتەبەر و تەمای دۆزینەوەی ئەوەی نەمابوو کە دەیویست. هەر دەیگوت "زۆر باشە" بەڵام تووشی ترس و دڵساردییەکی وا هاتبوو دەنگی زرینگەی جارانی تێدا نەمابوو دەتگوت دەڵێ "زۆر خراپە". بێکی بەدڵێکی پڕ ترسەوە هاتە پاڵی و هەوڵیدا فرمێسکی خۆی ڕاگرێ، بەڵام هەر هاتنەخوارێ و لەکۆتاییشدا گوتی:

- تۆم، گوێ مەدە شەمشەمەکوێران، با بەوێدا بگەڕێینەوە. پێدەچێ بارودۆخمان خراپ و خراپتر بێ.

تۆم گوتی: گوێ مەدێ.

بێدەنگییەکە زۆر قووڵ بوو، تەنانەت هەناسەدانیش هاشەی دەهات تۆم هاواریکرد، بە داڵان و ڕاڕەوە بەتاڵەکاندا دەنگیان دایەوە، پاشان وەك دەنگی پێکەنینی گاڵتە جاڕان خنکان.

بێکی گوتی:

- توخوا چیدی وا مەکە تۆم زۆر ترسناکە.

- ترسناکە بەڵام بێکی چاکترە هاوارکەم دەزانی ڕەنگە گوێیان لێمان بێ، ئەوجا جارێکی دیکەش هاواریکرد.

ئەو دەنگەیە تەنانەت لەو پێکەنینە خێوئاسایە ترسناکتر بوو. هیوای لەبەر بڕین، هەردووك لە شوێنی خۆیان ڕاوەستان و گوێیان هەڵخست، بەڵام ئەنجامی نەبوو. تۆم خێرا گەڕاوە ئەو ڕێیەی لێوەی هاتبوو، بەڵام پاش دەمێك تووشی دوودڵی هات و هەڵسوکەوتەکانی شتێکی دیکەشیان بۆ بێکی دەرخست، کە ئەو ڕێگەیەش نادۆزێتەوە کە پێیدا هاتوون.

- ئای تۆم تۆ هیچ نیشانەیەکت بەجێ نەهێشتووە!

- بێکی من زۆر دەبەنگ بووم، گێل بووم، بیرم لەوە نەکردەوە کە ناچاربین پێدا بچینەوە! نا من ناتوانم ڕێگە بدۆزمەوە هەمووی تێکەڵە.

- تۆم، تۆم، ئێمە بزربووین بزر، هەرگیز ناتوانین لەم جێگە ناخۆش و بەترسە دەربچین، وەیش، باشە بۆ ئەوانی دیکەمان بەجێهێشت؟

هێزی لەبەربڕا و لە شوێنی خۆی بەربۆوە، ئەوەندە بە کوڵ دەگریا، تۆم لای وابوو دەمرێ، یان شێت دەبێ، لەپاڵی دانیشت و لەباوەشی گرت، ئەویش سەری بە سنگی تۆم کرد و خۆی پێدا هەڵواسی و پەشیمانی و ترس و تۆقینەکانی خۆی دەردەبڕی. دەنگدانەوەی قسەکانیان دەتگوت پێکەنینی شێتانە. تۆم لێی دەپاڕایەوە تا دووبارە هیوای بێتەوەبەر، بەڵام ئەو گوتی

ناتوانم، تۆم دەستی بە لۆمە و سەرکۆنەکردنی خۆی کرد، چونکە تووشی ئەوبارە ناخۆشەی کردووە. ئەمەش زۆر کاریگەر بوو. کچە گوتی هەوڵ دەدا دیسان هیوایەك پەیداکاتەوە و هەستێتەوە و کێوەی بویَ بەدوای کەویّ. بە مەرجێك جارێکی دی ئەم جۆرە قسانە نەکەنەوە. چونکە هەردووك هێندەی یەکتری شایستەی لۆمە و سەرکۆنەن.

دیسان بیّ ئامانج دەستیان بە ڕۆیشتن کردەوە و هەر لەخۆڕا ملیان لێنابوو، هەر ئەوەندەیان بەدەستەوە مابوو کە تا دەتوانن ڕانەوەستن و لە ڕۆیشتن بەردەوام بن. پاش ماوەیەکی کەم هیوایان ژیاوە، چ هۆکارێکیش نەبوو، بەڵکو تەنیا چونکە سروشت وایە و کانی هیوا و ئاواتان هەرگیز چك ناکا و هیشك نابیّ.

دواتر تۆم مۆمەکەی بێکی وەرگرت کوژاندییەوە، ئەو ئابووری کردنەش مانای خۆی هەبوو. پێویستی بە قسە نەبوو. بێکی تێگەیی و دیسان بیّ هیوا بۆوە. دەیزانی تۆم مۆمێکی ساغی لایە و سیّ چوار پارچەیەکیشی لە گیرفانە، ئەوجا هێشتا دەستیان پێوە دەگریّ.

بەرەبەرە ماندووبوونیان لیّ دەردەکەوت، ویستیان گویّ نەدەنیّ، چونکە لەو دەمەی کات زۆر بەهادارە دانیشتن و بیرکردنەوە زۆر کارێکی خراپە، بەڵام جووڵاَن بەهەر ئاڕاستەیەك هەر هیچ نەبیّ پێشڤەچوونێك بوو، کە ڕەنگە ئەنجامێکی هەبا، لەجێوە دانیشتن تەنیا مردنێکی خێرا بوو.

لەکۆتاییدا قاچەکانی بێکی لەکار کەوتن و چیدی هەڵیان نەگرت. دانیشت و تۆمیش لەگەڵ ئەودا حەسایەوە. لەبارەی ماڵیّ و دۆستەکانی ئەوێیان دووان.باسی نوێنی نەرم و نیان و جوانی ڕووناکیان کرد! بێکی گریا، تۆم هەوڵیدا بیر لە ڕێگەیەك بکاتەوە هێوری کاتەوە. بەڵام هەرچی کردی بیّ سوود بوو. کچە تەواو شەکەت بوو، چاوەکانی کەوتن نووست. تۆم پشی هاتەوەبەر، لە ڕووە زەردهەڵگەڕاوەکەی دەڕوانی، کە لەژێر کاریگەریی خەونی خۆش بەرە بەرە هاتەوە باری سروشتی. پاشان زەردەخەنەیەکیشی کەوتە سەر لێوان وەك بڵیّ پەتا بوو ڕۆحی تۆمیشی گرتەوە. ئەمیش بیر و خەیاڵی بە ڕابردوو و یادەوەرییە خۆشەکانی هاتەوە یاد. بێکی بە پێکەنینێکی تەنکەوە خەبەری بۆوە، بەڵام هەر زوو لەسەر لێوانی وشك بوون و بەخەمەوە گوتی:

- ئاخ، ئەوە چۆن نووستم! خۆزگە هەرگیزاوهەرگیز وەئاگا نەهاتبام! نا، نا تۆم وا سەیرم مەکە جارێکی دی وا ناڵێم.

- بێکی من دڵخۆشم بەوەی تۆ نووستی، پێدەچێ ئێستا حەسابییەوە، ئەوجا رێی خۆشمان بۆ دەرێ دەدۆزینەوە.

- تۆم، ئێمە دەکرێ هەوڵدەین، بەڵام من وڵاتێکی ئەوەندە جوانم لە خەوێدا دی پێشموایە بەرەو ئەوێ دەچین.

- رەنگە وا نەبێ، دڵتەنگ مەبە بێکی، با برۆین و هەوڵدەین.

هەستانەوە و بێ هیوا بەرێکەوتن، دەستی یەکیان گرتبوو هەوڵیاندا بزانن چەندیان کات لەنێو ئەشکەوتێ بەسەردا تێپەڕیوە، بەڵام هەر ئەوەندەیان دەزانی کە رەنگە چەند حەفتەیەك بێ، لەگەڵ ئەوەش دیار بوو خەملاندنەکەیان هەڵەیە، چونکە هێشتا مۆمیان تەواو نەببوو، ماوەیەکی درێژیش دوای ئەوە کە نەیاندەزانی چەندە، تۆم گوتی دەبێ بەدوای ترپەی دڵۆپە ئاواندا برۆن چونکە پێویستە کانیاوێك بدۆزنەوە. زۆری پێنەچوو کانییەکیان دیتەوە. تۆم گوتی کاتی ئەوە هاتووە دیسان بحەسێینەوە. هەردووکیان برستیان لێبڕا بوو. کەچی بێکی گوتی، لای وایە دەتوانێ هێشتا بروا. چەندی پێ سەیر بوو کە تۆم رازی نەبوو تێی نەگەیشت. دانیشتن تۆم بە هەندێ قوڕ مۆمەکەی لە دیواری پێشە خۆیان چەقاند. مێشکیان خەریك بوو بتەقێ، ماوەیەك کەس قسەی نەکرد، پاشان بێکی گوتی:

- تۆم گەلێکم برسییە!

تۆم شتێکی لەگیرفانی دەرهێنا و گوتی:

- ئەمەت دێتەوە یاد؟

بێکی بەبزەیەکەوە گوتی:

- ئەوە کێکی هاوسەریمانە تۆم

- وایە.. حەزم دەکرد ئەوەندەی بەرمیلێك با، چونکە تەنیا ئەمەمان ماوە.

- تۆم، ئەمەم لە گەشتەکە بەپاشدا هەتا بیکەینە سەرچاوەی خەونەکانمان، وەك گەورەکان و کێکی هاوسەرگیری. بەڵام ئەمە دەبێتە کێکی..

قسەی خۆی تەواو نەکرد، تۆم کێکەکەی کەرت کرد و پارچەیەکی دا بێکی کە زۆر بەتام و چێژ خواردی، تۆم وای نیشاندەدا کە خەریکی خواردنێتی. ئاوی فێنکی کانیاوەکەش زۆر بوو تا لێی بخۆنەوە. پاش کەمێك بێکی پێشنیازی کرد دیسان بجوولێنەوە، تۆم ساتێك بێدەنگ بوو، پاشان گوتی:

- بێکی.. دەتوانی بەرگەی هەواڵێك بگری پێتی بڵێم؟

بێکی زەردهەڵگەڕا بەڵام پێی وابوو دەتوانێ.

- باشە، بێکی.. دەبێ هەر لێرە بمێنینەوە، کە ئاوی تێدایە بیخۆینەوە، چونکە ئەمە دوا پارچە مۆمە لەلامان!

بێکی دەستی بە ناڵە و گریانێ کرد. تۆم زۆر هەوڵیدا بارەکەی سووک کا، بەڵام بێ سوود بوو، لە دواییدا بێکی گوتی:

- تۆم!

- بەڵێ بێکی؟

- دەبێ بیرمان بکەن و بەدواماندا بگەڕێن.

- بەڵێ بێگومان وا دەکەن.

- تۆم ڕەنگە ئێستا بەدواماندا بگەڕێن.

- بەڵێ پێموایە، هیوادارم وابێ.

- تۆم دەبێ کەی بیرمان بکەن.

- ڕەنگە ئەو دەمی دەگەڕێنەوە ناو کەشتییەکە.

- تۆم ڕەنگە هەنگێ تاریك بێ، دەبێ تێبینی بکەن کە ئێمە نەگەڕاینەوە؟

- نازانم، بەڵام هەرچۆنێ بێ، هەر بگەڕێنەوە دایکت لێت دەپێچێتەوە.

ترس لەرووی بێکی نیشت، تۆم زانی تێکەوت. چونکە بێکی بەتەما بوو ئەو شەوێ بچێتەوە. منداڵەکان بێدەنگ بوون و کەوتنە بیرکردنەوە. پاش دەمێك شەپۆلێك خەمی دیکە سەر رووی بێکیان داپۆشت، تۆم زانی ئەوی بەخەیاڵی ویدا دێ لە مێشکی کیژەش هەیە. کە ڕەنگە نیوەی بەیانی شەمە تێپەڕێ ئەوجا تاچەر بۆی دەرکەوێ کە بێکی لەماڵی خاتوو هارپەر نەبووە.

هەردوو منداڵەکە چاوەکانیان بڕییە ئەو مۆمە بچووکەی مابوویان و تەماشایان دەکرد چۆن وا بێ بەزەییانە دەتوێتەوە. ئەوجا دیتیان دواین نیو ئینجی فتیلەکەی چەوری پێوە نامێنێ و بڵێسەکە بەرزو نزم دەبێ و دووکەڵێکی لێ هەڵدەکشێ. پاشانیش تاریکی هەموو لایەکی داگرت.

ماوەیەکی زۆری پێچوو کە کەسیان نەیاندەزانی چەندە، بێکی وەئاگا هاتەوە، کە سەری بەسەر قۆڵی تۆم کردووە و دەگری.. هەر ئەوەندەیان دەزانی کە پاش تێپەڕبوونی ئەو ماوە درێژە لەسەر خەوەکەیان خەبەریان ببۆوە و دووبارە خەم و کەسەریان دەستی پێکردەوە. تۆم

گوتی ڕەنگە ئەمڕۆ یەکشەم یاخۆ دووشەم بێ. دەیویست بێکی بە قسە بێنێ. بەڵام خەمی وی هێندە گران بوو، لەبەرئەوەی ئاواتی ڕزگاربوون نەمابوو، تۆم پێ یگوت بێشك خانەوادەکانیان لەمێژە بیریان کردوون و بێگومان ئێستا بە خەستی بە دوویاندا دەگەڕێن، جا ئەگەر هاوار کا، یەکێك دێ تا دەربازیان بکا.. بۆ دەستی بەهات و هاوار نەکرد، بەڵام تاریکی و دەنگدانەوە هەر زراوی بردن، بۆیە ناچار وازیان هێنا.

ساتەکان بە قورسی ڕەتدەبوون، برسێتی دیسان کەڵبەی خۆی لێ گیرکردبوون. پارچە کێکەکی بەشی تۆم هەر مابوو. بەشیانکرد و خواردیان. پێدەچوو ئەمە زیاتر برسی کردبن و ئارەزووی بزواندبن.

زۆری نەبرد تۆم گوتی:

- شش! گوێت لەمە بوو.

هەردووك هەناسەی خۆیان ڕاگرت و گوێیان دایە، هەستیانکرد کە دەنگێك دێ دەڵێی هاوارێکی دوورە. تۆم وەڵامی هاوارەکەی دایەوە و دەستی بێکی ڕاکێشا و هەڵیان دەدا لە ڕاڕەوەکەوە بە پەلەکوتە ڕێی خۆیان بەرەو دەنگەکە بدۆزنەوە. تۆم دووبارە گوێی ڕاگرت. دیسان گوێی لێبوو، ئەوجارە نێزیکتر بوو.

تۆم گوتی:

- ئەمە ئەوانن، هاتوون، بێکی ئێستا ئێمە بارمان باشە.

شادمانییەکەیان سەرتاپاگیربوو، بەڵام زۆر لەسەرخۆ بەرەو پێش دەچوون. چونکە لێرە و لەوێ ساتمەیان دەکرد. پاش ماوەیەك گەیشتنە چاڵێك ناچار لەوێ هەڵوەستەیەکیان کرد و ڕاوەستان. ڕەنگە هەر سی پێ قووڵ با و نەیانتوانیبا لێی دەرباز بن. تۆم لەسەر زگ ڕاکشا تا توانی قۆڵەکانی درێژکرد، بەڵام نەگەیشتە بنی چاڵەکە. بۆیە ناچار بوو لە شوێنی خۆیاندا بمێننەوە. تا یەکێکیان دەگاتێ لەوانەی بەدوایاندا دەگەڕێن. گوێیان ڕاگرت، دەنگە دوورەکە لێیان دوورتر دەکەوتەوە و پاش یەك دوو چرکە هەر نەما و ئەوانیش لەتاوان دڵیان بەربۆوە. تۆم ئەوەندەی هاوار کرد تا دەنگی کەوت، بەڵام سوودی نەبوو، جا هەوڵی دا هیوا بخاتەوە دڵی بێکی، بەڵام عومرێکی دیش ڕاوەستان بێ ئەوەی چرپەیەکی دیکە ببیستن.

منداڵەکان بە پەلەکوتان هاتنەوە لای کانییەکە، کات هەر بە گرانی ڕەت دەبوو. دیسان نووستنەوە، کە هەستان تا ئەوپەڕی برسی و کەسار بوون. تۆم لای وابوو ئەمڕۆ هەردەبێ سێشەم بێ. ئێستا هزرێکی بۆ هات، هەندێ گوزەری لاوەکی هەبوون نێزیکبوون، چاکتر وابوو

سەرێك بەو ڕێچكانەدا بگرێ، لەوەی زیاتر لەبەر باری قورسی بێكاری و تێپەڕبوونی كاتدا بمێنێتەوە. داوی كۆلارەیەكی لە باخەڵی دەرێنا و سەرێكی لە بەردێك بەستاوە، ئەوجا بەخۆی و بێكی بەرێكەوتن، تۆم لەپێشەوە دەڕۆیشت. بیست هەنگاوێك چوون. زۆری نەبرد كوڕەكە چاڵێكی دیكەی هاتەپێش، داهاتەوە سەر چۆك تا دەستی لێ بكوتێ، ئەوجا بەرەو ئەوێ خشی، پاشان لەلای ڕاست چاڵێكی دیكەشیان هاتەپێش، لەهەمان سات دیتی وا دەستی مرۆڤێك مۆمێكی پێیە و لەودیو بەردەكەی بەرامبەری دەردەكەوێ، لەكەیفان خۆی پێنەگیرا و هاواری كرد، كە خاوەن دەستەكە دەركەوت ئینجەن جۆ بوو. تۆم لە پەلوپۆ كەوت و نەیتوانی بجوولێ، بەڵام زۆر لەوە هەساوە كە دیتی وا ئیسپانییەكە خۆی دەشارێتەوە. زۆر لەوەش سەرسام بوو كە جۆ دەنگی وی نەناسییەوە و لەبەرئەوەی لە دادگە شایەدی لەدژی دابوو نەهات بیكوژێ. بەڵام زوو تێگەیی كە ئەو بۆشاییەی لە دەوروبەریدا هەیە، دەنگی تەواو گۆڕیوە. لەترسانیش جووڵەی لەبەربڕابوو. بەخۆی گوت ئەگەر بیتوانیبا خۆی خڕكاتەوە، دەچۆوە لای كانییەكە لەوێ دەماوە و جارێكی دی زاتی نەدەكرد دیسان ڕووبەڕووی ئینجەن جۆ بێتەوە. تۆم ئەوەی دیتی لە بێكی شاردەوە و گوتی، بۆیە هاوارمكرد تا بەختمان بێتەوە.

ئەمجارە برسێتی و بێ هێزی بەسەر ترسدا زاڵبوون، چاوەڕوانییەكی زۆر لەدیار كانییەكە و خەوێكی درێژیان لێكەوت و كەمێك شنگیان هاتەوەبەر. كە هەستان لەبرسان ژان گرتبوونی، تۆم دڵنیا بوو، كە ئەمڕۆ چوارشەم یان پێنجشەمە. ڕەنگە هەینیش بێ، یاخوود دەشیزانی خەڵكی گوندی وازیان لەگەڕان هێناوە. بۆیە ویستی ڕێچكەیەكی دیكە بدۆزێتەوە. تەنانەت هەستی كرد ئامادەیە ڕووبەڕووی ئینجەن جۆ ببێتەوە و زۆر شتی دیكەی بەخەیاڵدا هات. بەڵام بێكی نەیدەتوانی بڕوا و تەواو بێ هیوا ببوو، گوتی ئامادەم لێرە بمێنمەوە تا دەمرم، كە ئەمەش زۆری نەماوە. بە تۆمیشی گوت دەتوانی بچێ بگەڕێ و سوود لەداوی قوشكەی وەربگرێ. بەڵام تكای لێكرد ناوە ناوە بێتەوە لای و قسەی لەگەڵدا بكات و بەڵێنی لێ وەرگرت ئەگەر كاتی مردنی هات بێتە دیار سەری و تا هەموو شتێك تەواو دەبێ لەلای بێ.

تۆم ماچی كرد، قوڕگی پڕ گریان بوو، بەڵام خۆی ڕاگرت و گوتی، دڵنیام یەكێك دەدۆزمەوە بەدواماندا بگەڕێ. یان دەرچەیەك لە ئەشكەوتێ دەبینمەوە، ئەوجا داوی كۆلارەكەی هەڵگرت و بەگاگۆڵ بەرەو ڕاڕەوێك ڕۆیی، برسێتی توانای لێبڕی بوو و بیری لە مردن دەكردەوە.

# پاژی سی و دووەمین

دوای نیوەڕۆی سێشەم داهات و بەرەبەرە بولێڵ داهات و گوندی سانت پیتەرسبۆرگ هێشتا هەر خەمبار بوون، چونکە ئەو دوو منداڵە هێشتا نەدۆزرابوونەوە. نوێژی جەماعەتیان بۆکرا و چەندین کەسی ئەو گوندە بەتەنیا، لەدڵەوە دەپاڕانەوە تا خوا رزگاریان کا، بەڵام تەنانەت یەك هەواڵی خۆشیش لەو ئەشکەوتە زوو نەهات. زۆرینەی ئەوانەی دەگەڕان وازیان هێنا و بۆ کاروباری رۆژانەیان گەڕانەوە و دەیانگوت، ئەوە روونە کە ئەو منداڵانە هەرگیز نابیندرێنەوە. خاتوو تاچەر زۆر نەخۆش کەوتبوو، زۆرینەی کات هوڕێنەی دەکرد، خەڵك گوتیان مایەی خەم و پەژارەیە، کە ئەو ئافرەتە بانگی کچەکەی دەکا، جا سەری بەرزدەکاتەوە و بۆ ساتێك گوێ رادەگرێ، پاشان دووبارە بەناڵە و نوزەوە دەکەوێتەوە سەر نوێنەکەی. پوورە پۆلیش تووشی خەمگینییەکی خامۆش ببوو، قژە ماشوبرنجەکەی تەواو تەواو سپی ببوو. بەوپەڕی دڵتەنگییەوە لەشەوی سێشەمیش گوند چاوی کەوتە خەوێ.

پاشان لەکاتی نیوەشەوێ زەنگەکانی ئەو گوندە هاربوون و زرینگانەوە. بە یەك دەم شەقامەکان تژی خەڵك بوون، ئەو خەڵکەی پێڕا نەگەیشتبوون جلوبەرگیان تەواو لەبەرکەن، هاواریان دەکرد وەرنە دەرێ! وەرنە دەرێ! دۆزرانەوە! دۆزرانەوە! فیتفیتەی تەنەکە و کەڕەناش دەستیان بە ژەنینێ کرد. خەڵك تێکچڕژان و بەرەو رووبارێ دەچوون، دیتیان منداڵەکان لەنێو عارەبانەیەکی سەرکراوەدان و خەڵك بە هاتوهاوار رایاندەکێشن و بەدەوریدا ترنجابوون و بەرەو ماڵێ بەدواییدا ریزیان بەستبوو، بە شەقامی سەرەکیی دادەچوون و هوتافیان دەکێشا.

گوند هەمووی ورووژا کرایەوە، کەسێ نەچۆوە ناو جێ. چونکە مەزنترین شەوی ئەو گوندە بچووکە بوو. لەمیانەی نیو سەعاتی یەکەمدا کاروانی خەڵکی گوندی بەرەو ماڵی تاچەری دادوەر شریتەی بەست تا ئەو دوو منداڵە دەرباز بووە ببینن و ماچیان بکەن و دەستی خاتوو تاچەر بگوشن، دەیانویست قسان بکەن، بەڵام نەیاندەتوانی و فرمێسکیان لەچاواندا دادەباری.

ئاسوودەیی پوورە پۆلی و خاتوو تاچەر هاتە دی، بەڵام ئەوەندە مابوو هەواڵێك بدەنە رێزدار تاچەر کە هێشتا لە ئەشکەوتەکەدا بوو، زۆر بەبایەخەوە گوێیان دەدا باس و خواسی

سەربردەی سەرکێشییە سەیرەکەی، دیار بوو هەندێ ترش و خۆشی پێدادەکرد. بەوەش کۆتایی بە چیرۆکەکەی هێنا کە چۆن بێکی بەجێهێشت و بۆ دۆزینەوەی دەرفەتێك بەرێکەوت، چۆن تا کۆتایی داوی کۆلارەکەی بەیەکێك لە ڕاڕەوەکاندا رۆیشت و چۆن تا کۆتایی سەرەکەی دیکەی داوەکە بە گوزەرێکی دیدا چوو، ئەوجا کە بەتەما بوو بگەڕێتەوە شوێنی خۆی. پنتێکی سپی زۆر دووری دیت، کە بەرۆشنایی رۆژێ دەچوو، لەوێ داوەکەی دانا و بە دەست کوتان بەرەو ئەو پنتە چوو، لەوێ دەرچەیەکی دۆزییەوە، کە سەر و شانەکانی خۆی پێدا بردە دەرێ، رووباری میسیسی لێ دەرکەوت. ئەگەر ئەو رووداوەش بەشەو بووایە نەیدەتوانی دەرچەکە بدۆزێتەوە و رۆشنایی رۆژێ بەدیکا، ئەوەشی گێڕاوە کە چۆن گەڕاوە دوای بێکی و هەواڵە خۆشەکەی پێ ڕاگەیاند و ئەویش لە سەرەتا باوەڕی پێ نەکرد و پێ یگوت واز لەو قسە پووچانە بێنێ، چونکە زۆر ماندووە و وا خەریکە دەمرێ و دەشیەوێ بمرێ. ئەوەشی باسکرد چۆن پێیەوە ماندوو بووە تا رازیکردووە. ئەوجا کە رۆشناییەکەی لێ دەرکەوتووە چۆن خەریك بووە لەخۆشیان بمرێ. چۆن ڕێی خۆی بەرەو دەرەوە کردۆتەوە و پاشان یارمەتی کچەشی داوە تا بێتە دەرەوە. جا چۆن دانیشتوون و لە خۆشیان گریاون و چۆن چەند پیاوێك بە بەلەمێکدا لەوێ تێپەڕیون جا تۆم دەنگی داون و باسی بارودۆخ و ناهەمواری خۆیانی بۆ کردوون و چۆن لە سەرەتا باوەڕیان بەچیرۆکەکەی نەکردووە، چونکە پێیان گوتووە "ئێوە ئێستا پێنج میل بەلای رووباریدا دوورن لە دۆڵەکە و دەروازەی ئەشکەوتەکە"، پاشان هەڵیانگرتوون و بردویاننەوە ماڵێك و خواردنیان داونێ و لێگەڕاون تا ئەو شەوە دوو سێ سەعاتان بحەسێنەوە و ئەوجا بۆ ماڵیان هێناونەوە.

پێش رۆژهەڵاتێ توانیان پێوەندیی بە تاچەری دادوەر و ئەو خەڵکە بکەن کە لە گەڕانی نێو ئەشکەوتێدا یارمەتیان دەدا و هەواڵە خۆشەکەیان پێگەیاندن.

سێ شەو و رۆژ ماندوو بوون و برسێتی نێو ئەشکەوتی بڕست و توانای لێ بڕیبوون و وا بەئاسانی نەدەهاتنەوە سەرەخۆ. کە تۆم و بێکی دۆزراونەوە، بەدرێژایی چوارشەم و پێنجشەم نێو جێیان جێنەهێشت. هەموو دەمێ وایاندەزانی ماندووتردەبن، تۆم پێنجشەمێ کەمێك هێزی هاتەوەبەر و رۆژی هەینی هاتە نێو شار و بۆ رۆژی شەموو تەواو هاتەوەسەرخۆ. بەڵام بێکی تا رۆژی یەکشەم لە ژوورەکەی نەهاتە دەرێ، ئەوساش دەتگوت لە دەردێکی گران راست بۆتەوە.

تۆم بیستی کە هاك نەخۆشە و ڕۆژی هەینی چووە سەردانی، بەڵام لێ نەگەڕان بچێتە ژوورەکەی، ڕۆژانی شەموو و یەکشەمیش هەر نەیانهێشت. پاشتر هەموو ڕۆژێ ڕێیاندا بچێتە لای بەمەرجێك باسوخواسی سەرکێشییەکەی و بابەتی وروروژێنەری لا باس نەکات. دۆگلاسی بێوەژن لەلایەن دەماوە، تا دڵنیا بێ تۆم قسەی ناشکێنێ. لەماڵی تۆم باسی ڕووداوەکەی کاردیف هیڵی زانی، ئەوەشی زانی کە تەرمی پیاوە شڕووڕەکە لەنێو ڕووبار و لای لەنگەرگەی کەشتییەکە دۆزراوەتەوە، پێدەچوو لەکاتی هەوڵی پەڕینەوەدا خنکابێ.

پاش تێپەڕبوونی نێزیکەی دوو هەفتە لە دەربازبوونی تۆم لە ئەشکەوتەکە، چووە سەردانی هاك، ئەویش تەواو هێز و توانای هاتبۆوەبەر و بەرگەی بیستنی باسوخواسی وروروژێنەریشی دەگرت. تۆمیش بەڕاستی باسی سەرنجڕاکێشی لابوو، کە دەیویست بە هاکیان بڵێ. ماڵی تاچەری دادوەر لەسەر ڕێگەی تۆم بوو، لەوێ لایدا تا چاوی بە بێکی بکەوێ. تاچەری دادوەر و هەندێ دۆستی داوایان لە تۆم کرد قسەیان بۆ بکا. یەکێکیشیان بە گاڵتە لێی پرسی حەزی لێ نییە بچێتەوە ئەشکەوتێ. تۆم گوتی کە هەر گوێشی لێ نییە. دادوەر گوتی:

- باشە، تۆم کەسی دیکەش هەن وەك تۆن، گومانم نییە، بەڵام ئێمە چاودێرێ ئەوە دەکەین. کەس چی دیکە لەو ئەشکەوتە ون نابێ.

- بۆ

- چونکە من دەرگەیەکی گەورەم لەدەرکی ئەشکەوتێ گرتووە کە پشتێنی ئاسنینی هەیە و سێ قوفڵیشی هەن، کە هەموو کلیلەکانیان لای منن. تۆم تەواو سپی هەڵگەڕا:

- ئەوە چ بووە کوڕە، بە یەکێکی گوت غاردا پەرداخە ئاوێك بێنێ.

ئاوەکەیان بە دەموچاوی تۆمدا پڕژاند.

- ئێستا تۆ باشی، ئەوە تۆ چیت لێهات تۆم؟

- دادوەری بەڕێز، ئینجەن جۆ لە ئەشکەوتەکە دایە!

# پاژی سی و سێیەمین

پاش پازدە خولەکان هەواڵەکە پەرشوبڵاوبۆوە، دوازدە بەلەمی پڕ پیاو بەرەو ئەشکەوتی مەکدوگاڵ بەڕێکەوتن، کەشتییە هەڵمینەکەش پڕ سەرنشین بوو، زوو بەدوایانکەوت. تۆم لەو بەلەمەدا بوو کە تاچەری دادوەری هەلگرتبوو.

کە دەروازەی ئەشکەوتیٚ کرایەوە، هەموو چاویان بە دیمەنێکی پڕ سویٚ کەوت. ئینجەن جۆ بە مردوویی لەویٚ کەوتبوو و دەموچاوی بەو درزە باریکەوە نووسابوو کە دەکەوتە نێوان دەرگەکە و کۆسپەی ئەشکەوتیٚ، وەك بڵێی چاوەکانی بڕیبووە دوایین چرکەساتی ڕۆشنایی و خۆشی دنیای فرەوانی ئەودیو ئەشکەوتەکە. تۆم زۆر کاریگەر بوو، چونکە بەپێی ئەزموونی خۆی دەیزانی ئەو دەرد و ناخۆشییە چۆنە. بەڵام ئەوکاتە هەستاوە کە هەستی کرد ئەو بارە ترکزە و ترسناکەی تاهەتایە لەسەر لاکەوت. کە لە ڕۆژی شایەدیدانەکەی دژ بەو پیاوە خراپە لە دوای بوو و راوی دەنا.

چەقۆکەی ئینجەن جۆ لەنێزیکی کەوتبوو، دەمەکەی ببووە دوو پارچە، هەموو تێبینیانکرد کە دەرگەکە شەقشەق ببوو و هەلکڕابوو و هەولێکی زۆر و بەفیڕۆی تێدا خەرجکرابوو، چونکە ئەو بەردەی کەوتبووە پاڵ بەشی خوارەوەی دەرگە ڕێی لە دەمە سیکاردەکە دەگرت، بۆیە کاریگەری نەبوو و لەکۆتاییدا شکابوو. خۆ ئەگەر ئەو بەردەش لەویٚ نەبا، هەر مەحاڵ بوو دینگەکە بشکێنیٚ، چونکە لە دارێکی ئەستوور و رەق دروستکرابوو، قەت نەدەکرا کونێکی وای تێبکریٚ، جێگەی ئینجەن جۆی تێدا ببێتەوە کە پێیدا بێتە دەریٚ. بیٚ گومان ئەویش زانیوێتی، بەڵام بۆیە خۆی پێوە خەریك کردووە تا کاتە بەسەرچووەکەی تێدا بەسەر ببات و خۆی لەو کۆتاییە پڕ ئازارە بخافڵێنیٚ. ئەوانی چووبوونە ئەشکەوتەکە، پێشتر زۆر جێگەیان دیبوو، پارچە مۆمیان بۆ یادگاری لەدیوارەکان گیرکرابوو، بەڵام ئەو پارچە مۆمانە نەمابوون و دادوەر و هاوەڵانی زانیان کە ئەو زیندانییە هەڵیکەندوون و خواردوونی. توانیبووشی هەندیٚ شەمشەمە کوێرە ڕاوکات و ئەوانیش بخوا و لە چڕنووکەکانی زیاتر هیچی دیکەی لیٚ نەهێشتبوونەوە، بەڵام لەکۆتاییدا ئەو نەگبەتە بەدبەختە تا مردن لە برسان نالیبووی. لە شوێنێکی نێزیك بەردێکی مەڕمەڕ (ستالاگایت) بە هێواشی ساڵەهای ساڵ گەورە دەبوو، لە ئەنجامی بەربوونەوەی دڵۆپە ئاوان لە ستالاگایتی سەرەوە، ئەو دیلە ستالاگمایتەکەی شکاندبوو، لەلای شوونەکە بەردێکی دانابوو، ئەوجا چاڵ و جۆگەی ڕێکخستبوون تا ئەو دڵۆپە ئاوانەی پیٚ خڕکاتەوە کە وەك سەعات

بەرێکوپێکی هەرسێ خولەك جارێك بەردەبوونەوە و لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا یەك مڵاکی کوپیان پڕ دەکرد. ئەو دڵۆپانە لەوساوە دێنەخوار کە ئەهرامەکان تازەبوون، لەو ساتەوە کە تیتەروادە رووخا، یاخۆ لەو ساتەی کە شاری رۆما دروستکرا، یان کە مەسیح لە خاچدرا، یاخوود لەودەمەوە کە داگیرکەران ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیایان دروستکرد، یاخۆ لە هەنگێوە کۆلۆمبس لە دەریادا بەڕێکەوت، یان لەو کاتەوە کە کوشت و بڕەکەی لێکسینگتۆن تازە روویدابوو، تا ئێستاش هەر دێنەخوار و هەر دێنە خوار هەتا لە کۆتایی مێژوودا ئەو هەموو شتانە نقووم دەبن و هەموو شتێك غەرقی تاریکی دەبێ. دەبێ لە هەموو شتێك مەبەست و پەیامێك هەبێت؟ دەبێ ئەو دڵۆپانە ماوەی پێنج هەزار ساڵ بە ئارامی کەوتبنە خوار تا ئامادەی تێرکردنی پێداویستیی ئەو مرۆڤە مێرووە بن؟ یان مەبەستێکی بەهاداری دیکەی هەیە، کە رەنگە دەهەزار ساڵی دیکە ئەنجامی بدا؟ هەر چۆن بێ ئەوە چەندین ساڵ تێپەڕیوە ئەو دڵۆپە وردانە بەردەوامن و بوونەتە شوێنێکی سەنجڕاکێش و جوان کە گەشتیاران دەچنە سەردانی تا عاجباتییەکانی ئەشکەوتی مەکلۆگال ببینن. تا ئێستاش ئەو پەرداخەی ئینجەن جۆ بۆ کۆکردنەوەی دڵۆپەکان لەبەرد تاشیبووی لە ریزی پێشەوەیە و تەنانەت کۆشکەکەی عەلائەدینیش نایگاتێ.

ئینجەن جۆ لە دەرکی ئەشکەوتەکە بەخاك سپێردرا، خەڵکی بە بەلەم و عارەبانان لە گوند و شارۆکە و کێڵگەکانی حەوت میل لەو دەوروبەرەوە هاتن و منداڵەکانی خۆیان هێنا لەگەڵ هەموو جۆرە خواردنێکی تایبەت بەو بۆنەیە و لە رێوڕەسمی ناشتنی ئینجەن جۆ ئامادە بوون و دانیان بەوە دانا، کە ئەگەر ئەو تاوانبارە لەداریش درابا هەر هێندە دڵخۆش دەبوون.

یەك شت روویدا نەیهێشت ناشتنەکە خۆشتر و گەورەتر بێ، کە خەڵکێك تکایان لە پارێزگار کرد لە ئینجەن جۆ ببورێ و زۆریش واژۆی ئەو داوایەیان کردبوو. کۆمیتەیەکیش لە ژنانی ساویلکە و ساکار دروست ببوو، کە بە شین و واوەیلا دەچوونە لای پارێزگار و لێی دەناورانەوە تا بەزەیی هەبێ و ئەرك و فەرمانی خۆی بخاتە ژێر پێی. باوەڕ وابوو کە ئینجەن جۆ پێنج هاوڵاتی ئەو گوندەی کوشتووە، بەڵام ئەوە چییە؟ خۆ ئەگەر خودی شەیتانیش با هەندێ خەڵکی نەزان و نەفام هەر دەبوو ئامادە بن بۆ لێبووردنی واژۆ کۆبوونەوە و فرمێسك بۆ کاروکردەوەکانی هەڵڕێژن.

بەیانی سبەینێ، تۆم هاکی بردە شوێنێکی تەنیا تا بابەتێکی گرنگی لەگەڵدا باسبکا، هاك هەموو شتێکی لەبارەی سەرکێشییەکەی تۆم لە پیرە وێلزییەکە و دۆگلاسی بێوەژن زانیبوو. بەڵام تۆم گوتی، کە لای وایە یەك شت ماوە ئەوان پێیان نەگوتووە، ئەمەش ئەو شتەیە کە ئێستا دەیەوێ قسەی لێ بکا. رووی هاك خەماوی بوو، گوتی:

–دەزانم چییە، تۆ چووی بۆ ناو ژمارە دوو، بەڵام لە وێسکی زیاترت لێ نەدیتەوە. کەس پێی نەگوتوم کە تۆ بووی، بەڵام من دەزانم هەردەبێ تۆبی هەر کە لەبارەی کاروباری ویسکییەوە شتم زانی. چاکیش تێگەیشتم کە تۆ گەنجینەکەت نەدۆزیتەوە، دەنا هەرچۆن با و هەرچەند لە خەڵکت بشاربایەوە، پێوەندیت هەر بە منەوە دەکرد، تۆم شتێك هەیە لەدڵمڕا پێم دەڵێ ئێمە هەرگیز نابینە خاوەنی ئەو گەنجینەیە.

–بەڵێ، بۆ، هەرچەند لام وایە ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە. هەر لەو شەویشدا تا ماڵی بێوەژنێ بەدوای ئینجەن جۆ کەوتم.

– شوێنی کەوتی؟!

– بەڵێ، بەڵام نابێ بۆ کەسی باسکەی، چونکە من لام وایە ئینجەن جۆ هاوەڵی لەدوا بەجێ ماون، ناشمەوێ تۆڵەم لێ بکەنەوە، چونکە ئەگەر من نەبام ئێستا ئینجەن جۆ لە تێکساس بوو، باشە.

ئەوجا هاك بە متمانەوە سەرلەبەری سەرکێشییەکەی خۆی بۆ تۆم گێڕاوە. کە پێشتر تەنیا بەشی وێلزییەکەی گوێ لێ ببوو. پاشان هاك گەڕاوە سەر پرسە سەرەکییەکە و گوتی:

– باشە، ئەوی نهێنی شەرابەکەی ژمارەی دووی هەڵماڵیوە، هەر ئەویش پارەکەی بردووە. تۆم واتە ئێمە تاهەتایە لەدەستمان چوو.

– هاك ئەو پارەیە هەرگیز لە ژمارە دوودا نەبووە؟!

هاك لەرووی دۆستەکەی راما و گوتی:

– چی! تۆم دیسان پارەکەت دیتتەوە؟

– هاك ماڵەکە لەنێو ئەشکەوتەکە دایە!

چاوەکانی هاك بریسکانەوە.

– تۆم دە دیسان بیڵێ.

– پارەکە لەنێو ئەشکەوتێ دایە!

– تۆم.. سەیرە، بەڕاست.. گاڵتە دەکەی یاخۆ بەڕاستتە.

– نا هاك لەهەموو کاتێك زیاتر بە راستمە، باشە تۆ لەگەڵ من دێیە ئەوێ و بۆ هێنانەوەی یارمەتیم دەدەی؟

– بێگومان بەڵێ، دەیکەم ئەگەر بتوانین رێی خۆمان بدۆزینەوە و گوم نەبین.

– هاك، دەتوانین ئەوە بکەین بێ ئەوەی کەمترین کێشەمان لەو جیهانە بێتەرێ.

– باشە! چ وای لێکردی وا بزانی پارەکە..

- هاك بەس ئارامت هەبێ تا دەچینە ئەوێ، ئەگەر نەماندیتەوە، من رازیم تەپڵەکەم و هەموو شتێکی خۆمت بدەمێ، سوێند بێ، واشدەکەم.

- زۆر چاکە کەی دەڵێی بچین؟

- ئێستا ئەگەر پێت باشە، توانات ئەوەندە هەیە؟

- لەشوێنێکی دووری ئەشکەوتەکەیە؟ من سێ چوار رۆژ لەپێ کەوتبووم، بەڵام ئێستا دەتوانم پتر لە میلێك برۆم، تۆم وا بزانم ئەوەندەم پێ دەکرێ.

- هاك لە من بترازێ بۆ هەموو کەسێك رێیەکە پێنج میلە، رێیەکی زۆر کورت هەیە کە لە من زیاتر کەس هیچی لەبارەوە نازانێ. هاك من راست بە بەلەم دەتبەم، لەوێرا بەخۆم بەلەمەکەش دەهێنمەوە. تۆ پێویست ناکا دەستیشت بجوولێنی.

- تۆم با ئێستا بچین.

- باشە، هەندێك نان و گۆشتمان پێویستە، لەگەڵ قەلوونەکانمان و یەك دوو جانتای گچکە، لەگەڵ دوو سێ دەزووی کۆلارە و هەندێ لەو دەنکانەی پێی دەڵێن (شقارتەی لوسیفەر)، کە لە ئەشکەوتەکە بووم زۆرجار خۆزگەم دەخواست هەندێکم لەلا با.

کەمێك دوای نیوەرۆ، کورەکان بەلەمێکی بچووکیان لە هاووڵاتییەك خواست کە لەوێ نەبوو. بێ سێ و دوو بەرێکەوتن. کە چەند میلێکیان مابوو بگەنە بۆشایی ئەشکەوتەکە، تۆم گوتی:

- تۆ ئەو بەرزبوونەوەیە دەبینی کە لە هەموو لایەکەوە لە بۆشایی ئەشکەوتەکەوە بەرزبۆتەوە، نەخانووی لێیە، نە کۆگەی دار، دەوەنەکانیش هەموو وەکو یەك، بەڵام ئەو شوێنە سپییەش لە دوورڕا دەبینی کە کەمێك خاکەکەی داخوراوە؟ باشە ئەوە یەکێکە لە نیشانەکانی من. ئێستاش لە کەنار دادەبەزین.

هاتنە سەرزەوی.

- ئێستا هاك تۆ دەتوانی ئەو دەرچەیە ببینی کە من پێیدا هاتمە دەرێ، هەوڵدە بیدۆزنەوە.

هاك هەموو ئەو دەوروبەرە گەڕا، نەیدۆزییەوە. لەناکاو تۆم بەکەش و فشێکەوە لەنێو دەوەنان هاتە دەرێ و گوتی:

- ئەوەتا هاك سەیری بکە ئەوە ناوازەترین چاڵە لەوڵاتدا، بەکەسی مەڵێ، زۆر چاوەڕوان بووم تا ببمە دز. بەڵام دەمزانی پێویستم بە مۆڵگەیەکی وا دەبێ، هەرچی بەدوامدا بگەرێ تیایدا بزر بێ. ئێستا مۆڵگەمان دەستکەوت. دەبێ کەس پێی نەزانێ، بێجگە لە بێن رۆجەرز و جۆ هارپەر، چونکە ئەوانیش

دەبنە ئەندامی دەستەی دزان، کە ناوی دەبێتە (دەستەی تۆم سۆیەر). ناوێکی سەرنجڕاکێشە، وا نییە هاك؟

- وایە تۆم، بەڵام دزی لەکێ دەکەین؟

- لە هەموو کەسێك، زۆرینەی کارەکانمان ڕێگری دەبێ!

- دەشیانکوژین؟

- نا.. هەموو جارێ نا.. لە ئەشکەوتێ دەیانشارینەوە، تا سەرانە دەدەن.

- سەرانە چییە؟

- پارەیە.. وایان لێدەکەی چەندی لە توانایاندایە بیدەن، تەنانەت برادەرەکانیشیان. پاش ئەوەی ماوەی ساڵێك دەیانهێڵییەوە، ئەگەر هەر سەرانەیان نەدا دەیانکوژی. شێوازە گشتییەکە ئاوایە. تەنیا ژنان ناکوژی، ژنان بێدەنگ دەکەی، بەڵام نایانکوژی. ژن هەمیشە جوان و دەوڵەمەندن و زۆریش ترسنۆکن. تۆ سەعات و شتەکانیان دەبەی، بەڵام هەمیشە کڵاوەکەتیان بۆ دادەگری و بە ڕێزەوە دەیاندوێنی. کەس نییە هێندەی دزان بەڕێز بێ. ئەمە لە هەموو کتێبێکدا هەیە، پاشان ژنەکان دەکەونە داوی خۆشەویستیت. پاش ئەوەی هەفتەیەك یاخۆ دووان لە ئەشکەوتەکەدا دەمێننەوە. واز لەگریان دێنن، ئەوجا بە خورتیش ناتوانی بەڕێیان بکەی، گەر بەزۆریش دەریان بکەی هەر دێنەوە لات. کتێبەکان هەموو وا دەڵێن.

- بۆ، بەڕاستی خۆشە، تۆم لام وایە ببیبە دز چاکترە لەوەی ببیبە جەردەی دەریا.

- بەڵێ، لە هەندێك ڕووەوە باشترە، چونکە لە ماڵێ و لە سێرك و لە شتی ئاواوە نێزیك دەبی.

لەم ماوەیەدا هەموو شتێك ئامادەبوو، هەردووك چوونە دەرچەکە، تۆم لەپێشەوە بوو، جا بەرەو لای دوورەکەی کونیلەکە چوون، ئەوجا یەك لە داوەکانیان بە بەردێك بەستاوە و لە ڕۆیشتن بەردەوام بوون، چەند هەنگاوێکی دی ڕۆیشتن گەیشتنە کانییەکە، تۆم تەزی بەجەستەی داهات و شوێنی کۆنە مۆمە تواوەکەی بە دیوارەکەوە بە هاك نیشاندا و باسی ئەوەی بۆ گێڕاوە کە چۆن بەخۆی و بێکی لێرە تەماشای بڵێسەکەیان دەکرد کە تاکوژاوە هەڵدەپەڕی.

کوڕەکان بەچرپە قسەیان دەکرد، خامۆشی و تاریکی شوێنەکە کاریگەریی بەسەریاندا هەبوو، لە ڕۆیشتن بەردەوام بوون، زۆری نەبرد چوونە ناو ڕاڕەوی دووەم و بەردەوامبوون. تا گەیشتنە بەردە بەرزەکە، لەوێ لەبەر ڕووناکی مۆم بۆیان دەرکەوت کە بەردەکە زۆر ڕك نییە، بەڵکو گردۆڵکەیەکی لێژە، بەرزییەکەی تەنیا بیست سی پێیە. تۆم چرپاندی:

- هاك ئێستا شتێکت نیشان دەدەم.

مۆمەکەی بەرزکردەوە و گوتی:

- تا چاوت بڕ دەکا سەیری ئەو گۆشەیەی بەرزایی بکە، ئەوە دەبینی؟ لەوێ لەسەر بەردە زلەکەی ئەوسەر کە بەدووکەڵی مۆم دروستکراوە.

- تۆم، ئەوە خاچە!

- ئێستاکەکواژمارەدووەکەت؟ لەژێر خاچەکەیە، وا نییە؟ ڕاست لەوێ هاك، کە ئینجەن جۆم بینی مۆمەکەی بەرزکردەوە.

هاك دەمێك لە نیشانە سەیرەکە ڕاما، جا بەدەنگێکی بەرزۆکەوە گوتی:

تۆم با لێرە بچینە دەرێ.

- چی! گەنجینەکەش جێ بێڵین؟

- بەڵێ.. جێی بێڵین. دڵنیامە دێوەزمەی ئینجەن جۆ لەم دەوروبەرەیە.

- نا، تۆم. لەوێ نییە لەدەوری پارەکەدا دەگەڕێ، من بەزمی خێوان دەزانم.. تۆش دەیزانی!

تۆم لەوە ترسا هاك ڕاست بکا، ئەندێشە و گومان لە مێشکی کۆبوونەوە، بەڵام لەناکاو هزرێکی بۆهات.

- تەماشا هاك، ئێمە چەند دەبەنگ بووین، خێوی ئینجەن جۆ ناتوانێ بێتە شوێنێك کە خاچی لێبێ.

ئەم خاڵە بیانوویێکی باش و کاریگەر بوو.

- تۆم من بیرم لەمە نەکردەوە، بەڵام وایە، ئەم خاچە لەبەختی ئێمەیە، لام وایە دەبێ بۆ ئەوێ دابەزین و بەدوای سندوقەکەدا بگەڕێین.

یەکەم جار تۆم چوو، پێی بە توندی لە قوڕەکە دەچەقاند تا جێی پێی بەجێ بێڵێ، هاك بەدوای داچوو، هەردووکیان چوار ڕاڕەویان دیت کە بەسەر ئەشکەوتۆکەکەیان دادەڕوانی، کە گابەردێك لە ناوەڕاستیدا بوو. سێ ڕاڕەویان بەسەر کردەوە نەگەیشتنە هیچ. پاشان لە نێزیکترین ڕاڕەو لە بنکەی گابەردەکە دەرچەیەکی بچووکیان دیتەوە، سێ پێخەفیان دیت لەوێ ڕاخرابوون، مەشجەبێکیشی تێدابوو، لەگەڵ هەندێك خۆراك و هێسکی ڕنراوەی دوو سێ مریشك. بەڵام سندوقەکە پارەکەیان نەدۆزییەوە و چەند جارێك ئەوێیان سەراوبن کرد، بەڵام بێ سوود بوو، تۆم گوتی:

- ئەو گوتی لەژێر خاچەکەدایە، ئێرەش دەکەوێتە ژێر خاچەکە. مەحاڵە لەژێر گابەردەکەش شاردرابێتەوە. چونکە زۆر بە پتەوی لە زەوی چەقیوە و لاناچێ. دووبارە هەموو لایەکیان ڕۆنییەوە. پاشان هیلاك بوون و بە تووڕەیی دانیشتن، هاك هیچی نەگوت، بەڵام پاشان تۆم گوتی:

- تەماشا هاك، جێی پێ و هەندێ چەورایی مۆم بەلایەکی ئەو بەردەوەیە. بەڵام ئەو نیشانانە بە هیچ لایەکی دیکەوە نابینم. ئەمە بۆ وایە؟ مەرجت لەگەڵ دەکەم پارەکە لەبن بەردەکەدایە، بۆیە قوڕەکە هەڵدەکۆڵم.

هاك چالاکی تێکەوتەوە و گوتی:

- تۆم بۆ چوونێکی خراپ نییە!

تۆم یەکسەر قەڵەمبڕەکەی خۆی دەرهێنا، هێشتا چوار ئینجی نەکۆڵیبوو، کە چەقۆکەی بەدارێك کەوت.

- هۆی هاك.. گوێت لێ بوو؟

هاکیش دەستی بە چنگەڕنە و هەڵکەندێ کرد. هەرزوو چەند تەختە دارێکیان لێ دەرکەوت و دەریانهێنان. ئەو دارانە چالاکییەکی سروشتیان داپۆشیبوو کە بە بن بەردەکەدا دەڕۆیشت، تۆم خۆی شۆڕکردەوە چاڵێ، تا توانی مۆمەکەی ڕەوانی بن بەردەکە کرد. گوتی ناتوانێ بنەبانی قۆرتەکە ببینێ و بڕیاریدا بەخۆی تێوەی بچێ، خۆی بەرەوپێش خوارکردەوە لەسەر زگ خشییە ژێر بەردەکە، کەکەمێك لێژدەبۆوە و پاشان بەلای ڕست و ئەوجا بە چەپدا دەسووڕاوە. هاکیش بەدوایەوە بوو، کە تۆم بەولایەکدا چەمایەوە زۆری نەبرد هاواریکرد:

- ئای خوایە! هاك تەماشاکە.

سندوقی گەنجینەکە بوو لەناو قۆرتێکی بچووك دانرابوو، لەپاڵ کۆمەڵە قەوانێکی بەتاڵ و دوو تفەنگ لەنێو جانتای چەرم و دوو سێ جووت نەعل و قایشێکی چەرمین و کۆمەڵە کە چەو پەچەیەك کە لەگەڵ دڵۆپە ئاوێ تەڕببوون.

هاك دەستی لەپارەکان وەردەدا و گوتی:

- لەکۆتاییدا دۆزیمانەوە.. تۆم ئێستا ئێمە دوڵەمەندین!

- هاك من هەر لام وابوو دەیلۆزینەوە. ئێستا خەریکە باوەڕنەکەم. بەڵام ئێستا هەمووی هی ئێمەیە. باچی دیکە لێرە نەمێنینەوە، با سندوقەکە هەڵگرین و بڕۆین.. بابزانم پێم هەڵدەگیرێ!

کێشەکەی نێزیکەی پەنجا پاوەن دەبوو، تۆم توانی بەرزی بکاتەوە، بەڵام زۆر بەزەحمەت توانی هەڵیگرێ. گوتی:

- من هەر وای بۆ دەچووم، چونکە لەو ڕۆژەی ئەو دوو پیاوە هەڵیانگرت ئێمە لە کۆنە خانووەکە خۆمان حەشاردابوو قورس دیار بوو، ئەوەم تێبینی کرد. بۆیە لاموایە ڕاستبووم کە بڕیارمدا دوو جانتای بچووك لەگەڵ خۆماندا بهێنین.

هەر زوو پارەکەیان بەتاڵی ناو جانتاکان کرد و بەرەو بەردی لای خاچەکە هەڵیانگرتن.
هاك گوتی:
- ئەوجا با دوو تفەنگەکە و شتەکانی دیکە بهێنین.
- نا هاك، با هەر لەوێ بن، ئەوانە کەرستەی رۆژانێکن کە دەست بەدزی دەکەین. هەموو دەمێ لەوێ هەڵیاندەگرین. ئەو ئەگلەنجەش هەر لەوێ دەکەین بۆ ئەگلەنجە جێیەکی زۆرباش و لەبارە.
- ئەگلەنجە چییە؟
- نازانم، بەڵام دزەکان هەمیشە ئەگلەنجە دەکەن، بۆیە ئێمەش دەبێ ئەگلەنجەمان هەبێ، با برۆین هاك، لەمێژە لێرەین و وا بزانم دواکەوتین. برسیشمە. کە گەیشتینەوە ناو بەلەمەکە دەخۆین و قەلوون دەکێشین. پاش کەمێك لەناو ئەشکەوتەکە هاتنە دەرێ و کەوتنە ناو گژوگیا و دەوەنان. بەچواردەوری خۆیاندا روانی، کەنارەکەی چۆڵ و هۆڵ بوو. هەر چوونە ناو بەلەمەکەی دەستیان بە خواردن و قەلوون کێشان کرد. کە خۆر بەرەو ئاسۆ شۆربۆوە، بەلەمەکەیان بەرهەڵدا و کەمێك دوای تاریکیدا هاتن گەیشتنەوە جێ. بەدرێژایی ئەو کاتە تۆم قسەی خۆش و قۆشمەی لەگەڵ هاکدا کرد. تۆم گوتی:
هاك، ئێستا ئەو پارەیە لە ژوورۆچکەکەی سەرەوەی تەویلەی ماڵی بێوەژنێ دەشارینەوە و سبەینێ دەگەرێینەوە تا بیژمێرین و بەشیکەین، پاشان لەنێو دارستان بەدوای شوێنێکی باشدا بگەرێین تا پارەکەی تێ بشارینەوە. ئێستا تۆ دەبێ لێرە بیت و چاوت لە پارەکان بێت تا من دەچم عارەبانە گچەکەی بێنی تایلەر دەهێنم. لە خولەکێك زیاترم پێناچێ.
زۆری پێنەچوو هاتەوە و عارەبانەکەی هێنابوو، هەردوو تورەگە پارەکەی خستە ناوی. بەهەندێ کۆنە پەرۆ و پاتاڵ داپۆشتن و بەرێکەوتن. عارەبانەکەی بەدوای خۆیدا رادەکێشا. کە گەیشتنە لای پیرەمێردی وێڵزی بۆ حەسانەوە راوەستان، کە ویستیان هەستنەوە و برۆن وێلزییەکە لەماڵێ هاتەدەرێ و گوتی:
سلاو.. کێیە لەوێ؟
- هاك و تۆم سۆیەرین
- باشە لەگەڵم وەرن کورینە، هەموو چاوەرێتانن، غاردەن من عارەبانەکەتان بۆ دێنم.. بەڵام ئەوە بۆ وا قورسە، بەردتان تێکردووە یاخۆ کۆنە کانزا؟
تۆم گوتی: کۆنە کانزا
- منیش پێم وابوو، منداڵی ئەم گوندە خۆیان زۆر ماندوودەکەن تا چەند پارچە کانزایەکی کۆن کۆکەنەوە و بیفرۆشنەوە. ئەگەر خۆیان بەکارێکی رێك وا ماندووبکەن، دوو ئەوەندەیان دەست دەکەوێ، بەڵام سروشتی مرۆڤ ئاوایە، دەزووکەن، خێراکەن.

کوڕەکان ویستیان بزانن بۆ وا بە پەلەیە.

- پەلە مەکەن، هەر کە گەیشتینە لای دۆگلاسی بێوەژن.، هەموو شتێکتان بۆ دەردەکەوێ.

هاك لە خۆی بەشك کەوت، چونکە هەموو دەمێ گومانی خراپیان پێدەبرد، گوتی:

- بەڕێز جۆنز خۆ ئێمە هیچمان نەکردووە.

پیرە وێلزی پێکەنی

- باشە، من نازانم هاك، کوڕی خۆم، هیچی لەبارەوە نازانم، ئەدی تۆ و ئەو بێوەژنە دۆست نین.

- بەڵێ، با، هەر چۆنێك بێ بۆ من دۆستێکی باش بووە.

- ئەی بۆ لێی دەترسی؟

ئەو مێشکەی هاك کە زۆر لەسەرەخۆ بیری دەکردەوە، وەڵامێکی وا خێرای دەست نەخست، ئەو کاتەش پیرە جۆنز لەگەڵ تۆم هەردووکی بەرەو ژووری دانیشتنی خاتوو دۆگلاسی پاڵ دەدا و عارەبانەکەشی لەنێزیك دەرگە بەجێهێشت و بەدوایاندا وەژوورکەوت.

شوێنەکە زۆر رووناك بوو. هەرچی لەو گوندە قەدرێکی هەبوو، لەوێ بوو، ماڵی تاچەر لەوێ بوون، ماڵی هارپەر، ماڵی رۆجەرز، پوورەپۆلی، سید، ماری، قەشە و نووسەر و خەڵکێکی زۆری دیکە هەموو لەوێ بوون، هەموو جوانترین جلی خۆیان پۆشیبوو. بێوەژن بەشێوەیەك پێشوازی لەو دوو کوڕە کرد، کە هەرگیز دوو منداڵی وا چلکن بەم جۆرە پێشوازی ناکرێن، چونکە تەواو لە قوڕ و چەوراتی مۆم وەردرابوون، کە پوورە پۆلی وای دیتن چاوی تێکنا و لە شەرمان سورهەڵگەڕا و سەری لە تۆم بادا، هەردوو کوڕەکە شپرزەبوون، بەڵام بەڕێز جۆنز گوتی:

- تۆم هێشتا نەچووبۆوە ماڵێ، کە من بەرەو ئێرەم هێنا، لەگەڵ هاك هەردووکیانم لەبەر دەرگەی ماڵی خۆم دیت و لەبۆ ئێرەم هێنان.

بێوەژن گوتی:

- چاکت کرد، دە کوڕینە لەگەڵ من وەرن.

هەردووکی بردنە ژووری نووستن و پێی گوتن:

- ئێستا خۆتان بشۆن و جلتان بگۆڕن، ئەوە دوو دەقە جلی تازە لێرەیە، کراس و گۆرەوی و هەموو شتێك تەواوە، بەڕێز جۆنز یەکێکیانی کڕیوە و ئەوی دیکەش من، بەڵام بۆ هەردووکتان دەبن، لەبەریان کەن. ئێمە چاوەڕێ دەبین، کە تەواو بوون وەرنە لامان.

ئەوجا بە خۆی رۆیی.

# پاژی سی و چوارەمین

هاك گوتی، تۆم ئێمە دەتوانین راکەین، ئەگەر پەتێکمان دەسکەوێ، پەنجەرەکە زۆر لە زەوییەوە بەرز نییە.

- قسەی قۆڕ! بۆ دەتەوێ هەڵبێی؟

- باشە، من لەو جۆرە قەرەباڵغییە رانەهاتووم، بەرگەشی ناگرم، تۆم من بۆ ئەوێ نایەمەوە خوارێ.

- ئای کە جاڕسی! ئەوە هەر هیچ نییە، من هیچ گوێی نادەمێ، چاوم لەتۆش دەبێ.

سید دەرکەوت و گوتی:

- تۆم، بەدرێژایی دانی ئێوارێ پوورم چاوەڕێی کردی، ماریش جلی ئێوارەی بۆ دانابووی. هەموو دڵیان لەلات بوو، پێم بڵێ، ئەوە قوڕ و چەوری نییە بە جلەکانت وەیە.

- ئێستا بەڕێز سیدی ، تۆ تەنیا ئاگات لەکاروباری خۆت بێ، جێشت هەیە ئەدی ئەو بەزمە چییە؟

- ئەمە یەك لەو ئاهەنگانەیە کە بێوەژن سازیان دەکا، ئەم جارە بۆ وێلزییەکە و کوڕەکانێتی. لەبەرئەوەی لە شەوی گۆرین یارمەتی ئەویان داوە. بەم بۆنەیەوەش دەتوانم شتێکت پێ بڵێم ئەگەر حەزدەکەی بیزانی:

- باشە، چییە؟

- بۆ، بەڕێز جۆنزی پیر ئەمشەو بەنیازە لێرە شتێك بۆ خەڵك ئاشکرا بکا، بەڵام من ئەمڕۆ گوێم لێبوو بەدزی بە پلکمی دەگوت، هەرچەند پێم وایە ئێستا نهێنی نییە، چونکە هەموو دەیزانن، تەنانەت خودی بێوەژنیش دەیزانی، هەرچەند هەوڵیشدەدا وا دەرخا کە هیچ نازانێ. بەڕێز جۆنز مکوڕ بوو هاك بۆ ئاهەنگەکە بێنێ و گوتی، گەر هاك لەوێ نەبێ ناتوانێ رازە مەزنەکەی ئاشکراکا.

- سید، راز و نهێنی چی؟

- نهێنی ئەوەی هاك تا ماڵی بێوەژنێ بەدوای دزەکان کەوتبوو لام وایە بەڕێز جۆنز دەیویست بەم هەواڵە هەمووان سەرسام بکا. بەڵام هەرچۆنێك بێ لام وایە تامی نەماوە.

سید زۆر بە ئاسودەیی پێکەنی.

- سید، تۆ ئەو نهێنییەت ئاشکرا کرد.

- گوێن دیٚ کیٚ ئاشکرایکرد، ئەوەندە بەسە کە یەکێك ئاشکرای کرد.

- سید یەك کەسی زۆر بیٚ نرخ هەیە، ئەویش تۆی. ئەگەر تۆ لە شوێنی هاك بوای، خۆت دەدزییەوە و لەگردەکە دادەبەزی و هەرگیز باسی دزەکانت بە کەس نەدەگوت. لە شتی بیٚ نرخ زیاتر تۆ ناتوانی هیچ بکەی. ناتوانی گوێت لەوەبیٚ کە یەکێك لەپای کارێکی چاکی پێیدا هەڵدەگوتریٚ. ئەوجا تۆم گوێی سیدی گرت و بەشاپان لە ژوورێی وەدەرینا.

- ئێستاش ئەگەر دەوێری برۆ بە پوورم بڵیٚ، جا سبەینیٚ دەتبینمەوە.

پاش چەند خولەکێك، میوانانی بێوەژنیٚ چوونە سەرخوانی شێوخواردن، نێزیکەی دوازدە منداڵیش بەدەوری مێزێکی بچووك لەهەمان ژوور دانیشتبوون. هەروەك ئەوددەمی لەویٚ باو بوو. لەکاتی گونجاودا بەرێز جۆنز وتە کورتەکەی خۆی پێشکەشکرد. کە تیایدا سوپاسی بێوەژنی کرد لەپای ئەو شەرەفەی کە بەخۆی و بە کوڕەکانی بەخشی. بەڵام گوتی کەسێکی دیکەش هەیە کە بەڕاستی... هەندێکی هێنا و برد و پاشان نهێنییەکەی لەبارەی هاك تەقاندەوە، کەچۆن زۆر ئازایانە وەك مەردان بەشداری لەو سەرکێشییە کردووە. بەڵام نهێنییەکە ئاشکرا ببوو، بۆیە پێشوازی و چەپڵەڕێزانەکەی لە ئاستی چاوەڕوانکراودا نەبوو. سەرەڕای ئەوەش بێوەژن وای پیشاندا کە زۆر سەرسام بووە و ئەوەندەی سوپاس و ستایشی هاك کرد، ئەوەندە نەمابوو ئەو پشی تەنگییەی لەیاد بچیٚ، کە بەهۆی جلکە نوێکانی تووشی هاتبوو، کە هەستی کرد هەموو ئامادەبووانیش تێی دەڕوانن هەر بەیەکجاری پەشۆکا.

بێوەژن گوتی، بەنیازە شوێنێك لەماڵی خۆی بۆ هاك دابین بکا و بینێرێتە بەر خوێندن، کە پارەشی هاتەدەست، کارێکی گونجاوی بۆ دابین بکا. کە تۆم دەرفەتی بۆ هەڵکەوت، گوتی:

- هاك پێویستی بەمە نییە، چونکە هاك دەوڵەمەندە.

هەموو سەریان سوڕما و بەو نوکتە خۆشە پێکەنین. پاش کەمێك هەموو بێدەنگبوون، تۆم گوتی:

- هاك پارەی دەستکەوتووە، رەنگە ئێوە باوەڕنەکەن، بەڵام ئەو زۆری دەستکەوتووە.. پێی ناویٚ پیٚ بکەنن، دەتوانم بۆتانی بسەلمێنم، یەك چرکە راوەستن.

تۆم چووە دەریٚ، ئامادەبووان سەیری یەکدیان کرد و واقیان وڕما بوو. ئەوجا تەماشای هاکیان کرد، بەڵام ئەو نقەی لێوە نەهات.

پووره پۆلی گوتی:

- سید، ئەوە تۆم چی بەسەر هاتووە، وەیش خۆ من قەت لەو هەتیوە ناگەم.. تۆم هاتەوە ژوور، لەژێر باری تورەگەکانی نقەی لێوە دەهات. هێشتا پووره پۆلی قسەکەی تەواو نەکردبوو، تۆم هەموو زێڕە زەردەکانی هەلڕشتە سەر مێز و گوتی:

- ئەمە ئەو سامانەیە کە بۆم باسکردن، نیوەی مولّکی هاکە و نیوەی هی منە.

هەموو چاویان لە پارەکە زەقبۆوە و پاش هەناسەیەك بێدەنگی بالّی بەسەر داکێشان.

پاشان هەموو پێکەوە داوای روونکردنەوەیان دەکرد، جا تۆم گوتی، کە دەتوانێ بۆیان روون بکاتەوە، هەرچەندە بەسەرهاتەکەش دوور و درێژ بوو، بەلاّم سەیر و سەرنجڕاکیش بوو. کەس نەیویست قسە بە تۆم ببڕێ لەو دەمی سەرکێشییە ناوازەکەی دەگێڕاوە، کە تەواو بوو، بەڕێز جۆنز گوتی:

- لام وابوو من هەوالێکم بۆ ئەم بۆنەیە پێیە، بەلاّم لەپالّ ئەم بەسەرهاتە هەوالّەکەی من هیچ نەبوو.

پارەکە ژمێردرا، کەمێك لە دوازدە هەزار دۆلار زیاتر بوو، کەس لە ئامادەبووانیش ئەو هەموو پارەیەی پێکەوە نەدیبوو. هەرچەندە زۆرنیەیان مولّك و مالّیان لەوەندە زیاتر بوو.

# پاژی سی و پێنجەمین

خوێنەر دەکرێ بزانێ کە بڵاوبوونەوەی هەواڵی دەوڵەمەندبوونی تۆم و هاك چ هەراو زەنایەکی لە گوندی هەژار و بچووکی سانت پیتەرسبۆرگ سازکرد، چونکە زۆران هەر باوەڕیان نەدەکرد کەسێك هەبێ ئەو هەموو پارە کاشەی هەبێ، هەموو خەڵکی بە ئێرەییەوە باسی ئەو مەسەلەیان دەکرد. خەڵکێکی زۆریش پەتای دۆزینەوەی گەنجینە گرتبوونی و نە لە گوندەکەی خۆیان نە لە لادێکانی دەوروبەر کەلاوە و گوفەکیان نەهێشتبوو، هەڵینەکۆڵن و سەراوژێری نەکەن و لە بن و بۆتکەوە دەرینەهێنن، بەڵکو گەنجینەیەکی تێدا شاردرابێتەوە. ئەو پەتایە تەنیا منداڵانی نەگرتبۆوە، بگرە گەیشتبووە پیاوانی ناودار و جوامێر و لێوەشاوە، هەرجارەی بەدەوریاندا کۆدەبوونەوە و بە سەرسامییەکی زۆرەوە گوێیان بۆ باس و خواسەکانیان رادەگرت. ئەو دوو کوڕە بە بیریان نەدەهاتەوە هەرگیز ئاوا بایەخ بە تێبینی و سەرنجەکانیان درابێ، بەڵام ئەمڕۆ هەر چیان دەگوت جێی بایەخ بوو، هەموو بە گرنگیان دەزانی و هەڵپەی ئەوەیان بوو چەندبارە گوێی بۆ راگرنەوە.

بەمجۆرە هەر کارێکی دەیانکرد بەسەیر و ناوازە دادەنرا. هەموو باوەڕیان وابوو ئەو دوو کوڕە لەبارياندا نەماوە قسەی ئاسایی بکەن لەوەش زیاتر ژیننامەی ئەوان بووە مایەی سەرنج و پەند لێوەرگرتن. رۆژنامەی گوندەکەش پوختەی ژیننامەیانی بڵاوکردەوە.

دۆگلاسی بێوەژن بەشە پارەکەی هاکی بە سووی شەش لەسەد بەقەرز دابوو، تاچەری دادوەریش لەسەر داوای پوورە پۆلی بەشی تۆمی وا لێکردبوو. ئێستا هەر یەکەیان داهاتی خۆی هەبوو. کە دەگەیشتە یەك دۆلار بۆ هەر رۆژێکی ساڵ و نیو دۆلاریش داهاتی یەکشەمانیان بوون، کە دەیکرد هێندەی داهاتی قەشە. دۆلار و چارەکێك لەو رۆژاندا بایی خۆراك و پۆشاك و قوتابخانەی هەفتەیەکی قوتابییانی ئەو سەردەمەی دەکرد.

بایەخی تۆم لای تاچەری دادوەر زۆر زیادی کرد، هەر دەیگوت منداڵێکی ئاسایی قەت نەیدەتوانی کچەکەم لە ئەشکەوتێ دەرباز بکا. کاتێکیش بێکی بە دزی بە باوکی گوت، چۆن تۆم لەباتی وی بەرگەی لێدان و قامچی کاری قوتابخانەی گرتووە. دادوەر کاریگەربوو، کە پێشی گوت تۆم درۆی کردووە تا لێدانی لەسەر هەڵگرێ و بیخاتە سەر خۆی، دادوەر بەوپەڕی قەناعەتەوە گوتی، ئەوە جوانترین و مەزنترین درۆیە. درۆیەکە دەتوانێ سەربەرزکاتەوە و بە مێژوودا گوزەربکات و بگاتە

ئاستی راستییە دەنگ بەرزەکانی جۆرج واشینگتۆن لەبارەی هاتچێتەوە. بێکی لای وابوو، هەرگیز باوکی ئاوا نەبوو، کە لە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، پێی لە زەوی دەدا و ئەو شتانەی دەدرکاندن. ئەوجا یەکسەر لە ماڵێ چووە دەر و هەمووی بۆ تۆم گێڕایەوە.

تاچەری دادوەر هیوای خواست کە ڕۆژێ لە ڕۆژان تۆم وەك پاریزەرێکی لێهاتوو یان سەربازێکی ئازا ببینێ. گوتی کە بڕیاری داوە یارمەتی تۆم بدات تا بچێتە ئەکادیمیای سەربازی نیشتمانی و پاشان بچێتە بەرزترین کۆلێژی یاسا لە وڵات، تا بتوانێ بۆ هەردوو پیشەکە ئامادە بێ.

دەوڵەمەندی هاك فین و چاودێریکردنی لەلایەن دۆگلاسی بێوەژنەوە، هێنایانە ناو کۆمەڵگە، بەڵکو ڕایان کێشا یان خستیانە ناو کۆمەڵگە. بۆیە ئازارەکانی لە توانای وی بەدەربوون. خولامەکانی بێوەژن هەر خەریکی پاك و خاوێن ڕاگرتنی بوون و قژیان بۆ شانە دەکرد و شەوانیش بە نوێنی گران دایان دەپۆشی، کە هیچ پینە و پەڵەیەکی پێوە نەبوو، دەبووا لەکاتی خواردنیش چەقۆ و چەنگاڵ بەکاربێنێ و پەشتەماڵ و پەرداخی هەبێ، هەروەها دەبوو فێر بێ و بچێتە کڵێسا و بە زمانێکی جوان قسان بکا. بەمجۆرە هەرچۆنی ئاوڕدەداوە، کۆت و بەندی دەدیتن، کە دەست و پێیان بەستابۆوە.

ئازایانە ئەو ئازارانەی تا سێ هەفتان قبوولکرد، پاشان لەناکاو ڕۆژێك بزربوو، بێوەژن چل و هەشت سەعات لە هەموو لایەك بەدوایدا گەڕا. زۆری خەم بوو، جەماوەریش بایەخیان پێ دەدا و هەموو لێی دەگەڕان، تەنانەت ناو ڕووباریشیان بۆ تەرمەکەی پشکنی، بەڵام بێ سوود بوو. بەیانی ڕۆژی سێیەم تۆم سۆیەر زانایانە چووە لای هەندێ کۆنە بەرمیلان کە لەو دیوی قەسابخانە تێهەڵدرابوون، پاش چەند سەعاتێك لەناو یەکێکیان دۆزییەوە. هاك ئەو شەوەی لەناو بەرمیلەکەدا بەسەر بردبوو. تازە لەخواردنی بەیانی تەواو ببوو. کە هەندێك خۆراکی ساکار بوو، لەجێی جودا جودا دزیبووی. کە تۆم دۆزییەوە هەر پاڵکەوتبوو. زۆر بە سەرفرازی قەلوونی دەکێشا، قژی تێکئاڵا بوو، تۆز و گەردی لێ نیشتبوو، هەندێ شڕوشیتاڵی لەبەربوو، کە لە ژیانە ئازادانەکەی پێشوو بۆی بەجێمابوون. تۆم لە بەرمیلەکەی دەرهێنا و پێی گوت ڕەفتارەکەی چەند کێشەی ناوەتەوە. پاشان هانیدا بچێتەوە ماڵێ، یەکسەر هەرچی حەسانەوە هەبوو لەسەر ڕووی هاك بزر بوو، دڵتەنگی دایگرت و گوتی:

-تۆم باسی ئەوم بۆ مەکە، من هەوڵمدا وابم، بێسوود بوو بێسوود. تۆم ئەمە بۆ من نییە، من لێی ڕانەهاتووم. ئەو بێوەژنە بۆ من زۆر باشە، بەڵام من بەرگەی ئەو شێوازانە ناگرم. تا سەر پێستە سەرم شانە دەکەن، نایەڵێ لەناو تەویلەدا بنووم. ناچارم دەکا ئەو جلە قەڵپانە لەبەربکەم، کە هەناسەم لەبەردەبڕن، تۆم پێناچێ ئەوانە هیچ هەوا بدەن، جلوبەرگی زۆر جوانن، بەجۆرێك من لە هیچ شوێنێك

ناتوانم نە پێیانەوە پاڵکەوم نەدانیشم نەخۆم بگەوزێنم. هەروەها دەڵێ ساڵێکە خلیسکانێم نەکردووە، بە ملم دادێ بچمە کلێسا و لەوێ هەر ئارەقەم لێ دەتکێ. من رقم لەو شتانەیە، تەنانەت ناتوانم لەوێ مێشێك بگرم، یاخۆ شتێك بجووم، بەدرێژایی یەکشەمان دەبێ پێڵاو لە پێکەم. ئەو بێوەژنە بە زرنگەی زەنگوڵ نان دەخوات و بە زرنگەی زەنگوڵ دەنوێ و هەڵدەستێ، هەموو شتێك ئەوەندە رێکوپێکە کەس بەرگەی ناگرێ.

- باشە، هاك هەموو کەسێك وادەکا.

- تۆم ئەمە هیچ ناگۆڕی، من هەموو کەسێك نیم و ناتوانم بەرگەی بگرم، زۆر زەحمەتە ئاوا ببەسترێیەوە. بەجۆرە بێ من زەوقی ژیانم نامێنێ. بۆ راوەماسی بچم دەبێ مۆڵەت بخوازم، بۆ مەلەش هەروا، بۆ هەموو شتێك دەبێ ئیزن وەربگرم. دەبێ زۆر بەجوانی قسە بکەم ئەوجا با بەدڵیشم نەبێ. هەر شتێکی سەربەخۆ بکەم سەرکۆنەم دەکا. بێوەژن نایەڵێ قەلوون بکێشم، نایەڵێ هاوارکەم، یاخۆ زۆر لە شتێك رامێنم، یان راکشێم، یاخوود لەبەر چاوی خەڵك خۆم بخورێنم، ئەوجا بە ورووژانێکەوە گوتی، پاشان ئەوە زۆرینەی کاتی خۆی بە نوێژ و پاڕانەوە بەسەردەبات، من هەرگیز ژنی وام نەدیوە. تۆم من ناچاربووم هەڵێم، پاشان وا قوتابخانە دەبێتەوە و بێوەژن دەمنێرێ، خۆ من هەرگیز بەرگەی کوتەکەکانی مەکتەبێ ناگرم. تۆم سەیری ئێرە بکە کە دەوڵەمەند بووم لای من هیچ بایەخی نییە، چونکە بۆ من مایەی دڵەڕاوکێی بەردەوامە. وا دەکا خەڵکیش هەموو کات مردنم بە ئاوات بخوازن. ئەو جلانە بۆ من باشن، من ئەم بەرمیلەم بەسە، هەرچی رووبدا وازیان لێ ناهێنم. بەڕاستی ئەگەر ئەو پارانەش نەبوونایە من تووشی ئەو هەموو دەردەسەرییە نەدەهاتم. تۆ بەشی منیش ببە بیخە سەر بەشی خۆت. ناوە ناوە دە پێنسم بدێ، بەڵام زوو زوو نا، چونکە من تەنیا پارە بەو شتانە دەدەم، کە بەزەحمەت دەستم دەکەون، دە ئێستا برۆ و لای بێوەژن بۆم بپاڕێوە و داکۆکیم لێ بکە.

- ئای هاك، تۆ باش دەزانی من ناتوانم وا بکەم، چونکە ئەمە هیچ راست نییە.. ئەگەر تۆ ماوەیەکی درێژتر بەرگەی ئەو شێوازە تازەیە بگری، لێی رادێی.

- لێی ڕادێم. وەك ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەسەر سۆبەیەك تا حەزی لێ بکەم و لێی رابێم.نا تۆم.. نامەوێ دەوڵەمەند بم. چی دیکەش لەو خانووە بڵحانە ناژیم کە هەناسەم تەنگ دەکەن. من دارستان و رووبار و بەرمیلەکانم خۆشدەوێن و هەر لێیان نێزیك دەبم، لەوکاتەی کە دەبینە خاوەن تفەنگ و ئەشکەوت و هەموو شتێکمان بۆ ئامادە دەبێ تا ببینە دز، ئەو شتە قۆڕانەم بۆ دەردەکەون و هەموو ئاواتەکان تێك دەشکێنن.

تۆم دەرفەتی خۆی دیتەوە:

- سەیرکە هاك، خۆ ئەو سامانەی هەمانە وای لیٚ نەکردووم واز لە هزری دزیکاریم بیٚنم.

- نا.. بەڕاست، بەڵام تۆم تۆ مردووی ئەو شتانەی؟

- بەڵیٚ، چەندە شیٚتی ئەم دانیشتنەم لەگەڵ تۆ، ئەوەندەش شیٚتی ئەوانم. بەڵام ئەگەر تۆ کەسیٚکی بەڕیٚز نەبیت ناتوانین لە ریزی خۆمان وەرت بگرین.

هاك زەوقی تیٚکچوو:

- تۆم ناتوانی وەرمبگری؟! ئەدی ریٚگەت نەدام ببمە چەتە؟!

- بەڵیٚ، بەڵام ئیشەکە جیایە، بەشیٚوەیەکی گشتیی دز لە چەتان بەڕیٚزترن، لە زۆرینەی وڵاتانیش خەڵکی ناودار و ناسراو دەبنە دز.

- ئیٚستا تۆم، تۆ هەموو دەمیٚ دۆستی من نەبووی، خۆ تازە پشتم تیٚ ناکەی، وا نییە تۆم؟ ئیٚستا وا ناکەی وا نییە؟!

- من نامەویٚ هاك، بەڵام خەڵك چ دەڵیٚن؟ دەڵیٚن سەیر دەستەکەی تۆم سۆیەر تەنیا خەڵکی ئاست نزم و بیٚ کەڵکن! دیارە مەبەستیشیان تۆیە، هاك لام وا نییە تۆ حەز لەوە بکەیت و منیش حەزم لیٚ نییە.

هاك دەمیٚك بیٚ دەنگ بوو، کە تووشی کیٚشەیەکی دەروونی کرد و لەپاشان ، گوتی:

- باشە، دەچمەوە لای بیٚوەژنیٚ و مانگیٚکی دیکەش بەرگەی ئەو ئازارە دەگرم، تا بزانم لیٚی ڕادیٚم یان نا، بەڵام بەو مەرجەی ریٚبدەی لەو دەستە دزەدا ببمە ئەندام.

- باشە هاك، پیٚکهاتین، ئیٚستاش هەستە با بچینەوە، من لە بیٚوەژن داوادەکەم بڕیٚکی زیاتر ئازادیت بداتیٚ.

- بەڕاست تۆم؟! ئەمە باشە، خۆزگە کەمیٚك جڵەوی چاودیٚریکردنی بۆ شل دەکردم. جا بە دزی قەلوونم دەکیٚشا و هەندیٚ شتم دەکردن، کە بوونەتە بەشیٚك لە ژیانم.. بەڵام کەی دەستەکە پیٚکدیٚنی تا من ببمە دز؟!

- هەر ئیٚستا، کوڕان کۆدەکەینەوە و رەنگە هەر ئەم شەو بکەینە دەسپیٚکی کارەکانمان.

- دەسپیٚکەکە چ دەبیٚ؟

- هەموومان سویٚندبخۆین، کە پشتی یەکتر بگرین و نهیٚنییەکانی دەستەکە ئاشکرا نەکەین. ئەگەر پارچە پارچەش بکریٚین. هەرکەسیٚکیش خراپە بەرامبەر ئەندامیٚکی دەستە بکات، بیکوژین و خاوخیٚزانیشی لەناو ببەین.

- جوانە، پیٚت دەڵیٚم زۆر جوانە تۆم.

- باشە، بەڵام دەبێ سوێندخواردنەکە ئەمشەو تەواوبێ، لەشوێنێکی دوورەدەست و ترسناکیش بێ لەکاتی نیوەشەودا، کوێت پێ ترسناکە، خانووە خێونشینەکە باشترین جێ بوو، بەڵام لە بەدبەختی هەموویان تێکداوە.

- باشە هەرچۆنێ بێ نیوەشەو کاتێکی زۆر گونجاوە.

- بەڵێ وایە، تۆ دەبێ سوێندبخۆی و دەست بخەیتە سەر تابووتێك و سوێندەکەت بە خوێن واژۆ بکەی.

- وای کە شتێکی جوانە! بۆ، خۆ ئەمە ملیۆن جار لە جەردەیی باشترە. تۆم، تا دەڕزم لەگەڵ بێوەژن دەمێنمەوە، جا کە بوومە دزێکی لێزان و ناسراو کە خەڵك هەموو باسی بکەن، لام وایە هەنگێ بێوەژن شانازی بەوە دەکات، کە منی لەو قوڕ و لیتە دەرهێناوە.

## پایان

بەمجۆرە ئەم سەربوردەیە تەواوبوو، کە تەواوی مێژووی ژیانی کوڕێك بوو، دەبێ لێرە راوەستین و پتر قووڵ نەبینەوە، دەنا دەبێتە ژیننامەی پیاوێك. کە یەکێك رۆمانێك لەبارەی خەڵکی گەورە دەنووسێ، چاك دەزانێ لەکوێ رادەوەستێ، لەگەڵ هاوسەرگیری. بەڵام کە لە بابەت منداڵان بنووسی باشترین کۆتایی کوێ بوو، دەبێ لەوێ بوەستی.

زۆرینەی ئەو کاراکتەرانەی لەم کتێبەدا دەرکەوتوون، تا ئێستا لە ژیاندان و خۆشگوزەران و ئاسوودەن.. رەنگە رۆژێك بەهایەکی هەبێ کە دیسان بەسەرهاتێك لە ژیانی منداڵان بگێڕینەوە، تا بزانن چ جۆرە پیاو و ژنێکیان لێ دەردەچێ. بۆیە وا چاکترە ئێستا هیچ شتێك لەو بەشەی ژیانیان ئاشکرا نەکرێت.